# دیوانی زێوەر



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی



زنجیرەی ڕۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناوونیشان:
دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، گەڕەکی خانزاد، هەولێر
س. پ. ژمارە: ١
www.araspublisher.com

# دیوانی زێوەر

**مەحموود زێوەر**

کۆی کردۆتەوە و پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە



ناوی کتێب: دیوانی زێوەر
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٢٢١
ئامادەکردنی: مەحموود زێوەر
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: بەدران ئەحمەد حەبیب
دەرهێنانی هونەریی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
خۆشنووسیی بەرگ: خۆشنووس محەمەد زادە
پیت لێدان: ئاراس ئەکرەم
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠٣
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە ٣١٥ی ساڵی ٢٠٠٣ی دراوەتێ





## پێشەکی

خوێنەرانی خۆشەویست و بەڕێز: بەشانازییەوە (دیوانی زێوەر)ی باوکمتان پێشکەش ئەکەم کەوا زیاد لە پەنجا ساڵە کۆچی دوایی کردووە و هێشتا دیوانەکەی بەتەواوی چاپ نەکراوە. بەڵام وەنەبێ کەمتەرخەمیمان کردبێ، بەهەر حاڵێک بووبێ و بەگوێرەی ڕۆژ و توانا توانیومانە خوێنەری لێ بێ بەش نەکەین.

لە ساڵەکانی ١٩٥٦ەوە کەوتمە کۆکردنەوەی زۆری ئەو هەڵبەستانەی کە لای خۆمان نەبوون. چونکە سەرجەمی شیعرەکانی ژیانی خۆی لە سەردەمی (دەربەدەری)یەکەیدا فەوتاوە یا سووتاوە ئەوە هەموو لێی بێ بەش بووین، بەڵام هەوڵی دڵسۆزانەی پیاوچاکان و کۆکردنەوەیان و پاراستنیان زۆر جێی ڕێز و سوپاس و شانازییە بۆمان. لەوانە مامۆستای خوالێخۆشبوو (نەجمەدین مەلا) کە کەشکۆڵێکی تایبەتی بەشیعرەکانی (زێوەر)ی لابوو زۆر جار دوای ئەرکی دەرس وتنەوەی قوتابییانی شەوێ سەرم لێ ئەدا و هانم ئەدا کە نوسخەیەکم بۆ بنووسێتەوە تا بتوانین چاپی بکەین. ئەویش دەستی نەنا بەڕوومەوە و ئەرکی نووسینەوەی گرتە ئەستۆ، هەرچەندە لە نووسینەوە و گواستنەوەی شیعرەکاندا دەستکاری کردبوو بەپێی ڕاوبۆچوونی تایبەتی خۆی پەراوێزی بۆ نووسیبوون کە لەمەشدا کەوتبووە هەڵەوە و خوێنەری دوای خۆشی پشت بەو سەرچاوەیە کەوتبوونە هەڵەوە، و چەند هەڵبەستێکی بەختیار زێوەری بەهی زێوەر دانا بوو لەوانە (باسی دونیا) و (هەڵهێنانی مەتەڵ)ی گۆڤاری بانگی کوردستان و گۆڕینی هەڵبەستی (فەلەستین) بە (وڵاتم) دارشتبووەوە بەم جۆرەش بەڕێز (کاکە حەمەی حاجی عارف)، خاوەنی (کتێبخانەی زێوەر) ئەرکی چاپکردنی گرتە ئەستۆی و ناردی بۆ لای بەڕێز خوالێخۆشبوو مامۆستا (عەلائەدین سەجادی) و لە ساڵی ١٩٥٧دا لە چاپخانەی مەعاریفی بەغداد بەچاپکراوی بەشێکی بەناوی (سۆزی نیشتمان)ەوە بڵاوبووەوە و کەوتە دەست خۆینەران.

بەشە چاپ نەکراوە دەستنووسەکەی گەڕایەوە بۆ من و لای خۆم پاراستم، لەم دواییەدا کە نرخ و بایەخ لە جاران زیاتر درا بەئەدەب و شیعر و نووسین، زۆر کەس داوای چاپکردنی تەواوی دیوانەکەیان ئەکرد. بۆ ئەم مەبەستەش لەگەڵ مامۆستای بەڕێز خوالێخۆشبوو (جەمال محەمەد محەمەد ئەمین)دا یەک کەوتین کە سەرجەمی هەموو شیعرەکانی کۆبکاتەوە و بینووسێتەوە و ئامادەی چاپی بکا و بمداتێ دوای پیاچوونەوەی و ڕازیبوونم لە چاپی بدەم.

مامۆستا جەمال لەسەر ئەرکی مامۆستایەتی خۆیەوە پیاوانە کارەکەی سازدا و بردی ڕەقابەشی کرد و ئینجا هێنایەوە کە چاپی بکەین بەڵام دوای پیاچوونەوە ئەمیش کەوتبووە ئەو هەڵانەوە کە مامۆستا نەجمەدین مەلا پیا ڕۆیبوو. چ لە گواستنەوەی شیعرەکان و چ لە پەراوێزەکاندا کە لە سۆزی نیشتماندا نووسرابوونەوە و دەقاودەق وەک خۆی بەبێ گۆڕان گواستبوویەوە و دەستنووسەکەی خۆی وە خۆیشی کەوتبووە چەند هەڵەیەکی ترەوە لەبەر نەبوونی سەرچاوە و یەکباڵی ئیشەکەی و دووریشی لە شارەوە کە مامۆستای ناوەندی بوو لە چوارتا و ئەگەر بهاتایە کتێبەکە بەم جۆرە چاپ بکرایە و دەست خوێندەواران





بکەوتایە ئەبووینە مایەی گلەیی و نارەزایی ئەدەب دۆستان و ئێوەی بەڕێز. لەبەر ئەوە ڕازی نەبووم و ناچار ڕووم لێنا کەوا دەست هەڵگرێ لە کارەکەی و ئەو دەستنووس و سەرچاوانەی خۆمانمان بداتەوە دەست کە دابوومانێ و دیوانە ئامادەکراوەکەی خۆیشی بۆ خۆیم گێڕایەوە و مافی چاپکردنی ئەدەمێ دوای چاپکردنی ئەم دیوانە چاپی بکاتەوە بەو دیراسەت و پێشەکییەی کە خۆی بۆی نووسیوە. بەم کارە مامۆستا جەمال ڕازی بوو و خۆشحاڵی خۆی دەربڕی و زۆر سوپاسی ئەکەین.

بێگومان کارێکی وا بەتاکە کەسێک ناکرێ، ناچار ڕووم لە بەڕێزان (پرۆفیسۆر د. عیزەدین و مامۆستا ئەحمەد محەمەد)، ئەمینداری گشتی کتێبخانەی ئەوقافی سلێمانی نا کە ئەم ئەرکە جێبەجێ بکەن بۆ نووسینەوە و پیاچوونەوە و پەراوێز بۆ نووسین و ڕاستکردنەوەی دیوانێکی ڕێکوپێک بۆ شیعرەکانی (زێوەر) بەپێی ئەو دەستنووس و سەرچاوانەی لەبەر دەستیان هەن بەتایبەت مامۆستا مەحموود بەهۆی کتێبخانەی ئەوقافەوە. جگە لە کەشکۆڵێکی مامۆستای بەڕێز (حەمە عەلی قەرەداغی) کە بۆی ناردین خۆیشی زۆری ئەو شیعرانەشی لە گۆڤاری (بەیان)دا بڵاوکردبۆوە.

بەڵام بۆ ئێمە سەرچاوە بۆ ڕاستکردنەوە و ساغکردنەوەی چەند شیعرێک کە لە هەندێ سەرچاوەدا هەڵەی تێ کەوتبوو لە گواستنەوەدا. ئەمەش بووە هۆی دەوڵەمەندکردنی دیوانەکە و زۆر سوپاسی مامۆستا حەمە عەلی ئەکەین. چونکە زۆری ئەو هەڵبەستانە لای ئێمە لە گۆڤارە کوردییەکانا بەرچاو نەکەوتبوون. بەمانە کارەکە بەرەو هەنگاوێکی پێشتر ڕووی نا.

بۆ ئەوەی دیوانەکە سەرجەمی هەموو شیعرەکانی بێ لە چاپکراوەکانی کاتی ژیانی شاعیر خۆیدا (دەستە گوڵی لاوان) و (چیرۆکی خێوی ناو مزگەوت و سۆفی کەریمی چەرچی)یشمان لەگەڵ دانان بۆ چاپکردنەوە. لەبەر دوو هۆ: یەکەم: بۆ ئەوەی خوێنەر لە ڕۆڵی شیعری زێوەر نەپچڕێ. دووەم: ئەو خوێنەرانەی ئێستەش کە دەستیان نەکەوتووە لێیان بێ بەش نەبن.

ئەمە کورتەیەکی سەر گوزشتەی چۆنییەتی چاپکردنی ئەم دیوانەیە.

بەڵام چەند ڕایەک دەربارەی زێوەری باوک لە دوو خاڵدا دەرئەبڕم:

یەکەم: زێوەر بەرابەر و ڕێچکە شکێنی قەڵاچۆکردن و نەهێشتنی نەخوێندەواری دائەنێم لە کوردستاندا چونکە بەر لەو و تا سەردەمی ژیانی ئەویش کەس ئەو بۆچوون و ئەرکە پیرۆزەی نەبووە و نەی گرتۆتە ئەستۆی خۆی.

فەرموون ئەوەتا مامۆستا (جەمال بابان) لە یاداشتی منداڵیدا بۆمان ئەگێڕێتەوە کە باوکی مودیری ناحیەی سروچک (بەرزنجە) بووە و (زێوەر)یش ئەو دەمە مامۆستای قوتابخانە بووە، چۆن هانی خەڵکەکەی داوە دوای تەواوکردنی کار و فرمانی ڕۆژانە یان شەو بێن پێیان بخوێنێ.

دووەم: زێوەر بەرابەری ئەدەبی منداڵ دائەنێم کە بیرەکەی لە خۆیەوە سەری هەڵداوە، بۆ گۆرانی و سروودی کوردی، بەڵگەشم پێشەکییەکەی نامیلکەی (دەستەگوڵی لاوان)ە کە بەقەڵەمی نووسیویە.

خوێنەری بەڕێز، هیچ دیوانێک و نووسراوێک خاڵی نابێ لە کەموکوڕی تەنانەت دوای چاپیش،

لەوانەیە هێشتا زۆر شیعری تری زێوەر مابێ کە ئێمە دەستمان نەکەوتبێ ئەگەر لە دڵسۆزانەوە شتی ترمان زۆر پێ گەیشت بەڵێن بێ لە چاپێکی تردا و لەگەڵ ڕاستکردنەوەی هەڵەکاندا جارێکی تر بەشێوەیەکی قەشەنگتر چاپی بکەینەوە.

سوپاس و ڕێزم بۆ ئەو دۆست و ئەدەب دۆستانەی کە کەشکۆڵی تایبەتی خۆیان یان چەند نموونەی شیعریان بۆ ناردووین کە بەراوردمان کرد هەموو یەک سەرچاوە ئەگرنەوە کە ئەویش مامۆستا (نەجمەدین مەلایە) لەوانەش بەڕێز کاک ئەحمەد و حەمکولی قەسساب.

مەحموود زێوەر



## زێوەر

### ١٩٤٨-١٨٧٥

زێوەر ناوی عەبدوڵڵای کوڕی محەمەدی ئەفەندی مەلا ڕەسوڵی بەبنەچە پشدەرییە و لەساڵی ١٨٧٥ی زایینی بەرامبەر ١٢٩١ی کۆچی لە شاری سلێمانی لە گەڕەکی کانیسکان هاتۆتە دونیاوە. وەک خۆی بۆمان ئەگێڕێتەوە لە ڕۆژنامەی ژین ژمارە ٦١٨ شوباتی ١٩٤١ نووسیویە:

«ئەو ڕۆژەی ناردمیانە قوتابخانە تەصادوفی نەورۆزی کورد، مامۆستاکەم وەرەقەیەکی (نەورۆزنامە)شی دا بەمن پارەی بۆ بەرم. منداڵان لە هەموو لایەکەوە هەڵ ئەپەڕین و نەورۆزنامەیان ئەخوێندەوە منیش سەیرم ئەکردن نەم ئەزانی بیخوێنمەوە، کە هاتمەوەماڵەوە دەستم کرد بەگریان، باوکم وتی بۆچی ئەگری. ئەوە پارە بۆ مامۆستا ئەوەش بۆ خەرجی خۆت. وتم بۆ پارە ناگریم. ڕەفیقەکانم هەموو ئەم کاغەزە ئەخوێننەوە و من هیچ نازانم، وتی ڕۆڵە عاجز مەبە من فێرت ئەکەم، میقدارێک خەریک بوو شیعرێ فێر بووم (نوروز شد نوروز شد) ئەنجا وامزانی میرزا شەفیعم...»

دوایی لە حەوت ساڵانە خرایە حوجرەی مەلا سەعید (خواجە ئەفەندی) بۆ بەر خوێندن. قورئان و ناگەهان و گوڵستان ئەخوێنێ، بەدەم فارسی خوێندنەوە دەست ئەکا بە (نصاب صبیان) و ئەچێتە فەقێیەتی، لە پێشا هەر لە سلێمانی، بەڵام لەم ماوەیەدا فارسییەکەی لای خواجە ئەفەندی هەر ئەخوێند، لە پاشا ئەچێ بۆ مەریوان و بانە و لەوێوە بۆ موکریان و ساباڵاخ و بەسەر ڕەواندزدا ئەگەڕێتەوە بۆ هەولێر و کەرکووک و دێتەوە بۆ سلێمانی لە مزگەوتی (بن تەبەق) مزگەوتی عیرفان دەرزی عیلمی عەروز و قافیە لە لای عیرفان ئەفەندی ئەخوێنێ و ئەبێ بەموستەعیدێکی باش.

زەمان زەمانی تورک و چوونە ئەستەموول باو بووە، ئەمیش هەوای ئەو چوونەی ئەکەوێتە سەر، لە ساڵی ١٣١٧ی ڕۆمیدا ملی ڕێ ئەگرێ و ئەچێ بۆ ئەستەموول، لەوێ لە لایەکەوە لەگەڵ (عالم و ئەدیبە)کانا هەڵسوکەوتی کردووە، لەلایەکیشەوە هەموو دەمێ تێکەڵاوی لەگەڵ ئەو پیاوە کوردانەدا کە لەوێ ئیش بەدەست بوون کردووە. چوار ساڵێک بۆ خوێندن و زیادکردنی زانیاری دنیا و دیدەیی لە ئەستەموول ئەمێنێتەوە لە پاشا هاتۆتەوە بۆ سلێمانی.

لە مارتی ١٣٢٤ی ڕۆمی و دوای تاقیکردنەوە کراوە بەمامۆستای قەواعیدی زمانی تورکی لە ڕوشدیەی عەسکەری بەمووچەی ٤٠٠ قروش، تا هەڵگیراوە.

لە مارتی ١٣٣٠ کە قوتابخانەکە گۆڕا بەمەعاریفی عومومی و ناونرا (نەشویفەیە) دامەزرا بەوەکیلی مامۆستای یەکەم بەمووچەی ٥٠٠ قروش کە پێیان ئەوت (باش معلم) و مایەوە بەمامۆستا هەتا ئیخلالی ئینگلیزی و لە کانوونی یەکەمی ٩١٨ کرا بە (باشکاتب تەحریرات) بەمووچەی ١٦٠ ڕوپیە.

کە ئینقلاب ڕووی دا لە شارا بێ ئیشوکار مایەوە تا لە ١٩ شوباتی ٩٢١ دا بەمامۆستا دامەزرا لە (نموونەی سەعادەت) بەمووچەی ١١٠ ڕوپیە و لە شوباتی ٩٢٢ دا مووچەکەی زیاد کرا بوو بە ١٢٠





ڕوپیـە تا چۆڵکردنی شاری سلێمـانی بەهۆی ڕووداوی سیـاسـیـیەوە. لە مـارتی ١٩٢٥دا سـەرلەنوێ بەمامۆستای یەکەم دانرا لە قوتابخانەی سلێمانی یەکەم بە ١٣٠ ڕوپیە لە پاشا مووچەکەی کەم کرایەوە بۆ ١٢٠ ڕوپیـە بەهۆی باری ئابووری وڵاتەوە و گـوێزراشـەوە بـۆ قـوتابخـانەی سلێمـانـی دووەم و مـایەوە تا ساڵی ١٩٣٠ لەوەدوا گوێزرایەوە بۆ ناحیـەی بەرزنجە و بەمـامۆسـتـایەتی مایەوە وەکـو سزایەک و دوور خستنەوەیەک بۆ دابڕان لە کۆمـەڵ و ڕۆشنبـیـران و بێ ئاگـا بوون لە ڕووداوی سـەردەمی خـۆی تا سـاڵی ١٩٣٨ و لەوێشەوە بۆ بیارە و لە دواییشدا لەسەر کار لابرا بەمانگانەی (٣,٨٣٢) دینار و هەشت سەد و سی و دوو فلس. کە هی ماوەی خزمەتی کۆنی بوو.

زێوەر لە گـوزەراندا زۆر ئـامـادە نەبوو، بەمـووچەیەکی کـەمی خـانەنشـینی شـاهانە و سـەر بەرزانە ڕای ئەبوارد ئەوەتا لە نامـەکـەیدا کـاتێ نامـیلکەی چیـرۆکی خێـوی ناو مـزگـەوت و سـۆفی کـەریمی چەرچی پێشکەش بەحەسەن بەگی جاف (حەسەن فەهمی) ئەکات تێیدا نووسیوویە: «ئەم ڕجای خوصووصییەم لە خزمەتدا ئەوەندەیە نەعەریضەکەم بەعـەریضەی طەلەب بناسە و نەکتێبەکە لە ضمنی هیچ مەطلەبێکا تەقدیم نەکراوە بەئومێدی هیچ جائزە و موکافەئات نەنێرراوە. ڕجا ئەکەم کە ئەویش هەر بەمحەببەت و یادگاری قوبوولّی بفەرموون. بێخود کە تەشریفی لە خزمەتدایە ئەزانێ شارەزایە تا عـومرم گەیشتۆتە ئەم وەقتە شیعر فرۆشیم نەکردووە و ئێوەش هەروای بزانن بەگم.» ئینجا لێرەوە با ئەوە بڵێین کە کەسێک خۆی بڵێ شیعـر فرۆشیم نەکردووە ئایا ویژدان ئەفـرۆشێ؟؟ ستایش و پیا هەڵدان بۆ پلە و پایە و پارە ئەکات؟؟؟

نەء هەرگـیـز نەء، زێوەر هەرچەنـدە خێـزان باریش بـوو نەفسـێکی زۆر بەرز و شاهانەی بووە، دەروێش مەشرەب و ڕەوەند و خواپەرست و دیانەت ڕاگیربووە وە هەر ئەوەش بووە بەوەی جێی مـتمانەی بنەماڵەی شێـخی نەمر بێ ئەوە بوو شـێخ ڕەؤوفی کوڕی لە خـوێندنا دواکەوت و ئەویش کەسێک کە جێی بڕوا و مـتمـانەی شێـخی نەمر بێت (زێوەر)ە و هانای بۆ دێنێت تا نامـەیەک بۆ شێـخ بنێرێت و باسی هەوڵ و کـۆشش و بەردەوامی ڕەؤوفی تیـا بکات. بەو نامـە شـیـرین و ئەدەبیـیـە بەرامـبـەر سـەردار و مـەلیک و حوکمداری کوردستان نـامەیەکی جوان و قەشـەنگ و ڕەنگین ئەڕازێنێـتەوە و بـۆی ئەنێرێ کە دەقەکەی لە بەشی ستـایش و پیاهەڵدان ئەخوێنیـتەوە ئەمەش ئەوە ئەگـەیەنێ کە شێخ زۆری خـۆش ویسـتووە و ڕێزی تایبـەتی بۆ داناوە و ئەمـیش جێی لە دڵی شـێـخی نەمـردا کـردۆتەوە. ئیـدی چۆن زێوەر هیـچی بۆ شـێخ نەنووسیوە و نەوتووە؟

زێوەر چۆن شـاعـیـرانی پێش سـەردەمی خـۆی لە تـورک و فـارس و کـوردەکـان کـاریگـەرییـان هەبووە لە سەری و ڕێباز و ڕێوشـوێنی زۆریان بەشیعـرەکـانیـەوە دیارە، هەروەها ئەمـیش کـاریگـەری تەواوی هەبووە لەسەر شـاعـیرانی هاوچەرخی خـۆی، وەکو مـامـۆسـتـایانی خوالێخـۆشـبـوو عـەلائەدین سەجـادی و ڕەفـیق حیلمی و عـەلی باپیر و شێخ نوری شێخ سالّح و عـەلی عـارف ئاغا شاری ئەخۆڵ و بێکەس و بـەختـیـار زێوەر و زۆری تریش، لەسەر هەمووشیانەوە پیرەمێردی نەمر.

بێینە سەر پەراوێز و شیعـرەکـانی، ئەوە بوو لە سەرەتاکەدا بەکەمی ئاماژەم بۆ ئەوە کرد کە نەجمەدین





مەلا زۆر پەراوێزی بەهەڵە و ڕا و بۆچوونی خـۆی داناوە بۆ شیـعـرەکـان و خوێنەریشی خسـتـۆتە هەڵەوە. ئەوەتا لە هەڵبەستی ئاسایشەکەیدا:

حـەمـدوللا وا لە دەوری باغـی دێ سـەنگەر نەمـا
ئەشـقـیا شـەق بوو شـەق پێنج تیـر و مـاو و زەرنەمـا

هەر بەخـەتی خـۆی جـۆرە پەراوێزێکی تـری بـۆ ئەم هەڵبـەسـتـە نووسـیـوە کـە زۆر جـیـاوازی هەیە لەوەی پێشـتری. ئینجا لەبەر ئەوەی جیـهانی شیعـری زێوەر زۆر فراوانە و دابەش ئەکرێت بەسەر حکوومـەتدا کە یەک لە دوای یەک هاتووە، دەوری عـوسمـانی، ئیـحـتیـلالی بریطانیـا، حکوومـەتی کوردیی شێخی نەمر و دەوڵەتی عـێـراق کـە لەم هەر چوار بوارەدا ڕۆڵـی شـیـعـری خـۆی دیوە بەسـەرکـەوتوویی ئینجـا بەڕای من کەسێک شارەزایی تەواوی ئەو سەردەمە مێژووییەی نەبێ بۆی نییە پەلامار بدات و بەپێی ڕاوبۆچوونی ئیمڕۆ شیعرەکان هەڵسەنگێنێ و بیانداتە بەر تانە و تەشەر.

زێوەر بەرهەمی زۆرە لەمانە کە لە سەردەمی ژیانی خۆیدا چاپ کراون.

١- ژیانی پێغەمبەران.
٢- دەستەگوڵی لاوان.
٣- چیرۆکی خێوی ناو مزگەوت.
٤- داستانی (سوزناک کربلا) شیعرە بەفارسی لە چاپ دراوە ١٩٨٨.
٥- چیرۆکی حکوومەتێکی خەیاڵ و بەشێک لە کتێبی (من عمان الی العمادیة) کە ئەوەیان وەرگێڕانە و لە ساڵی ١٩٩٩ لە دەزگای خاک و بنکەی ئەدەبی گەلاوێژ دووجار چاپ کراوە.
٦- سۆزی نیشتمان، بەشێکی کەمی دیوانی شیعری ساڵی ١٩٥٧ چاپ کراوە.
٧- (فـەرهەنگی زێوەر) دەسـتنووسـە و ئامـادەیە بۆ چاپ، بریتـیـیـە لە ٢٣ هەزار وشـەی عـەرەبی وەرگێڕاوەتە سەر زبانی کوردی و من خستوومەتە سەر شێوە ئیملای تازە.
٨- وەرگێڕانی کتێبی (الزنبقة البیضاء) کە هی نووسەرێکی ڕووسی بوو بەناوی (گریگوري بتروف) بەداخەوە کەوتە لای ئامینەخانی خوشکم و نەگەڕایەوە دیارە فەوتاوە.
٩- (دیوانی زێوەر) ئەمەی ئێستە لەبەر دەستایە و ئومێدەوارم کەموکوڕی نەبێ.

ماوەتە سەر ئەوەی کە بڵێین مامۆستا محەمەد فاضل مستەفا نامەی ماجستێری لەسەر (زێوەر و ژیان و بەرهەمـەکـانی) لە زانکۆی سـەلاحەدین بەسـەرکـەوتوویی وەرگرتووە. پیرۆزبایی لێ ئەکـەین. زێوەر لە ژیانی خێزانیـدا دوو ژنی هێناوە، یەکەمیـان کچی خاڵی بووە ناوی ڕەعنا خانی کچی حاجی حەسەنی سەلیم ئاغـای جوامێر ئاغای پشدەری بووە کە ئەکاتە خوشکی فایق (بەختیـار) و دوو کچی (زوهرە و حلاو)ی لێ بووە و ژنی دووەمی (شەمسە)ی کچی حەمە سووری مەلا قادر بووە کە ئەویش بەخزمایەتی لە دایکی شەمسە خانەوە ئەگاتەوە بەزێوەر و لە میش سێ کچ (جەمیلە و ئامینە و شایستە) و دوو کوڕ

(مەحموود و حەسەن)ی لێ بووە.

زێوەر لە گوزەراندا زۆر ئامادە نەبوو، مانگانەیەکی کەمی تەقاویتی هەبوو کە لەم دواییەدا بەوە ڕای ئەبوارد هەرچەند خێزانێکی زۆری هەبوو نەفسێکی زۆر بەرزی شاهانەی بووە، دەروێش مەشرەب و ڕەوەند و خواپەرست و دیانەت ڕاگیر بوو، لە خواردنەوە بەدوور بوو حەزی بەجگەرەکردووە، لەم دەوری دواییەدا تا بەنەخۆشی نەگلا بوو زیاتر وەقتی لەگەڵ ئەدیب و شاعیرەکاندا بەباسی لێکۆڵینەوەی (شیعر و ئەدەب) ڕائەبوارد بەتایبەت لەگەڵ مامۆستا مەلا سەعید ئەفەندی کابان دا کە بەڕاستی وەک دوو برا و دوو ئازیز و خۆشەویست هەر شەو لە یەک دانەبڕان و مزگەوتی عیرفان (بن تەبەق)یان کردبووە جێ نزرگە و دانیشتن لەگەڵ ئەمیشا مامۆستا مەلا ئەحمەدی حاجی مەلا ڕەسوولیش هەردەم لەگەڵیان بوو، زۆر حەزی بەدامە و شەترنج و سەیران و دیمەنە دڵڕفێنەکانی کوردستان بووە.

مامۆستا بەهجەت سەعید کابان ئەگێڕێتەوە:

لە هاوینی ساڵی ١٩٤٧ لە خولێکی تایبەتدا کە بۆ قوتابییانی قوتابخانە سەرەتاییەکان کرابووەوە چەند مامۆستایەک وانەیان تیا ئەوتەوە یەکێک لەوانە خوالێخۆشبوو مامۆستا فائق بێکەس بوو، ڕۆژێکیان لێم پرسی مامۆستا جوانترین و بەهێزترین شیعر بەلای بەڕێزتانەوە چییە؟ فەرمووی ئەم هۆنراوەیەی مامۆستا (زێوەر)ە کە ئەڵێت:

گەرچی ئەرزی هێند بڵندی وەختە لای من بچیتە عەرش
واسیتەی سەربەرزی بۆ ئیجرای ئایینی منی

ئەمە بەشێکە لە هەڵبەستی سروودی (ئەی وەتەن چەند خۆشەویستی) عەلی باپیر ئاغای شاعیر بێجگە لەوە لە کتێبی (گوڵ دەستەی شوعەرای هاوعەسرم)دا بەشێکی تایبەتی بۆ زێوەر داناوە لێرەشدا بەم چوارینە زێوەر هەڵ ئەسەنگێنێ:

زێوەر لە کوردی یا زۆر تەبعی تەڕ و ڕەوانە
بێخود لە فارسی دا هوشیار و نوکتە زانە
نوری موقەللیدە بێ ڕاوکە شیعری نایە
شوکری بەڕاستی ئەیلێم ئوستادی شاعیرانە

عەلی باپیر ئاغا گێڕابوویەوە کە کاتی خۆی ئەم شیعرەی وتووە. حەمدی زانیویەتی شەش مانگ قسەی لەگەڵا نەکردووە.

عەلائەدین سەجادی لە بەرگی یەکەمی چاپی یەکەمی مێژووی ئەدەبی کوردیدا بەشێکی تایبەتی بۆ زێوەر تەرخان کردووە.

ڕەفیق حیلمی لە شیعر و ئەدەبیاتی کوردی بەرگی دووەمدا بەشانازییەوە باس لە زێوەر ئەکات.

بەڕێز صدیق بۆرەکەیی لە کتێبە بەنرخەکەیدا کە باس لە ئەدەب و مێژووی ئەدەب ئەکا بەشێکی زۆری





بۆ زێوەر تەرخان کردووە لەمانە زۆر و زۆر باسکراون لە گۆڤار و ڕۆژنامە و ئێستگە و کەناڵەکانی تەلەڤزیۆنەوە، ئەمە کارێکی وای کردووە کەسانێک شانازی بە (زێوەر)ەوە بکەن و بیکەن بەنازناوی خۆیان و دەست لە ناوی باوک هەڵگرن و بیسڕنەوە. لەم ئاخرەشدا و لە پیری و لاوازی لەگەڵ نەخۆشیدا بوون بەدەستەبرا تا لە ڕۆژی ١٩٤٨/١١/١٠ هەر لە شاری سلێمانی و لە گەڕەکی (شێخان)ەکانی ئاسکان، شەقامی کاک ئەحمەدی شێخی ئێستە، تەنیشت مزگەوتی عیرفان (بن تەبەق) لە تەمەنی ٧٣ ساڵیدا دڵە گەورەکەی لە لێدان کەوت و گیانی پاکی بەرەو ئاسمانی بەرین ڕێی گرتەبەر و تەرمەکەشی بەرەو گردی گوڵان (جۆگە) بەڕێ کەوت، وەک دێتەوە بیرم و بیستمان لە کاتی هەڵگرتنی تەرمەکەی مقۆ مقۆ و مشتومڕ پەیدا بوو لەنێوان لایەنەکاندا هەر کەسە خۆی بەخاوەنی ئەزانی بەڵام لە پاشا کێشەکە چارەکرا و بەشێوەیەکی ڕەسمی و نیزامی بەرەو گۆڕستان بەڕێ کرا و خەڵکێکی زۆر لەگەڵ تەرمەکەدا بوون و قوتابییان بەڕێز و بەسروودی تایبەتی ماتەمینییەوە ئەم چەند دێرانەیان ئەوتەوە کە لە هەڵبەستی مامۆستا ا.ب هەوری بوو:

کۆستی سەختی جەرگ بڕا
بەرگی ماتەم بۆ گشت بڕا
ئەمڕۆ فەرزە چونکە زێوەر
لە باخی ژین وا چووە دەر
ئەو (زێوەر)ەی گشت ژیانی
کاتی پیری و گەنجی و جوانی
سەرفی ڕێگای مەعاریف کرد
نامرێ کەسێ بەڕووی سوور مرد

ئەم چەند دێرەم لە کاک کەمال قادر شارباژێڕییەوە دەست کەوت کە خۆی یەکێک بووە لەو قوتابییانەی بەڕێز ئەم سروودەیان خوێندوەتەوە بەئاوازێکی تایبەتی کە گەیشتنە سەر قەبران و ئینجا مامۆستا عەبدولمەجید حەسەن، مودیری مەعاریفی ئەوسا و بەعەرەبی وتارێکی جوان پێشکەش ئەکات و، زێوەر بەباشی ئەنرخێنێ وەک مامۆستا بەهجەت سەعید کابان بۆمان ئەگێڕێتەوە: «لە کاتی بەخاک سپاردنی خوالێخۆشبوو مامۆستا (زێوەر)دا لە گردی جۆگە خوالێخۆشبوو (پیرەمێرد) لەسەر گۆڕەکەی وەستا و وتی: زێوەر بەبیرتە لەگەڵ مەلا سەعید ئەفەندی کاباندا لە کاتێکدا دەرستان بەقوتابییەکان ئەوت تەیارەکانی ئینگلیز بۆردوومانی سلەیمانییان ئەکرد؟».

بەم جۆرە پەردە بەسەر تەمەنی شاعیرێکی پڕ ئەزموونی پەروەردەیی و کوردایەتیدا دادرایەوە وەک خۆی لە پێشەکی دەستەگوڵی لاوان و چیرۆکی خێوی ناو مزگەوت و سۆفی کەریمی چەرچی دا هەندێ شت ئەڵێت نموونەی خۆبەختکردن بوون وەک خاوەن قەڵەم و هەڵوێست. زێوەر ئەدەبی بەقەڵەم نووسیوە

بەکردەوەش سەلماندویێتی بەرهەمەکانی و نووسینەکانی بەڵگەی هەموو بۆچوونێکن، نازانم چۆن لە چاکە و پیاوەتی و هەوڵ و کۆششی بەڕێز دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسول دەرچم کە زۆر زۆر بەپەرۆشی زۆر کاتم لێ گرت و وەرسم کرد و وەڕس نەبوو هەر بەردەوام بوو بۆ هێنانەدی ئەم دیوانە، بەداخەوە نازانم باسە بەنرخ و سوودەکەی کە بەڕاستی دیراسەتێک بوو بۆ ئەو چینە تازەیە کوێ کەوت و ڕۆشنایی نەدی کە هەر من ئەزانم چ شەونخوونی و هەوڵی تیاداوە، زۆر سوپاسی ئەکەم و زۆر قەرزاریم، هەروەها برای بەڕێز و گەورە و خۆشەویستم کاکە محەمەدی مەلا کەریم کە هەر خوا بۆ خۆی ئەزانێ چ هەوڵێک و پەرۆشی نیشان داوە بەرامبەر بە لە چاپدانی ئەم دیوانە، خوا ئێوەش ڕوو سوور و سەر بەرزکات بۆ ئەم کارەتان چونکە لە زۆر دەرگامان دا و بەداخەوە لێمان نەکرایەوە وەیان بەڕوومانا داخرایەوە، نازانین (زێوەر) شایانی ئەمەبوو.؟

مەحموود زێوەر

سلێمانی ٢٠٠١/٧/٤

## پاڕانەوە و سکاڵا

ڕیش سپی، ڕوو زەرد و دڵ ڕەش پیری ئاخرشەڕ منم
لەم جیهان و لەو جیهان بێ قیمەت و بێ فەڕ منم
کردەوەی چاکم نییە وەختێ کە سەیری خۆم ئەکەم
خاکسار و شەرمەساری دەشتەکەی مەحشەر منم(١)
ئێستە سواری ئەسپی نەفسم بۆ چەپ و ڕاست لنگ ئەدەم
ڕۆژی ئاخر صاحێبی سەیارەی پەنچەر منم
صاحیب خوانی بەبێ مینەت لە دنیا و ئاخیرەت
یا ئیلاهی هەر ئەتۆی، زۆر بێ نەواو سواڵکەر منم
ڕوو لە دەرگای کێ بکەم، گەر تۆ دەرم کەی چی بکەم
ڕوو ڕەش و بێ ئیلتیجا و بێ کەس و موضطەڕ منم(٢)

.................................................................

(١) خاکسار: خۆڵاوی، ئەوەی لە ناو خۆڵا بتلێتەوە.

(٢) ئیلتیجا: پەنا. موضطەر: لێ قەوماو.

## لە کوردستاندا گرانی*

سەیری دنیا کە لەگەڵ مەنظەرەیی ویرانی
دوور بە لێی خوێنی برینی دڵە ڕێگاوبانی
یەک دوو سێ پارچە کەلاوە نەبێ ماوە ئەثەری
جێگە هێلانەیی ئاوای نییە تا بڕوانی
شیددەتی گەرمی لە دوو چاوت ئەدا سەیری بکەی
کێوی خاکستەری گەرمە لە هەموو مەیدانی
کوا دێهاتی کە لە خاکی هەموو شێر بوو دەرئەکەوت
فەخری تەئریخی جیهان بوو ئەثەری شێرانی
کوا ئەوانەی قسەیان عەکسی ئەدایە دەرودەشت
پرسی دنیا کە لە کوێن عالەمی بێ پایانی
ئەمڕۆ هیچی نییە مەجموعی حیکایە و مەثەلە
هەر برینی دڵە ماوە ئەثەری عومرانی
جێگری سەبزەیی باغ و چەمەنە خاکی سیا
صەد هەزاران گەمەی ئاهەنگی لەطیف و جوانی



نایەتە حەددی نیهایەت لە وڵاتما برسی
بۆتە یەک مەقبەرە هەر عائیلەیی جارانی
هەر خراپە کە دەچێ ڕۆح لەبەرێ دەنگی نییە
دڵ وەکو بەردی ڕەق ئەتوێتەوە بۆ نیشتوانی
طەرەفێ فاجیعە ئەکرێنێتەوە جەرگی وەتەن
طەرەفێکیشی ڕەوە گورگە بەدەم و دندانی
وەک دڕندە لەشی بێ چارە و بێکەس ئەگەزن
ظەفەری ئاخری تورکان ئەمە بوو ئیحسانی
ئەی شەهیدانی وەتەن، ئەی بەفیدای خاکی وەتەن
عەزمتان زیندووە نامرێ بەخودای ڕەببانی
چونکە مەعنای وەطەنت مەملەکەتی ئیسلامە
نە وەکو شام و حیجاز و یەمەن و کەنعانی
تۆ کە خوێنت بەفیدا کرد بگەیە مەقصەدی خۆت
تۆ کە حەملەت ئەنەدۆڵ بوو کە نەما ئیمانی
حیرەتی خستە جیهان هەروەکو ئەجدادی کیرام
بێ شک و شوبهەیە تۆ ئەرشەدی کوردستانی
وا مەزانە لە دڵا خوێنی شەهیدیت کەم ئەبێ
یەکسەر ئەم مەشریقە ماتەم گرتوون، ئینسانی
عەزمی تۆ مەقصەدی تۆ هەرچی کە بووبێ هەر ئەبێ
مەحو ئەکا مونتەقیم ئەڕواحی، ظەلووم و جانی
سەعی تۆ ڕێی حەقە بۆ میللەتی خۆت، ئیستیقبال
سەر دەخا تاجی ظەفەر بەخشی ئەکا ئیستیقلال

.................................................................

* ئەم شیعرە لە ژمارە ٥ی ڕۆژنامەی ژیان، ١٨ی شوباتی ساڵی ١٩٢٦ی.ز بڵاوکراوەتەوە. شایانی باسە کە ئەم قەصیدەیە کاتی خۆی بەتورکی نێرراوە بۆ ڕۆژنامەی ژین ئەوانیش لەبەر ئەوە کە تورکی بووە بڵاویان نەکردۆتەوە دوایی دراوە بەشێخ نوری شێخ ساڵح و مامۆستا زێوەر بۆ ئەوەی قەصیدەکە وەرگێڕن بۆ کوردی، شێخ نوری بەشانزە دێر شیعر وەری گێڕاوە و لە ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە ٤ی ١١ شوباتی ١٩٢٦ی زایینیدا بڵاوکراوەتەوە. لە کۆتایی شیعرەکەدا ئەم تێبینییە نووسراوە کە دەڵێ:

«ئەم شیعرانە بەقەڵەمی زاتێکی موحتەرەمی کورد بەتورکی نووسراوەتەوە، ئەم زاتە لە منداڵییەوە لە ئەستەمبوڵ و ئەطرافی ئەستەمبوڵ گەورە بووە لەبەر ئەوە (مع الأسف) بەتەواوی هێشتا زبانی ئەصڵی خۆی کە کوردییە فێرنەبووە و ناتوانێ بەو زوبانە حیسسیاتی دەروونی خۆی بەتەواوی بخاتە سەر قاقەز. خۆی ئێستا لە کەرکووکە لەوێ لە دائیرەی





مەعاریفدایە ئەم چەند شیعرەی لەم ڕۆژانەدا ناردبوو بۆ مەطبەعە چونکە مەطبەعەکەمان بەتورکی هیچ نانووسێ ئەو شیعرانەی ئەولا لە طەرەف بولبولی خۆشخوان و شاعیری شیرین زوبان جەنابی شێخ نوری ئەفەندییەوە و لەپاش ئەو لە طەرەف ئوستادی شیعر و ئەدیبێکی ترەوە کە -لە ناوبردنی مەعذورین- عەینەن تەرجەمە کراوە ئێمەش لەم نوسخەیە و نوسخەی ئاتیدا هەردووکیان ئەخەینە پێش چاوی قارئینی کیرام و تەقدیری حیسسییاتی هەرسێکیان ئەکەین».

ئەمجا لە ژمارە ٥ی هەمان ڕۆژنامەدا لە ڕۆژی ١٨ی شوباتی ١٩٢٦ز تەرجەمەکەی مامۆستا زێوەریش بڵاوبۆتەوە و ئەم پێشەکییە کورتەشی بۆ نووسراوە دەڵێ:

«ئەم شیعرانەی کە عەرز کرابوو لە طەرەف شاعیرێکی کوردەوە بەتورکی بۆمان هاتووە لە طەرەف دوو ئوستادی شیعرەوە تەرجەمە کرابوو ئەووەڵ تەرجەمەکەی کە لە طەرەف جەنابی شێخ نوری ئەفەندییەوە کرابوو لە نوسخەی ڕابوردوودا خرایە پێش چاوی قارئینی کیرام ئەمەیش دووەم تەرجەمەیەتی کە وەعدمان دابوو لەم نوسخەیە دەرجی بکەین».

کاک ئازاد عەبدولواحید دەڵێ: ئەمە لێرەدا بەڵگەی ئەوەیە کە ئەم شیعرە شیعرێکی وەرگێڕراوە لە زمانی تورکییەوە، هەمان شیعریش لەلایەن کەسێکی ترەوە وەرگێڕراوە کە ناوی نەهێناوە کەچی مامۆستا نەجمەدین مەلا لە دەستنووسەکەیدا وەرگێڕانەکەی شێخ نوری و دوا بەدوای ئەو وەرگێڕانەکەی وەرگێڕە نادیارەکەشی کە لە ژمارەکەی دوای ئەوەدا بڵاو کراوەتەوە نووسیوەتەوە بەبێ ئەوەی دەستنیشانی ئەوەی کردبێ کە ئەمە شیعرێکی وەرگێڕراوە و سەرنجی خوێنەری دەستنووسەکە بۆ ئەو تێبینییە ڕابکێشی.

ئەنجا مامۆستا شێخ نوری کە جارێکی تر بەسەر ئەو دەستنووسەدا چووەتەوە هەندێ وشەی دەستکاری کردووە چەند دانە شیعرێکی تری بەدەستخەتی خۆی بۆ زیاد کردووە ئەویش نەی نوسیووە ئەمە وەرگێڕانە دیارە پشتی هەر بەو تێبینییەی ڕۆژنامەکە بەستووە بەڵام کاتێ ئەم شیعرەی بۆ مامۆستا گیوی موکریانی ناردووە بەمەرەکەبی سەوز نووسیویەتی: (ئەم غەزەلە ئاتییە لام وایە بۆ دەرج شایستە بێ) دیسان بەمەرەکەبی سەوز دەری خستووە کە ئەو وەرگێڕە نادیارە مامۆستا زێوەری شاعیرە کە کاتێ خۆی ڕۆژنامەکە لە ناوهێنانی مەعذور بوو کە دەڵێ (ئەمەش عەینی مەوزوعە هی شاعیری شەهیر زێوەرە) ئینجا شیعرە وەرگێڕاوەکەی زێوەری لەوەکەی خۆی جیا کردۆتەوە.

## بۆ وەستا بیلال*

مەسئەلەی وەستا بیلال و بووکی تازەی بوو بەباو
وەختی پەردە پیرەزاڵە، وەختی مەجلیس نێرە پیاو[١]
گوڵ کە ماڵی بولبولە زۆر حەیفە کوند زەوتی بکا
پیری هەشتا ساڵەگی چ بکا لە یاری مەستە چاو؟
تەسکەڵەی پێ لازمە وەستا، نەوەک تەسکۆڵەیێ[٢]
ناسمێ دوڕڕی نەسوفتە کەس بەزەربی نەرمەساو[٣]
کاری وەستا کوورەبازی و لوولەسازیی ئاسنە
نەک عەقیق کون کردنە لادە لە فیکری ناتەواو
ئەی مەلا!، فەسخی نیکاحی پیری بێ کێر جائیزە
هیمەتێ، سا، تۆ ڕەهاکە ئاسکی نازگ لەداو

..........................................................

ئەم شیعرە لەلاپەڕە ١٦٣ی کەشکۆڵی (أ) و لاپەڕە ٣١ی کەشکۆڵی (ب)دا نووسراوەتەوە.





موناسەبەی گوتنی ئەم شیعرە وەکو نەجمەدین مەلا دەڵێ بەم جۆرەیە:
ساڵی ١٩٢٠ی ز وەستا بیلال ناوی بانەیی کە چەخماخ ساز بووە و تەمەنی هەشتا ساڵ بووە، کچێکی چواردە ساڵیی مارە کردووە، کچەکە ماوەی ساڵێک لەلای ماوەتەوە وەستا بیلال هیچی پێ نەکراوە، ئەمجا کچەکە هەڵاتووە بۆ شاربازێڕ و وەستا شوێنی کەوتووە.

(١) پیرەزاڵ: پیرێژن.

(٢) تەسکەڵە: دەزگایەکی چەخماخ سازی بووە، تەسکۆڵە، مەبەستی ئافرەتێکی تازە پێگەیشتوو و گەنج و جوان و قەد باریکە، لەنێوان (تەسکەڵە) و (تەسکۆڵە)دا جیناسی موحەڕڕەف هەیە.

(٣) دوڕڕی نەسوفتە: مەبەستی هینەکەی ئافرەتە کە دەست لێ نەدراوبێ، زەربی نەرمەساو: مەبەستی (بیلامانەکەی) پیاوە کە شلەپەتە و بێ هێزی پیاوەتی بێ.

## گۆرانیی ئینحیصار*

چوومە شاربازێر بەهەشتی دنیا
دێ بەدێ گەڕام ناو دەشت و چیا
بەحەیرانەوە جوانێ لە شانێ[١]
ئەم بەیتەی ئەوت عالەم بیزانێ
بژی زەکی بەگ بژی ئینحیصار[٢]
نەجاتیمان بوو لە کێشی قینطار[٣]
لەو دیوە چوومە ناحیەی پشدەر
ناحیەی مەردان جێی شێر و خەنجەر
لاوێ لاوکی ئەوت لە شاخی
زۆر بەسەربەرزی زۆر بەگوستاخی[٤]
بژی حکوومەت بژی ئینحیصار
نەجات بووین لەدەست دەستەی طەماعکار
ئەمجا ڕووم کردە ناحیەی سوورداش
ناوچەمی «تابین» دەوری «کەلەباش»
لەسەر شاخەوە کە گوێم بۆ ڕاگرت
کابرای «موغاغی» ئەم فەردەی ئەوت
بژی عەداڵەت بژی ئینحیصار
لەعنەت لە ظالم نەفرەت لە غەددار
لە سووورداشەوە چووم بۆ بازیان
ئەهالی هەموو بەشەوق بێ زیان

چوومە قەرەداغ جوانێ بەقەتار
عەکسی دەنگەکەی دابوویە کۆهسار(٥)
ئەی وت: هەر بژی ڕەببی ئینحیصار
نەجات بووین لەدەست هەشت حوققە بەچوار(٦)
چوومە «شارەزوور» مەعدەنی ئاڵتوون
ئەهالی هەموو دڵشاد و مەمنوون
بەهۆرەی کوردی ناو دەربەندیی خۆش
کە ئاوازیان ئەگەیاندە عەرش
خۆش بێ ولاتمان بژی ئینحیصار
تووتن لە چارەک گەیشتە دینار
سیاچەمانەی شاخی هەورامان
ئامۆزا گیانی پێنجوێنی کوێستان
خاڵەی ڕێبوار لە کورە کاژاو(٧)
تەسکین ئەدا بەدڵی سووتاو
خولاصەی قسە، شادیی ئینحیصار
نەشئەی خستە ناو دەشت و کۆهسار(٨)

.........................................................

* ئەم شیعرەی زێوەر لە ژین، ژمارە ٦١٢ی ساڵی ١٩٤٠ی ز بەناوونیشانی سەرەوە بڵاوکراوەتەوە لەکۆتایی شیعرەکەشدا «خاڵەی ڕێبوار»ێک نووسراوە، هەروەها لە لاپەڕە ٦٦-٦٨ی سۆزی نیشتمانیش چاپ کراوە بەڵام لەوێدا نووسراوە کە ساڵی ١٩٤١ی ز. گوتراوە دیارە هەڵەیە.

(١) شانێ: واتە لاپاڵێ، پەناییێک.

(٢) زەکی بەگ: مەبەستی ئەمین زەکی بەگە، کە وەزیری ئابووری بوو لە سەردەمی ئەودا ئینحیصاری تووتن دانرا.

(٣) قینطار: قینتار: ئامێرێکە بۆ کێشانە.

(٤) گۆستاخی: ڕووهەڵماڵراوی و بێ شەرمی.

(٥) کۆهسار: کوێستان، ناوچەی شاخاوی.

(٦) حوققە: بۆ کێشانە، لێرەدا مەبەست ئەوەیە کڕیار و سەلەم و سوود خۆرەکانی تووتن لە پێش دامەزراندنی دایەرەی ئینحیساردا چاووڕاویان لە جووتیارەکان دەکرد هەشت حوققەیان بۆ حیساب دەکردن بەچوار حوققە.
ئەو وشانەی کەوتوونەتە نێو کەوانەوە ئەم جێگە و شوێنانەن کە ئەکاتە دائیرەی ئینحیسار ڕێگەی دابوون تووتنیان تیا بچێنرێ لە ناوچەی سلێمانیدا. زێوەریش ئەم شیعرەی بۆ ئەوە وتووە چونکە بەر لە دامەزراندنی دایەرەی ئینحیسار سەلەم و سوود خۆرەکان، تووتنیان بەپارەیەکی کەم لە جووتیارەکان دەکڕی دیارە دامەزراندنی ئەم دەزگایە بوو بەهۆی بووژاندنەوەی جوتیار و توتن کەرەکان بەمەش خۆشی و فراوانییەکی ئابووری کەوتە وڵاتەوە.

(٧) سیاچەمانە، ئامۆزاگیان، خاڵەی ڕێبوار: ناوی سێ گۆرانی کوردین.

(٨) کۆهسار: ناوچەی شاخاوی و شیو و دۆڵ.





## گۆڕینی شیعری سەعدی شیرازی*

### «گفتوگۆی پەردە و ئاڵا»

سەعدی فەرموویەتی: لە ناو بەغدا
پەردە بێ دەنگ و دوور لە هەر دەعوا
بێ خەبەر بوو لە حاڵەتی عالەم
هیچ کەسێ بێ ڕەقیب نییە و بێ غەم
تێفکری ڕەنگی سوور بووە بەیداخ
ڕووبەڕووی هات بەگورجی و گوستاخ(١)
وتی: ئەی پەردە نازک و نازدار
سەیری من کە لەشم پڕە لە غوبار
بۆ هەمیشە ڕەفیقی وەک ماهی
هاودەمی نەوجەوانی دەرگاهی
یا، لەلای نازەنینی گوڵ ڕەنگی
دەفعەیێک تووش نەبووی بەدڵتەنگی
منی بێ چارە وام بەدەست شاگرد
لە سەفەردام لە دەشت و شاخ و گرد
خزمەتم زۆرە قیسمەتم دەردە
قەدری تۆ بۆچی زیاترە؟ پەردە!
وتی: بەیداخ سەرم لە هەیوانە
وەکو تۆ نیم سەرت لە کەیوانە(٢)
ئەوی نابینێ چاوی جێگا و ڕێ
عاقیبەت لووتی دێتەوە بەرپێ

.........................................................

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ٤٣-٤٤ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.
سەعدی شیرازی: ناوی عەبدوڵڵایە و کوڕی مەشرەف بەسەعدی شیرازی ناوبانگی دەرکردووە. شاعیر و صۆفییەکی بەناوبانگە، خاوەنی کتێبی گولستان و بوستان و کوللیات و چەند کتێبێکی ترە. دەڵێن: لە بنەڕەتا کوردە و خەڵکی هەورامانە. ساڵی ١٢٩٠ی ز. لە شیراز کۆچی دوایی کردووە. برێ لەم مەعلوماتە لە (معجم المؤلفين ٦/١٥١) وەرگیراوە.

(١) گۆستاخ: نەترس و بێ پەروا، ڕووهەڵماڵراو.

(٢) کەیوان: ئەستێرەی زوحەل.

## لەسەر شێوەی هەورامی*

نەو بەهار بەزمەن...

پەرێ عوشاقان! نەو بەهار بەزمەن
خۆشیی دەروونەن، سەیرانەن، ڕەزمەن
عالەم دڵ گوشا ئاهەنگش عەزمەن
گەشت و گوزاری سەروی یارانەن
ناز و نەزاکەت عیشوەدارانەن
جەبین گوڵ چنان مەستەن خەرابەن
بێ هۆش و سەرخۆش جورعەی شەرابەن
شەڕەن، ئاشتییەن، ڕازەن، نیازەن
ورشەی شەوقی نوور عەینی ئیجازەن!
عالەم بەرگی سەوز پۆشا سەراسەر
یەکسەر جەننەتەن سەحرا و دەشت و دەر
قەهقەهەی کەبکەن وە هەر هەردەوە
نەوای بولبولەن باز وە دەردەوە
زاری عاشقان نازی نازداران
ساقی مەی ڕێزەن جە بەزمی یاران
نێرگس دیدە مەست لالە ڕەنگ سوورەن
گوڵ مەسنەدنشین بولبول ڕەنجوورەن
تیپ تیپ وە ڕەم ڕەم خۆشفەن غەزالەن
شۆخەن شیرینەن، ئەبرۆ هیلالەن
شەونم چون لوئلوء مەدرەوشۆ جە دوور
چمان گەوهەرەن یا نە قەترەی نوور
(زێوەر) ئارەزووش وەسڵی دڵدارەن
غافڵ حەزینەن فەسڵی بەهارەن

........................................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٠٠–١٠١ی سۆزی نیشتمان وەرگیراوە.



## بەهاری زێوەر*

نێرە پۆڕێکی خاڵ و خەت نەخشاو
بانگی کردە ڕەفیقی ناو چەم و ئاو
بێنە سەیران و سەیری ئەم چەمەنە
ئەم هەموو دەشتە جەننەتی وەتەنە
کە زەوی بەرگی ئەتڵەسی پۆشی
کەوتە سەر عەردی نەغمەیی خۆشی
یەک کەڕەت سەوزە شیو و دەشت و کێو
گوڵ بەدەم، گۆپکە دارە داری مێو
گوڵی قەیسی و هەڵووژە سوور و سپی
نۆبەدار ئەرغەوانە ڕاست و چەپی
تیپانی نێرگس و سوپای لالە
یاسەمین و گوڵاڵە و ژاڵە

........................................................................

* ئەم شیعرە لە ژمارە ٥ی ساڵی ٥ی ساڵی ١٩٤٤ی ز. دا بەناوونیشانی سەرەوە بڵاوکراوەتەوە.

## تەیارە*

دێوێکە گیانی تیا نییە ئەکشێ بەچەشنی مار
بێ دەست و قاچ و خوێنە بەبێ گۆشت و بێ دەمار
ناو جەرگی پڕ لە ئاگرە هەردەم کە دێتە ئێش
خۆراکی ئاوە بێ دەم و دان بێ سمێڵ و ڕیش
هەرچەندە بێ پەڕە کە لەگەڵ کەوتە ئاسمان
چەند ڕۆژە ڕێگە زوو دەبڕێ ناگرێ وچان
ناڵین و گرمەگرمی لە هەستان و ڕۆینا
هەورە برووسکەییێکە بەسەر گیانی دوشمنا
ئەم دێوە گەورە بەچکەی زانینە ئەی هەژار
زانینە دێو لە ئاسن ئەکا و باڵەکەی لە دار
زانینە گیان ئەخاتە لەشی دار و بەردەوە
زانینە زێڕ و زیو کە دەرێنێ لە هەردەوە

زانینە شاخی گەورە وەکو لۆکە شر ئەکا
زانینە جەرگی شەو کە لە رووناکی پڕ ئەکا
دەریا کە بوو بەرێگەی رۆژ و شەوی هەموو
زانین نەبێ کە هێزی ئەوەی بێ مەگەر چ بوو؟
زانستییە چرایە وەکو زێڕی باخەڵە
گیانی وڵاتە بۆ سەر و گوێی دوشمنە پەڵە

........................................................

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ٤٢-٤٣ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.

## دیسان*

بوخارە دانش و ماکینەیە ئەجسام ئەسووڕێنێ
کە جیسمێ جەوهەری گوم کا لە ژێر بارا ئەبۆڕێنێ
سەماوەر دەم ئەکەی چا جۆش ئەدەی کوێخا لە ئاخردا
ئەبینم ژانەسەرتە زگ لە برسانا ئەقۆڕێنێ
کەسێ غەیبی نەکا ئەسڵ و نەسەب جینسی موعەییەن بێ
بەچەشنی فەحلی دابەستە لە مەیدانا ئەکۆڕێنێ
شەڕی ژینە لەسەر سەتحی زەمین کەوتۆتە ناو عالەم
لەناو ئەم حەربەدا نادان حەیاتی خۆی ئەدۆڕێنێ
ئەگەرچی مالیکی ئاو و ئەرازین چونکە بێ خێرین
بەسەر سەرمانەوە هەردەم یەکێ قەمچی ئەسووڕێنێ

........................................................

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١٠٩ی سۆزی نیشتماندا بەو ناوونیشانەی سەرەوە چاپ کراوە.

## سینەما*

داخی حەسرەت نەخشی بەست ئەمساڵ لەتەختی سینەما
بۆ ئەوانەی ڕائەکەن سەربەست ئەچن بۆ سینەما(١)
کێ ئەڵێ حەربە گرانی زۆر پەریشانە جیهان
تۆ بچۆرە سینەما وا تێ ئەگەی برسی نەما
کوڕ لە باوک کچ لە دایک شەرمیان لاخستووە
سینەما کارێکی وای کرد هیچ مناڵ ترسی نەما
بۆ تەماشا زۆر کوڕ و کچ بوونە هاوڕێی باوک و دایک
هیچ غەمی باوکیان نییە، وای درهەم و فلسی نەما(٢)





یەک بەیەک کۆشش ئەکەن تا زوو بچن بۆ ژوورەوە
با هەزار جار بانگ بکەن وا لۆجەو و کورسی نەما
عیلم و فەننی ئەورووپا فێربوون کە سەیری وێنە بێ
ئاگری حەسرەت ئەمێنێ هەر لە لەوحی سینەما
پێم بڵێن تا ئێستە چی فێربوون منیش دێم جاربەجار
تا نەڵێن پێم پاش ملە زێوەر کەوا شانسی نەما(٣)

........................................................

* زێوەر ئەم شیعرەی ساڵی ١٩٤٥ی ز. گوتووە لە کەشکۆڵی نەجمەدین مەلا (أ) ل٢٤٥دا بەناونیشانی «بۆ سینەما» نووسراوە لە ژمارە ٤ی گەلاوێژی ساڵی ٦ی ١٩٤٥دا لەژێر عینوانی سینەما بڵاو کراوەتەوە.
(١) سینەما، لەنیوە دێری یەکەمدا دوو وشەی لێکدراوە بەمانای «سینگی من»ە لەنیوەی دێری دووەمدا یەک وشەیە و بەمەبەستی سینەمایە. لەنێوان سینەما و سینەمادا جیناسی تەواو هەیە و زۆر جێگرتووە.
(٢) درهەم: پەنجا فلس.
(٣) ئەم دێرە شیعرە لە کەشکۆڵدا نەبوو.

## گاڵتەو گەپ و خۆ هەڵکێشانی قرژاڵ*

چوومە جێیەک بەبێ کشە و بێ دەنگ
دیم لەوێ ڕاکشا بوو یەک خەرچەنگ(١)
هەستی کردم لە ڕاستی خۆی وەستا
بانگی کرد کێیە هاتە جێگای تەنگ
کێیە دەستی لە عومری خۆی هەڵگرت
هاتە ئەم بیرە، قوولەیی شەوەزەنگ
من وتم: زێوەرم، موسوڵمانم
نوێژ ئەکەم دوژمنم بەدینی فەرەنگ
تۆ مەگەر چیت لە ڕێی موسوڵمانان
وا لە مێ ساکنی بەعەزمی جەنگ!
وتی من غیرەتم وەکو شێرە
حەملەی من زیاترە لە پڵنگ
شیر و تیر نامبڕێ ئەوەند سەختم
هەمە شەش پێ لەوەختی حەملە و جەنگ(٢)
نێشی دندان و ئێشی زەخمی من(٣)
نەوەکو مار و عەقرەبە، نە نەهەنگ(٤)

تا لە بەغدا زەمین کەرێ نەزەڕێ
بەرت نادەم نەکەویە حاڵی کەشەنگ
ئەو کە تەعریفی خۆی وەها بۆم کرد
کەوتمە وەسوەسەی خەیاڵی تەنگ
مەدحی خۆی هێندە کرد ئەمن ترسام
ڕەنگی سوورم چووە موقابیلی ژەنگ
لەرزە کەوتە جەمیعی ئەندامم!!
خۆی لە من کردە شێر و بەبر و نەهەنگ
هەڵمەتی دایە قاچم و ڕام کرد
دەنگی ناڵەی نەڕۆی دوو سەد فرسەنگ
ساعەتێ مات و مەست و حەیران بووم
هەروەکو سەرخۆشی شەراب و بەنگ
ئاخری من وتم چییە ترسان؟
ئەسلەحەم پێ نییە پەیاکەم سەنگ
خرکێ کەوتبوو بەئەسپایی[5]
چووم هەڵم گرت بەبێ تەقە و بێ دەنگ
هەروەکو ڕۆستەمی زەمان تێم گرت
کەوتە سەر پشتی زوشتی کوشتی سەنگ
شوکری خوام کرد لە ڕاستی خۆم سەد جار
دڵ ڕەحەت بووم لە دوشمنی بەد ڕەنگ
لێم موعەییەن بوو ئەو هەموو مەدحە
هەموو کابوو بەبای دەدا خەرچەنگ
زێوەرا، هاش و هووش مەسەلمێنە
تا لە سینەت نەدەن بەشیر و خەدەنگ

.......................................................

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ٦١-٦٣ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە مامۆستا نەجمەدین مەلا دەڵێ: زێوەر لە کاتێکا ئەم هەڵبەستەی داناوە کە قرژاڵێکی لە حەوزی بن تەبەقی مزگەوتی عیرفان دیوە. [مزگەوتی بن طەبەقی عیرفان لە سلێمانییە کەوتۆتە ژۆر مزگەوتی گەورە بۆیەش پێی دەڵێن (بن طبق)، چونکە کارێزاوێکی تێدایە بەپلیکانەوە بۆی دەچییە خوارێ. بۆیەش پێی دەڵێن عیرفان چونکە مەلا عەبدوڵڵا عیرفان ئیمام و مودەڕیسی بووە. پاش ئەو مەلا ئەحمەدی حاجی مەلا ڕەسوڵ و حاجی مەلا مارفی خاوێیی مەلای بوون].

) خەرچەنگ: قرژاڵ.





(٢) حەملە: هەڵمەت و پەلاماردان.

(٣) نیش: نووک.

(٤) عەقرەب: دووپشک.

(٥) خرکێ: بەردێ.

## چایخانەکەی دەروێش شەریف*

ئەگەر دەروێش شەریف دەروێشە بۆ ذیکری خودا ناکا
وەگەر خۆ سۆفییە بۆ ڕوو لە خەتمە و خانەقا ناکا
ئەگەر سوننی ڕەوشتە سەبی عومەر بۆ ئەکا دایم[1]
وەگەر خۆ شیعەیە بۆ ڕوو لە سەحنی کەربەلا ناکا
ئەگەر چاخانە گێرە مشتەری بۆ نارەزان یەک یەک
وەگەر خۆ بانگدەرە بۆ سەر منارە بۆ سەڵا ناکا
ئەوەم لا خۆش بوو ڕۆژێ شێخ محەمەد ڕووی لەپاشا کرد[2]
وتی پاشا: شەریف بۆ فەرقی شێخان و مەلا ناکا
وتی ئینسان نییە وەک بزنە جرتە تووڕەیە دایم
شیاکەی گەر لە... هەڵسووی لە گاگەلدا هەوا ناکا
بلوکم ماعیری شاعیر زەریف بمناسە ئەی سۆفی[3]
ئەزانی ماعیری وەک من لە دنیادا حەیا ناکا

.......................................................

* بۆ ئەم هەڵبەستە بڕوانە گۆڤاری ڕۆژی نوێ ژمارە ٢ساڵی ٢ لاپەڕە ٥٦ لەگەڵ باسێکی تێروتەسەل لەلایەن مامۆستا فازڵ محەمەد عیرفان.

(١) شێخ محەمەد گولانی.

(٢) ساڵح پاشا.

(٣) بلوک بچووک کراوەی بلەیە، بلەش بچووک کراوەی ئیبراهیمە وە مەرام لە سەید ئیبراهیمی حەفیدە.

## درۆ*

بڵێسەی خەرمەنی دەوڵەت درۆیە
شەرارەی مەزرەعەی ثەروەت درۆیە
موجەسسەم بێ صەداقەت مانگە یا ڕۆژ
ئەمما مەعنای شەوی ظوڵمەت درۆیە
ئەگەر ڕاستت ئەوێ ئەی نەوجەوانم
خەزانی باخەکەی حورمەت درۆیە

ئەتۆ بنوارە مەیدانی زەمانە
عەلەمداری سوپای نەگبەت درۆیە
درۆزن ڕوو ڕەشە لای خەلق و خالیق
سەبەب بۆ لەعنەت و نەفرەت درۆیە
درۆیە دەفعەییێک ناشتا ئەکا چاک
بەڵێ تیغی ڕەگی خزمەت درۆیە
درۆیە واسیطەی تەخریبی ئەخلاق
چراغی مەجلیسی غەیبەت درۆیە
صەداقەت پیشەی ئەربابی ناموس
لەکەی داوێنەکەی عیصمەت درۆیە
لەگورگ و ورچ و فیل و شێر مەترسە
دڕندەی صاحێبی هەیبەت درۆیە
ئیلاهی! ڕاستی چی بێ خراپی
کەوا مەقبوولی ناو میللەت درۆیە
مەسەلمێنن درۆزن بچنە جەننەت
ئەگەر بێتو بچن جەننەت درۆیە

........................................................

* زێوەر ئەم شیعرەی ساڵی ١٩٢٨ی ز. گوتووە لە لاپەڕە ٢٥-٢٦ی سۆزی نیشتماندا بەناوونیشانی «درۆ» چاپ کراوە.

### ئەزانم بینووسم!*

ئەزانم بینووسم بۆ هەر کەسێ من عەرز و حاڵ ئەمڕۆ
لە عەرزی حاڵی خۆم داماوم و صاحێب مەلال ئەمڕۆ
شکایەت کەم لە ئەبرۆی دڵگەشی یا چاوی خونخواری
بڵێم چی من لە تەئثیراتی زولف و خەتت و خاڵ ئەمڕۆ
ئەڵێن فەوتاوە باسی بولبول و گوڵ، شەمع و پەروانە
کەچی شەمعی گوڵی ڕۆخی بتێکی بێ میثال ئەمڕۆ
چراغی بەزمی عوششاقی، گوڵی گوڵزاری ئافاقی
بەناچار ئەبمە بولبول، ئەبمە پەروانەی جەماڵ ئەمڕۆ
ئەگەر تەنقید ئەکەن، تەقدیر ئەکەن ئەم ڕێگە ڕێگامە
کە بچمە سەیری لەنجەی دلبەری قەد ئیعتیدال ئەمڕۆ



کە مەنهەجمان لەسەر دینە نەوەک دینە بڵێن: موفتی
ئیتر لادە لە فتوای فاسید و قەولی بەتاڵ ئەمڕۆ
بەحوسنێکی خودا دادی وەکو نووری دوو چاوانە
مەکەن مەنعم بەقوربانی بکەم عەقڵ و کەمال ئەمڕۆ

........................................................

* ئەم شیعرە بەناوونیشانی «شێوەی زێوەر» لە ژینی ژمارە ٥٧٢ی ١٩٣٩/٦/٢٩ی ز. دا بڵاوکراوەتەوە. لە کەشکۆڵی نەجمەدین مەلاشدا لە لاپەڕە ١٦٥-١٦٦ نووسراوەتەوە.

### بولبولێ لای گوڵێ

بولبولێ لای گوڵێ بەدەنگ و سەدای
وتی: چەند خۆشە وەسڵی جانانە
باخەوان ڕوو نەکاتە ئێرانە
ئەو ڕەزا قورسە تف لە شکڵ و ڕەزای
**
بۆیی ڕیحان و غونچەی چەمەنم
پەرچەم و لێوی یار ئەخاتە نەزەر
ئەی فیداتم وەرە نەسیمی سەحەر
بێنە موژدەی ویساڵی گوڵ بەدەنم
**
شەوقی لەمپایە شەو لە بەرچاوم
ڕووی گوڵ ئاتەشین ئەخاتە خەیاڵ
مەشقی منداڵە پڕ لە خەتت و خاڵ
وەرە بۆ سەیری قەلبی نووسراوم

### بەرخی بێ دایک ئەگەر دەباڕێنێ

قیسمەتی گورگە گۆشتی تازە و تەڕ
ئاسمان چاوی کوێرە، گوێشی کەڕ
شین و شادی بە کەیفی خۆی دێنێ
باخی ڕەنگینی کائینات ئەمڕۆ
مەسکەنی قەومی وەحش و باربارە
مەدەنییەت پەرستە، غەددارە
پارە ناکا دوو سەد هەزار ڕۆ ڕۆ





خەڵک ئەڵێن: کۆنە شاعیرە زێوەر
کەی شعوورم بووە لە هیجرانا
ئاوی چاوم ڕژا لە گریانا
بێ تەماشایی شەمسەکەی خاوەر

## سەد تاجری دین

سەد تاجری دین خۆی لە زەرەر داوە لە دەرتا
بەسراوە دڵی موئمین و کافر لە کەمەرتا
سەودایی شەڕ و شۆڕە لەگەڵ ئێمە لەسەرتا
باکم نییە لەو خەنجەرە کردووتە بەبەرتا
شمشێری برۆت جەرگی بڕیوم بەئیشارەت

**

بۆ تۆیە موسەللەم لە جیهان شاهی یی خووبان(١)
داماوە لە تەصویری برۆت مانی یو سەحبان(٢)
مومکین نییە ئەم سوورەتە تەرکیبی لە ئینسان
تۆ صاحیبی ئەم چاهی زەنەخدانە بی، قوربان(٣)
سەد یوسفی کەنعانی ئەبێ بێتە ئیشارەت

**

دەریای خەیاڵم کە وەکو دیجلەیە جۆشی
نوطقم کە وەکو ڕەعدی بەهارانە خرۆشی(٤)
غەمزە و نیگەهت خستمیە بەحری خەمۆشی(٥)
چاوت وەکو شووشەی مەیە خۆت بادەفرۆشی(٦)
ڕۆحی بەنی ئادەم ئەکڕی بێتە تیجارەت

**

کەشتیی ئەمەلم کەوتەوە تۆفانی تەئەسسوف(٧)
نایێ بەسەرمدا کەڕەتێ بادی تەلەططوف(٨)
مەدحی لە دڵا جارییە بێ دەردی تەکەللوف(٩)
ئیسمێکی شەریفی هەیە مەنعە لەتەصەڕڕوف(١٠)
جیسمێکی لەطیفی هەیە قابیل بەصەدارەت

........................................................

(١) شاهی خووبان: گەورەی جوانان.





(٢) مانی: نەخش و نیگارکێشێکی بەناوبانگی ئێرانییە داوای پێغەمبەرییەتیشی کردووە لە سەردەمی بەهرامی یەکەمی ساسانیدا کوشتیان و پێستیان گروو هەڵیان هاخنی و لەبەر دەرگای شاری جوندیسابوردا هەڵیان واسی تا خەڵک سەیری بکەن.
سەحبان: سەحبانی کوڕی وائیل؛ خۆش گوفتارێکی دەم و زمان ڕەوانی عەرەبە نموونەی ڕەوانبێژی و زمانپاراوی بووە لە مێژووی ئەدەبی عەرەبیدا ساڵی ٦٧٤ی زایینی مردووە. واتە: مانی بەوێنە و نیگار سەحبان بەقسە و گوفتار هەردووکیان داماون ناتوانن وەصفی جوانی برۆی تۆ بکەن.
(٣) چاهی زەنەخدان: چاڵی چەناگە.
(٤) ڕەعد: هەور
(٥) بەحری خەمۆشی: دەریای خامۆشی.
(٦) بادەفرۆش: شەراب فرۆش.
(٧) تەئەسسوف: تأسّف: خەم و خەفەت خواردن.
(٨) باد: با. تەلەططوف – تلطف: سۆز و بەزەیی نواندن.
(٩) تەکەللوف – تکلف: شتێ بەزۆر بەسەر خۆتیا بێنی.
(١٠) مەنعە لە تەصەڕڕوف: واتە مەمنووع (من الصرف)ە غەیرە مونصەریفە: (ممنوع من الصرف) ئیصطیلاحێکی عیلمی نەحوە، هەر ئیسمێک جەڕڕە و تەنوینی نەچێتە سەرێ پێی دەڵێن: (ممنوع من الصرف).

## فەلسەفە*

چاوکزبووە، گوێ کپبووە. قەد خەم بووە، دان کەل(١)
بەم حاڵەوە خواخوامە کەوا ڕاکەمە سەر کەل
سەربەستی لەسەر بەرزییە، تۆیش وای لە نشێوا
قاچت شەلە، دەستت پەلە، بێ سوود ئەکوتی پەل
هەر مەنفەعەتی شەخصییە گوفتاری بەسوودت
بۆ خواردنە تەئسیری هەموو ئاگری مەنجەڵ
هەر کردەیی ڕاست، تۆ ئەگەیەنێ بەمەرامت
ناگاتە ئومێدی بەقسە، زۆر زلی تەنبەڵ
وەک مەرثیەخوان عەشقی عەلیی کرد بەبەهانە
دەم پڕ وەطەن و عەشقە دڵیش جێگەی مونحەل
گۆڕاوە زمانم وەکو تەبدیلە زەمانم
سێوم بووە توففاح و بەهێشم بەسەفەرجەل
ئێستێ بکە ڕاوەستە برا موشکیلە ئیشت
ڕێگا هەموو گیراوە بەخەندەق، بەتەم و تەل

........................................................

(١) قەد خەم بووە: پشت کۆماوەتەوە یا چەماوەتەوە لەبەر پیری.
* ئەم شیعرە بەناوونیشانی سەرەوە لە لاپەڕە ٥٠-٥١ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.

## نەفست مەگەسە*

نەفست مەگەسە، هەروەکو هەنگوینە عەلائیق
بەم ڕەنگە چلۆن کەشفی ئەکەی سیرڕی عەلائیق
میوانی سەراپەردەیی دیوانی خودایی
بۆ خزمەتی حەق نیتە ئەتۆ توحفەی لائیق
مەیلت لە هەوای نەفس و لە ئارایشی خۆتە
مەشغوولّی بەئەنهار و ئەراضی و حەدائیق
دەستی هەوەست کورتە لە دەرگاهی موناجات
طوولانییە بۆ دامەنی دنیاو و خەلائیق
تۆ لادە لە حیقد و حەسەد و عوجب و تەکەبوور
داینێ طەمەع ئەوسا دەبییە عاشقی لائیق
ئەی مەردی ڕەهی سالیکی مینهاجی شەریعەت
خوێنین کە دەروونت وەکو ئەندامی شەقائیق
ڕەنگ زەرد بە وەکو شەصت پەڕو، لالّ بە وەکو سۆسەن
ئەوسا بەهەموو مەطلّەب ئەتۆی واصیل و فایق
(زێوەر) وەنییە مونتەعیظیش بی بەنەصایح
شاعیر هەر ئەکەن دایمە ئەفکاری دەقایق

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١٤٧-١٤٨ی کەشکۆڵی (أ)دا نووسراوەتەوە لە گۆڤاری بەیان، ژمارە ١٢٧، لاپەڕە ٩٠یشدا بڵاوکراوەتەوە.

## باسی زستان*

زستان وجوودی ساغە دەماری بەقووەتە
ئەمڕۆ کە بیست و پێنجی شوباتە شەبابیە
ئەم هاژە هاژە بارش و عود و ڕوبابیە
دەرحەق فەقیر و کوێر و هەتیو بێ مرووەتە
**
دنیا بووە بەبەحری سپی شاخ و شیو و دەشت
ناودێ جزیرەییێکی ڕەشە چەشنی مالّطەیە(1)





ئەم بەفرە بەفری ڕاستە نەوەک بەفری گالّتەیە
ڕێگا بڕاوە (ڕان) کە لە دێوە بچێتە گەشت
**
گردن کەچی سوپاهی زومستانە شاخ و دار(2)
سەر شۆڕ و بێ طەڕاوەت و بێ مەنظەرەی جوان
بێ سەبزەزاری ڕێگەی ئاوی سپی و ڕەوان
بێ قاسپە قاسپی کەبک و بەبێ نەغمەی هەزار(3)
**
هەستام بە لەرزە لەرزەوە تا ئاستانی شاە
زستان کە شاهی لەشکرە بەڵکو بکا دەوا
عالەم لە ظولمی لەشکری ئەو کەوتە حەل وەلا
پێم وت: دەخیلی تۆم بەدڵ ئەی شاهی مەه کولاە
**
ترست ببێ لە خالیقی دنیاو و شای بەهار
سولّطانی عەدل پەروەرە شاهی کەرەم نوما
دێنێتە پێشەوە کە دەکا دەفعی سەد جەفا
شمشێر بەدەست و نێزە بەکەف سەد هەزار هەزار
**
ئەمجا بەپێکەنینەوە زستان وتی: مەلا
تۆ غافلّی لە حالّی من و وەزعی کائینات
بەحری سپی بوخاری ئەنێرێتە سەر ولات
عیلمت نییە بەحالّەتی ئەرز و هەموو سەما
**
هەستام کە بچمە خزمەتی بەحری سپی وتی:
دانیشە لێرە ئەم سەفەرەت هەر نەدامەتە
ئەم وەزعی حالّە موددەی تاکو قیامەتە
بۆچی ئەکەویە ڕێگە وەکو شێتی سەر پەتی
**
بەحریش ئەلّێ: لە ڕۆژەوە پەیدا ئەبێ بوخار
ڕۆژیش جەوابی وایە موئەثیر کە خالیقە

تەقسیمی ڕزقی عالەم ئەکا چونکە ڕازیقە
خاڵی نییە لە حیکمەتێ زستانە یا بەهار

**

ئەمڕۆ بەبەفر و تەرزە ئەتۆی خستە زەمهەریر
هاوین کە هاتە پێشەوە بەفراو ئەخاتە دەشت
ئەم دەشتە وشکە گەرمە ئەبێتە سەرای بەهەشت
کاروون و دیجلە دێتە وجوود بۆ غەنی و فەقیر

**

ئەم جارە شیعری جوانی (ضیا)م هاتەوە خەیاڵ*
ئەیخوێنمەوە هەمیشە وەکو زیکری ئەهلی حاڵ
«سبحان من تَحـيَّر في صنعه العقول»
«سبحان من بقدرته يعجز الفحول»

..........................................................

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ٥٨-٦٠ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە هەروەها لە لاپەڕە ٤٠-٤٣ی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی لەمەڕ مامۆستا (ڕەفیق حیلمی)شدا چاپ کراوە.

(١) ماڵطە: دوورگە و دەوڵەتێکە کەوتۆتە نێوان صەقەلیە و لیبیا، پایتەختەکەی (لاڤالیت)ە.ساڵی ١٩٦٤ سەربەخۆیی وەرگرت.

(٢) زوموستان: زستان.

(٣) کەبک: کەو. هەزار: بولبول.

* ئەم شیعرە عەرەبییە هی ضیا پاشای تورکە مامۆستا ڕەفیق حیلمی بەگ لە شیعر و ئەدەبیاتی کوردیدا بەهی خەییامی لە قەڵەم داوە. (ن.م).

## خەرقەییێکم هەیە*

خەرقەییێکم هەیە ڕەفیقی سەفەر
ماوتی خاصی شاری «مانچستەر»
خزمەت و مییننەتی ئەوەند زۆرە
نادرێ شەرحی ئەو بەسەد دەفتەر
باخصووص لەم زەمانی هیجرەتەدا
شەو لەجێی لێفە، ڕۆژ لەجێی بیستەر
جاربەجار موتتەکا و سەرتی منە
ڕاکشێم گەر لە کێو و دەشت و دەر



ڕوو لە مەجلیس بکەم عەبای شانە
وەختی باران و بەفر ئەبی بەسوپەر
وەختی نوێژ ڕای ئەخەم وەکو بەرماڵ
مەوریدی ویردی حەزرەتی داوەر
ڕۆژێ لێم هاتە حیددەت و شیددەت
وتی ئەی بێ خەبەر لە نەفع زەرەر
من کە بدڕێم ئەتۆ موعەططەل ئەبی
غافڵی تۆ لە حاڵی خۆت یەکسەر
چاری بەرماڵی نوێژ بکە بۆ خۆت
تا خەلاص بم منیش لە ڕەنج و کەدەر
وتم ئەی یاری هەمدەم و جانی
خۆت ئەزانی کە نیمە سیم و زەڕ
کەس بەخۆڕایی شت بەکەس نادا
باخصووص بۆ غەریبی خانە بەدەر
وتی تۆ شاعیری بەشوهرەتی، خەڵک
وەکو بیستوومە پێت ئەڵێن زێوەر
یەک قەصیدە بنووسە بۆ زاتێ
خواستی بەرماڵ بکە بەنەظمی دورەر
وتم: ئەی خەرقە کۆنی هەرجایێ
ئابڕووی من ئەبەی وەکو سواڵکەر
بەڵکو نووسیم و مایەوە بێ جواب
ئەو عەزابە خراپترە لە سەقەر
من نە ئەهلی (توقع)م نە طەڵەب
نوێژە نایکەم هەتا نەکەومەوە حەضەر
وتی: من پێن ئەڵێم بنووسییە کۆی[1]
جوابی خۆش وەرگری بەفەتح و ظەفەر
وەک دەڵێن: ئاغەیانی (دێووکری)
هەموو ئەربابی جوود و فەضڵ و هونەر
گەر بنووسی قەصیدەیێ بۆیان
مەقصەدی تۆ ڕەوا ئەبێ بەنەظەر

وتم: ئەو ئاغەیانە نامناسن
پێم دەڵێن سائیلێکە بێ سەروبەر
وتی: ئاغای (قەڕاڵی) چۆنن لات
هەموو دیندارن و عیبادەت وەر
وتم: ئاغای قەڕاڵی دەروێشن
شێخ شوناسن لەگەڵ مەلان بەکەدەر
وتی: شێخ لە (کۆکە) زۆر کۆکە
صاحێبی موڵک و ماڵ و بزن و مەڕ
وتم: ئەو شێخە چونکە نامناسێ
ڕەنگە ئەصڵا نەکاتە نامە نەظەر
وتی: ئیلخانی حاجییە و سەردار
صاحێبی نام و شان و شەوکەت و فەڕ
ئەرشەدی خانەدانی کوردستان
ئەنجەبی طائیفەی هونەرپەروەر
لەو طەلەب کە مەچۆرە لای هەرکەس
باغی فیکرت لەوانە دێتە ثەمەر
وتم: ئەی هەرزەگۆیی هەر جایی
ئەی حەماقەت مەئابی بێ سەروبەر
زاتی وا ڕەخش بەخشە صاحێبی خوان
(فەضل) و (یەحیا) لە قاپی یا نۆکەر
زۆر لەلام نەنگە لەو طەلەب کەم، کەم
ئەغلەبی خوارە سەطری بێ میسطەر
وتی: ئەی حاجی بابەشێخ چۆنە؟
سەید و عالم و کەریم سییەر
دەفعەیێ بۆ زیارەتی کە نەچووم
چۆن بنووسم بکەومە باس و خەبەر
وتی: ئەی ئاغەیانی دەوری سەقز
صاحێبی طەبعن و هونەر گوستەر
ماڵی ئەو تاقمە وتم وەقفە
بۆ غیاث و شەریف شەهد و شەکەر



ناوی بەرماڵ لەلای ئەوان بێنم
پێم ئەڵێن: شێت بووە لە هەوڵی خەتەر
وتی: ئایا ئەمیر (تومان) چۆنە؟
وتم: ئەی حیلەبازی ئەفسوونگەر
دەوڵەتی ئەو کچە، کچیش بۆ من
زۆر مەحاڵە غەریبم و بێ پەڕ
وتی: زاتێ هەیە خووجەستە صیفات
ئاسمان پایە و بلەند ئەختەر
کامی هەرکەس ڕەوا ئەبێ لای ئەو
نووری (زەنبیل) و سەید و سەروەر
مونکیری جاه و پایەی شەڕەفی
هەروەکو عەوعەوی سەگە بەقەمەر
صوبحی گوڵشەن صەفای فەسڵی بەهار
یا هەناسەی نەسیمی وەختی سەحەر
هەروەکو خوڵقی ئەو فەرەح بەخشە
هەروەکو فیکری ئەو عەبیر ئاوەر
مەرکەزی دائیرەی فەضائیل و جوود
لە سەمای عیلم و حیلمدا میحوەر
بابی ئەو مەلجەئی خەواص و عەوام
بۆ فەقیران و بێ نەوایە پەدەر
کۆهی حیلم و تەحەممول و تاقەت
ڕەونەقی بەحری فەضلە وەک گەوهەر
خضری ڕاهی مەردی گوم گەشتە
سەددی ڕێی زوڵم ئەکا وەک ئەسکەندەر
نەجلی پاکی بەتوول و شێری خووا
زوهدی بۆ (بەکرییە)و بەوەرعی (عومەر)
کە ئەمانەم لە خەرقە بیست فەورەن
وتم: ئەی ئافەرین ڕەفیقی سەفەر
هیممەتی سەیدە کە هاتیە قسە
لە کەراماتا بووی بە دانشوەر

بەشی من هیچ نەمـــــایەوە ئیللا
کــە دوعــای بۆ بکەم بەســۆزی جگەر
سـەییـدا گـوێ نەدەیتـە خـواهیـشـی ئەو
مـــەطڵـــەبی من دروست بکە بەنەظەر
من بەبەرمـــاڵی خـــۆم بگەم بەســـمـــە
هیـــمـــمـــەتی تۆم ئەوێ وەکــو ڕەهبـــەر
من نە دەروێشم و نەپیـــــر و مـــــرید
ڕەنگە نوێژیش نەکەم لە وەختی سەفەر
تەوصـــیـــیـــەی تۆم ئەوێ لە ڕێگەوبان
بۆ ســواریش ئەگــەر ببێ یەک کــەرا!؟

شایانی باسە سەید عەبدولحەکیمی زەنبیل بەم چەند دێرە جوابی مامۆستا زێوەری داوەتەوە. ئەمەش دەقەکەیەتی لە کەشکۆڵی (أ)وە ڕاگوێزی دەکەین:

ئەی عـــەزیز و ڕەفـــیـــقی دانشـــوەر
نیـــیـە خـۆشـتـر لە شـیـعـری تۆ زێوەر
من کە خەجڵەت ئەبم لە عەرزی جەواب
هەیە ئومێـــد لە تۆ بەســـەرفی نەظەر
خـەرقـەییێکت هەیە ڕەفـیـقی شـەفـیق
خـەرقـە بۆ تۆ وجـوودی ئەو یەکـســەر
ئەو لە بەرمـــاڵەکـــەت جگەرســـۆزتر
کـــە لە بەرمـــاڵ دوعـــا ئەکـــا بەئەثەر
چۆن نەگـرمـە گـوێی نەصـیـحـەتی ئەو
هەیە گـــوفـــتـــاری زێدە وەک گـــەوهەر
خـــەرقـــە هەرچی ئەڵێ لە گـــوێ بگرە
بانوێژیش نەکـەی لە وەخـــتی ســـەفـــەر
زووە بۆ ڕۆییـنت مـــەکـــە تەعـــجـــیل
بەفـــر زۆرە بەئێـــمـــە گـــەییـــوە خـــەبەر
وەخـــــتی ڕۆیین خـــــەبەر بدە خـــــادم
کـــەشـــفی ڕێگات بکا لەهەر کـــیـــشـــوەر
ڕۆح ئەنێـــــــرم لە بەدرەقـــــــەی تـــۆدا
لاکین ئینصـاف نیـیـە قـوبـووڵی خـەتەر



مـوئمـینان و سـەعـید و قـۆچ و ڕەشـید
بە حـــەکـــەم دابنێن لە ئەهلی هونەر
من ســـەلامم هەیە لە خـــزمـــەتیـــان
بیگەیێنە بەعـــەشـــقی پیـــر و پدەر
خـــەرقـــەکـــەی مـــاوتە ئومـــێـــد وایە
بەصـــەفـــای دڵ دوعـــا بکا بێ شک مـــەر

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ٢١٨-٢٢١ی کەشکۆڵی (أ) و لاپەڕە ١٩-٢٣ی کەشکۆڵی (ب) نووسراوەتەوە لە گۆڤاری بەیان، ژمارە ١٣٧، لاپەڕە ٢٢-٢٣دا بڵاوکراوەتەوە هەروەها لە ڕۆژنامەی ژینی ژمارە ١٣٤٧دا بەشێکی لێ بڵاوبۆتەوە.

موناسەبە و هۆی وتنی ئەم شیعرە وەکو نەجمەدین مەلا لە پەراوێزی کەشکۆڵی (أ)دا نووسیویەتی و دەڵێ: ساڵی ١٩١٩ی ز چونکە مامۆستا زێوەر هاوکاری شۆڕشی شێخ مەحموود بوو دوای ئەوەی شێخ مەحموود لە دەربەندی بازیان بەدیل گیرا زێوەر هەڵات چووە کوردستانی خۆرهەڵات لە گوندی زەنبیل لای سەید عەبدولحەکیم ماوەیێک مایەوە ئەمجار لەم هەڵبەستەدا خواستی بەرماڵێکی نوێژ ئەکا لە سەید عەبدولحەکیم وەیان بیگەیینێتەوە بەرماڵی خۆی.

دەربارەی ژینامەی سەید عەبدولحەکیمیش، نەجمەدین مەلا لە ڕۆژنامەی ژینی ژمارە ١٣٤٧ نووسیویەتی دەڵێ: سەید عەبدولحەکیم کوڕی سەید عەبدولڕەحیمی حافظە، ساڵی ١٢٩٢ی کۆچی ١٨٧٥ز لە کوردستانی خۆرهەڵات لە گوندی زەنبیل هاتۆتە دنیاوە خوێندنی لای زاناکانی سابڵاخ، مهاباد لە قوتابخانەی مزگەوتی سوور تەواو کردووە ناوبراو بەکوردی و فارسی و عەرەبی شیعری وتووە لە هونەری شیعردا دەست درێژ بووە ساڵی ١٣٥٧ی ک ١٩٣٨ی ز لە گوندی زەنبیل کۆچی دوایی کردووە. هەر کەسێ دەیەوێ زیاتر لە مەبەستی ئەم شیعرە حاڵی ببێ با سەیری لاپەڕە ١٨٩ی «گەنجینەی مەردان و یاداشتی ڕۆژانی دەربەدەری» نووسینی مامۆستا زێوەر خۆی بکا.

(١) کۆی: وشەیەکی فارسییە بەمانای جێگەی هانا بۆ بردن.

## عەرەق ناخۆم*

عـەرەق ناخۆم کە تووشی دەردی سەر بم
گـــرفـــتـــاری هەزار دەرد و خـــەتەر بم
هەچی خـوا حـەز نەکـا ئەیکەم بەسـڕی
ئیـــتـــر بۆ شـەرمـەزاری ناو بەشـەر بم
عەرەق ناخۆم کە عومرم کورت و کەم بێ
بەجـــوانی بۆ گـــرفـــتـــاری زەرەر بم
عـــەرەق ناخـــۆم کـــە دووچاری وەرەم بم
هیـلاکی خـەسـتـەگی قـەلب و جگەر بم
عـەرەق ناخـۆم کـە «مـقطوع النسل» بم
حـــەزم وایە کـــە بابی ســـەد پســـەر بم





عـەرەق ناخـۆم کـە بێ هۆش و خـیـرەد بم
لە حـاڵی دۆست و دوژمـن بێ خـەبەر بم
عــەرەق ناخــۆم لە قــاقــا و پێکەنینم
بەجـارێ مـەسـخـەرەی ئەهلی نەظەر بم
عــەرەق ناخــۆم ئەڵێن: «داء الکئول»ە
لە حـەشـریشـا بەرەنگاری سـەقـەر بم
عـــــەرەق ناخـــــۆم بەدینار و بەدرهەم
نەتیـجـەش عـەینی کـەر تابیع بەزەڕ بم
ئەگـــەر فـــەزڵ و هونەر لەم کـــارەدایە
لە خـوا خـواسـتـم وەهایە بێ خـەبەر بم
نە خـــەییـــامم نە قـــائانیی درۆزن
لەبەر چاکـیم نییـە گـەر لێی حـەذەر بم
لە بـۆن و بـۆگـــەنی بێـــزارە تەبعم
فـیـدای ئەمری خـوداو و پێغـەمبـەر بم

.................................................................

* مامۆستا زێوەری شاعیر لەم شیعرەیدا بەئاشکرا دژی شەراب و عارەق خواردنەوە وەستاوە و هەستی ئایینی و خواپەرستێتی خۆی دەربڕیوە و عەرەقی کردووە بەبنەمای ئەم هەموو نەخۆشی و دەردی سەریانەی کە لە شیعرەکەدا ڕیزی کردوون.

ئەم شـیـعـرە لە ڕۆژنامـەی ژینی ژمـارە ٥٧٤ی ٢٠ی تەمموزی ١٩٣٩ی ز.دا بڵاوکـراوەتەوە لە لاپەڕە ٢٦-٢٧ی سـۆزی نیشتمانیشدا چاپ کراوە.

خیرەد: عەقڵ و هۆش.

مەسخەرە: گاڵتە پێکراو و شوێنی قەشمەری.

نەظەر: نظر: عەقڵ و دانش.

داء الکئول: نەخۆشیی ئیدمان و توانای دەست لێ هەڵگرتن نەمان. شایانی باسە کە (بێکەسی شاعیر) بەقەصیدەیەک جوابی ئەم شیعرەی مامۆستا زێوەری داوەتەوە.

عارەق ئەخۆم*

بێکەس ١٩٤٣

من عـــارەق ئەخـۆم کـە بێ کـەدەر بم
کـەمێ لە دنیـای دوون بێ خـەبەر بم
گـەلێ سـزام دی لە ڕووی عـەقـڵـەوە
بادەی مـەی بخـۆم بێ هۆش و کـەر بم
عــافـێـتی تۆ بێ بامێ و قـوبووڵی
با مـن بەعـــــارەق تـووشی زەرەر بم





بەهەشت کـە پڕبێ لە وشکە سـۆفی
ئاواتەخـــوازم هەر لە سـەقـــەر بم
نامـــەوێ بەرگی ڕیا و زاهیـــدی
ئەگەر بەو بەرگەش زۆر موعـتـەبەر بم
کـورسـیی مـەیخـانەم لەلا خـۆشـتـرە
لەوەی کـە لەسـەر تەختی قـەیسـەر بم
ســـاقی دەخـــیلە بمدەرێ جـــامێ
با لـە عـــالـەمی مـــادە بەدەر بم
ڕزگـــــارم ببێ لـە چـەنـد و چوونـی
مـوددەتێ بۆ خـۆم بێ دەردی سـەر بم

* لاپەڕە ١٣٨ دیوانی بێکەس چاپی دووەم - کتێبخانەی (الطلیعة) کەرکووک.

## خۆڵ بارانی سلێمانی*

ئەی فـــەلەک گـــاهێ بەتەرزە بەردە بارانمان ئەکـــەی
گـــا ، بەبارانێکی زۆر مـەعـــرووضی تۆفـــانمان ئەکـەی
دەستی خۆمان بۆچ شکاوە، خۆڵ لەسەر عەردی نەما ،
خـــۆڵ بەســـەرمـــانا ئەڕێژی؟ خـــانە وێرانمان ئەکـــەی؟
بەفـرەکـەت جـوان و سـپی بوو تێکەڵاوت کـرد بەخـۆڵ
کـــەیفی خـــۆتە هەر چلۆنێ مـــەیلی فـــەوتانمان ئەکـــەی
گـــەر خـــەیاڵی پێکەنینی بێ بەدڵدا دەفـــعـــەیێک
دەســتـبــەجێ کـاری ئەکـەی دووچاری گـریانمان ئەکـەی
گەر قەناعەت کەین بەنانێ ڕوو لە ماڵی کەس نەکەین
تووشی سـەد قـۆرتی وەکـو تێـڵان و لێـدانمان ئەکـەی
گـەر مـەعـاشـمـان زەم کـرێ یا ، مـایە تۆزێ زیاد بکا
موبتەلای شورب و قـومار و فیسق و سەیرانمان ئەکەی
گـەه بەدەست بادی شـەمـاڵ و گـەه بەدەم بادی سـەمـووم
تووشی سەرمـای زەمهـەریر و سۆزی نیـرانمان ئەکەی(١)
ئێـمـە چین بۆچی لە سـایەی تۆ حـەرامـە ڕاحـەتی؟
تۆ لەلات چاکە لە خـۆشی و چاکە حـیـرمـانمان ئەکـەی
ئەی فـەلەک باکـمـان نییـە لوطفی خـوامـان (کـافی)یە
حەپس ئەکەی؟ یا نەفی ئەکەی، یا تیرە بارانمان ئەکەی؟

.................................................................

* مامۆستا زێوەر ئەم شیعرەی ساڵی ١٩٣٣ی زایینی بەبۆنەی بارینی بەفرێک کە دوایی خۆڵی بەسەردا باریوە وتوویەتی و لە ل٣٩-٤٠ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە، شایانی باسە کە حەمدی صاحێبقرانیش بەبۆنەی لافاوەکەی ساڵی ١٩٣٢ی ز

که زیانێکی زۆری لە شاری سلێمانی داوە شیعرێکی زۆر بەسۆزی گوتووە تێیدا دەڵێ:

بۆ مەضەڕڕەت هەر تەنەززوولتان کە فەرموو بۆ زەمین
عادەتت وایە کە کوردستان بکەیتە مەرحــەلە... هتد

(١) زەمهەریر: شوێنێکە لە دۆزەخدا ئێجگار ساردە پلەی سەرمای لە ئاستی پلەی گەرمای ئاگرەکەی دایە. نیران: کۆی نارە، واتە: ئاگر.

## ئابووری*

١٩٢١م

مــامــە هۆمــەر ســەد شــوکــر تۆ قــووەت و چاوت هەیە
هەر لە دێیـــەک چەن ڕەز و عـــەرد و بەراویشت هەیە
تووتنەکەت قیـمـەت نەکا سـەد ئیـشی تر بۆت قـابیلە
دێبـــەرت زەرعی پەمـــۆ کـــەی ئاوەڕیس چاوت هەیە
تووتنەکەت قیمەت نەکا مـازوو گەزۆ، پێستە و خوری
شـاڵی زۆر جـوان و نەجـیـبی دەشـتی خـۆشناوت هەیە
قـۆڵ لە پەسـتەک هەڵبکێشە و بچـۆرە کـێوی بۆ شکار
بۆ تیـجـارەت وەک دەڵەک، وەک ڕێوی سـەگلاوت هەیە
خـەڵکی گـوندی ڕۆخی زێی بـادین و کـوێ وانێـک بیـە
تۆش فەقەت زۆر گۆشتی ماسێ پێستی سەگلاوت هەیە
شـازدە کـوندەی قـۆڕ و پێنج سـەد بەرچنار بوو بەکـەڵەک
هەر بە(با) ئەڕواتە بەغـــدا چونکە تۆش ئاوت هەیە
مـــەسـرەفت گــەر زۆرە چا لێ مــەنێ بۆ دەعـــیـــە
باسـوق و سنجـووق و گـوێز و مـێـوژە خـۆلاوت هەیە
هەرچی مـیـوەی ناو بەهەشـتـە تۆ لە بەردەسـتـا هەیە
کـــاڵەک و هەرمێ و بەهێ هەنجـــیــری ڕێژاوت هەیە
عـــادەت و چاولێکەری وا چای بەحـــورمـــەت کـــردووە
فــەزڵەیە بیـــخـــۆیتـــەوە دۆشـــاو و خـــۆشـــاوت هەیە
قـــۆندەرە و پۆتین نەبێ کـەوشی سـولەیمانی و کـلاش
وەخـتی بەفـریش کـاڵەیی گـازەرد و پێـتـاوت هەیە
تووتنەکـەت قـیـمـەت بکا ئەو پارە بەس بۆ تۆ نیـیـە
قـەرزی کـوتاڵ و شـەکـر، تۆش ڕەنجی ناو ئاوت هەیە





بەو سـەر و پێـچـە زلە و پشـتـێنە هەشـتـا زەرعـیـیـە
بەو کـلـۆنجـە مـەخـمـەرە لۆچی ئەتۆیش ناوت هەیە

* ئەم شیـعـرە بەو ناوونیـشانەی سـەرەوە لە ل٢١-٢٢ی سـۆزی نیـشـتـماندا چاپ کـراوە. لە ژین، ژمـارە ١٢٢٨، سـاڵی ١٩٥٤ی. ز. هەر بەو عـینوانەی سـەرەوە بڵاو کـراوەتەوە وە بەهەڵـە دراوەتە پاڵ خـوالێخـۆشبوو جـەمـال عیـرفـان چونکە شەقەڵی شیعری زێوەر لێرەدا بەئاسانی دیارە، لەوە ئەچێ کاتی خۆی بەهەڵە بەناوی (جەمال عیرفان)ەوە بڵاو کرابێتەوە چونکە جەمال عیرفان هەرگیز شیعری نەوتووە و شاعیریش نەبووە. وە لەو کاتەشدا سانسۆر لەسەر شیعر و نووسینی زێوەر هەبووە لەلایەن ئینگلیزەکانەوە، بۆیە بەناوی خوازراوی جەمال عیرفانەوە بڵاوی کردۆتەوە.

## وەرن یاران*

وەرن یاران! تەمـــاشـــاکـــەن چ ڕەنگین نەو بەهارێکە؟
لە فـەیزی ڕەحـمـەتی بارش هەمـوو جێ سـەبزە زارێکە(١)
شنەی بادی بەهاری ڕەوح بەخش و عـــەتر پەخـــشـــانە
بەگــریە و ناڵە هەوریش عـــاشــقــێکی بێ قـــەرارێکە
چ فـەرڕاشـێکە پەنجـەی قـودرەتی؟ بۆ کـائینات ئەمـڕۆ(٢)
دەر و دەشت و بیـــابان لالەزار و مـــیـــرغـــوزارێکە(٣)
شکا هۆردووی سـەرمـا، هەڵوەشا جـەمـعـیـیـەتی سـۆپا
هەمـوو ڕووی کـردە سـەحـرا هەر مـەسـیـرە تازە شـارێکە
ســـەحـــەرگـــاهان لەناو باخـــا ئەڵێی مـــرواریی باریوە
لە ئـاوونـگـی هەوا هـەر بـن چـنـارێ ســـــەرچـنـارێـکـە
جـــــریوەی تەیری تـازە جـــێگـەیی طەیرەن ئەبابیـلە
لەکن ئەهلی بەصـــیـــرەت ڕوود و عـــود و ســـاز و تارێکە
تەبیــعــەت تەڕ بووە یەکـســەر نەمــاوە ســۆفـیی وشکی
یەکێ پابەندی کـــارێکە، یـەکێ دڵبـــەندی یارێکە
دڵی فـەللاح و جـووتیـار و سـەپان پڕ نەشئـەو و کـەیفـە
دەروون تاریک و ڕووگـرژە ئەوی صـاحـێب عـەمـارێکە
بەدەوری شـارەدا هەر وەک (تەشیـلە) سـووڕێدا جـامبـاز**
گـــولـۆڵەی کـــەوتە لێـــژی نەی ئەزانی تەڕ بەهارێکە
کـەسێ چاوی لە نەفـعی خـۆی و مـەحـوی عـالەمێ ببـڕێ
بەظاهیـــر شکڵی ئینســـانە، بەباطین هار و مـــارێکە

نەمـا حـاجـەت ڕەئیـسی بەلدە ناوێ مـوحـتـەکـیـر بگرێ
بەڵێ مەعـبـوود کە دای، مەحـموود وەکو ئێـمە هەژارێکە***

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١٧١-١٧٢ی کەشکۆڵی (أ) و لاپەڕە ٣٦ی کەشکۆڵی (ب)دا نووسراوەتەوە.
موناسەبەی گوتنی ئەم شیعرەش وەکو نەجمەدین مەلا دەڵێ: «ساڵی ١٩٢١ی ز لە بەهاردا باران نەباریوە، دەغڵودان لەلایەن خەلەفرۆشەکانەوە شاردراوەتەوە و گران کراوە. لە دواییدا بارانێکی خۆش باریوە دەغڵودان هەرزان بووە ئەم بەم هۆیەوە (زێوەر ئەفەندی) ئەم هەڵبەستەی سەرەوەی وتووە.
(١) فەیز: فەیض: خێر و بەرەکەت. بارش: باران. سەبزەزار: سەوزایی شیناوەرد.
(٢) کائینات: بوونەوەر.
(٣) لالە: گوڵێکی جوانە پتر لە شوێنی شێدار و قەراخ ئاودا دەڕوێ بەعەرەبی پێی دەڵێن: (شقائق النعمان) گەلێ جۆری هەیە، هەیەتی سێ پەڕە هەیەتی پێنج پەڕە ماڵیش و کێویشی هەیە، ئەوەی لە کێو دەڕوێ پەلکەکانی سوور و بن پەلکەکانی لەککەیەکی ڕەشی پێوەیە لە هەوەڵی بەهاردا بەسەلک ئەنێژرێ.
** تەشیلە: مەبەستی کابرایەکی خەلە فرۆشە ناوی عەبە تەشیلە بووە.
*** مەحموود مەبەستی مەحموود ئەفەندی کوڕی قادر ئاغایە کە ئەوکاتە ڕەئیسی بەلەدییە بووە.

## نیشانەی مەحەببەت*

نیـشـانەی مـەحـەبـبـەت لە کـەسـدا نەمـاوە
هەچی تووش ئەبی مـەرحـەبایە و سـڵاوە
مەحەببەت لە لێوایە تا مەرکەزی (ح)ی
عـەداوەت لە قـەلب و دڵانا چەقـاوە(١)
چلۆن کـەتمی عـەشق بکەم ئەی پەری ڕوو
بەسەنگی جەفا شیـشـەیی دڵ شکاوە(٢)
بڵـێم ئاسکی ناسکە، ڕاسـتـە فـیکرم
سڵ و وەحشـە، دوژمن بەصـەییـاد و ڕاوە
سـەر و ڕیشـەکـەم بوو بەفـر و، کـەچی دڵ
چ منداڵە بۆنی دەمی شـیــری خـاوە
لە ڕەغـمی زەمانە وەرە ئەی سەمەن بۆ(٣)
بنیـــشین بەنۆشین و بۆســەیش عــەلاوە

* ئەم شیـعـرە لە لاپەڕە ١٨٦-١٨٧ی کـەشکۆڵی (أ) و لاپەڕە ٤٦ی کـەشکۆڵی (ب)دا هەیە لە گـۆڤـاری بەیان، ژمـارەی ١٤٢، لاپەڕە ١٨دا بڵاو کراوەتەوە.
(١) مەرکەزی (ح) قوڕگە مەبەستی ئەوەیە کە خۆشەویستی خەڵکی بۆ یەکتری سەر زارەکییە و لە ناخەوە نییە، دۆست و برادەری ڕاستەقینە یا هەر نییە یان زۆرکەمە. بەڵام دوژمنایەتی و ناحەزی نێوان خەڵک جێگیر و لە ناخەوەیە.





(٢) کەتم: شاردنەوە. سەنگی جەفا: بەردی ستەم و زۆرداری. شیشە: شووشە.
(٣) لە ڕەغمی: بەکوێرایی چاوی. سەمەن بۆ: ئەوەی بۆنی وەک گوڵی سەمەن خۆش بێ.
سەمەن: گوڵێکی شیناییبیە پێی دەگوترێ (مس پەرە) گەڵاکانی زۆرە، گوڵەکەی زەرد و سپی و شینە دەشگونجێ و شکە لە بنەڕەتا (سیمین) بووبێ واتە بالا سپی وەک زیو.

## دیاری*

کــەسێ چاک بێ کــرداری
لێی قــبـــووڵ بکە دیاری
ئەوەی کـــەوا بەد فـــیکرە
قـەت دیاری لێ وەرمـەگـرە
هەیە نـانێ ئـەبەخـــــشێ
خـۆی پێـوە هەڵ ئەکـێـشی
بـــەبـــار مـــنـــەت دادەنـــێ
بەخـشێ حـوقـقـە هەرزنێ
تۆیش بەخشینی چاکت بێ
دەســت و دڵـی پـاکـت بـێ
مـــەبە دیاری بۆ کـــەسێ
دڵت کـــە لێی بتـــرسێ
دیاری بۆ مـــەحـــەببـــەتە
بۆ دۆســتــیی و ئـولفــەتە
دیاری مـــەکـــە بەبەرتیل
بێ حـورمـەت ئەبی و زەلیل

* ئەم هەڵبەستە لە لاپەڕە ١ی دەستنووسی شاعیر وەگیراوە. لە لاپەڕە ٩٦ی سۆزی نیشتمان و لاپەڕە ١٣ی دەستە گوڵی لاواندا چاپ کراوە.

## پەند و ئامۆژگاری

خـۆت سـووک بەغـائیلەیی سـەد مـەرامـەوە
تا مـــاوی ڕابوێرە بە نامـــووس و نامـــەوە
خۆت ڕۆستەمی زەمانە بەخۆت حاتەمی جیهان
فـەخـرت نەبێ بەباب و بەخـاڵ و بەمـامـەوە(١)
مـــەوزووعی ئەهلی فـــیکرەتە پەروانە و چرا
پەروانە و چرا چووە ناو فـــیکری خـــامـــەوە

تۆ خوا لە ڕەغمی زاهید و سۆفی بڵێن: کە بێت
موطریب بەتار و عوودەوە، ساقی بەجامەوە
ئەم وت: لە داخی دەهر ئەچمە کونجی عابیدان
زانیم: تەمەڵ عەدوویی خوا بوون گەرامەوە
بازاڕ ئەنێیتە کوڵ و لە مەسجید ئەکەی دوعا
دین زۆر موقەددەسە، بەوە نایێتە دامەوە
گاهێ لە ڕۆشنایی و گاهێ لە تیرەگی
گەردوون میشالی تۆیە بەسوبح و بەشامەوە
ئەم بەیتە چەندە خۆش بوو لەلام یاری نازەنین
ئەیخوێندەوە بە لەهجەیی پڕ ئیحتیرامەوە

ئەم شیعرە ساڵی ١٩٢٤ی زایینی بەبۆنەی ڕووداوێکەوە گوتراوە، ڕووداوەکەش ئەوە بوو کە پیاوێکی نوێژکەر و سۆفی لە ڕۆژێکا بازاڕی سلێمانی بۆمباران کراوە، ئیتر بووە بەهەرا و هۆریا و خەڵک ڕای کردووە ئەویش لەوکاتەدا فەردەیەک کووتاڵی دزیوە لە ماڵی خۆیا شاردوویەتیەوە تاپۆلیس چوون لێیان سەندۆتەوە (ن.م) بەدەست لێدانەوە. (سۆزی نیشتمان لاپەڕە ٢٠-٢١).

..........................................................

(١) زێوەر لێرەدا ئەوە ئەسەلمێنێ کە نازناوی زێوەر لەقەبی شیعری تایبەتی خۆیەتی و لە کەسەوە بۆی نەماوەتەوە.

## گاڵتە و قەشمەری*

ڕووی کردە کار گاهی تەڕەقیی وڵاتەکە
یەعنی وڵاتی کوردە بەبێ دەستەڵاتەکە
تەدریسی عیلمی فەلسەفەیە، فەننی تازەیە
وەحشەت لە شارەوە گەییە قاتە قاتەکە
جاران کە سوخمەیێکی نە ئەردوو و بەهەفتەیێ
ماکینە دەستە. ئێستەکە، وەستا خەیاتەکە
ئەربابی عیلم و دانش ئەوەند زۆر بووە بەناو
لایان خەیاڵی باتیلە پردی سیراتەکە[1]
کەوش و کڵاش و کاڵەو و پێتاو فڕێ درا
کەوشی فەرەنسە ڕەونەقی خستە وڵاتەکە
جاران کە عەشقی جینسی لەتیف باوی سەندبوو
ئێستاکە نووری مەجلیسە بەزمی لیواتەکە[2]



سەیری کە چۆن تەریقی تەڕەقی کرایەوە[3]
ئاڵا فەرەنگەیە حەرەکاتی سەعاتەکە
ڕێوی نەبێ کە ترسی لە ڕاوکەر هەیە کەمێ
کەس خەونی لانە ماوە موحیتە نیشاتەکە[4]
دین بوو کە سەددی ڕێگەی ئەم ئەهلە وەحشە بوو
کەس سواری نابێ کەوتووە وەک لاکە لاتەکە
چاخانەیە، سنووقە، مەقاماتی تازەیە[5]
دێرێکی کۆنە مەسجید و صەوم و صەلاتەکە[6]
لایان وەهایە دوژمنی دین بن، تەڕەقییە
نایانەوێ نزیکی خوابێ، حەیاتەکە
شەو کەیفە، عەیشە، عوشرەتە فیکری تەمەددونە
ڕێگای سەعادەتی ئەوە، دێ، بۆ حەیاتەکە

..........................................................

* زێوەر ئەم شیعرە گاڵتە ئامێزەی بەبۆنەی گۆڕانکارییەکی کۆمەڵایەتی بەڕواڵەت پێشکەوتن کە بەسەر وڵاتدا هاتووە و خەڵکی تۆزێک -بەتایبەت گەنج و تازە پێگەیشتوو- لە ئایین دوورکەوتونەوە ساڵی ١٩٢٨ی ز گوتووە لە سۆزی نیشتماندا لاپەڕە ٨٠-٨١ چاپ کراوە.

(١) باتیلە: باطلە: بۆش، پڕوپووچ، پردی سیراتە: پردی صراط.

(٢) لیواتە = لواطە: نێربازی (نەجمەدین مەلا دەڵێ: ئەم نیوەشیعرە هی فایق زێوەرە؛ کوڕی شاعیر.

(٣) تەریق: طریق: ڕێگا

(٤) موصیت = موصیط، نیشات = نشاط واتە کەسێک ترسی لا نییە، چوست و چالاکی وڵاتی داگرتووە.

(٥) سنوق: مەبەستی سندووقی گرام فۆنە کە جاران گۆرانی لەسەر تەسجیل کراوە.

(٦) دێر: پەرستگای مەسیحییەکان. کە ڕاهیبی تێدا دەژی.

## ئامۆژگاری*

تۆ کە سادەی عەرەق مەخۆ ڕۆڵە
هاو پیاڵەت مونافیق و زۆڵە
هێزی قاچت نییە هەتا ڕاکەی
دەستەکانیش لە بۆ دیفاع کۆڵە
لووس کە عارەق بخواتەوە بێ شک
هەروەکو دێڵە ئارەزووی گۆڵە
کاکە تۆیش گەر بەجاهێڵی فێربووی[1]
یا کەری، یاخۆ پارەکەت مۆڵە





مامە تۆیش ڕیشەکەت سپی تێکەوت
لازمە بچیە تەکیەکەی سۆڵە
باوەڕێکتان ببێ بەشەرع و حەدیث
خوا ئەسێنێ لە موجریمان تۆڵە
هەرچی ئیشێ بکەی غەیب نابێ
وا مەزانە کە سەر زەمین چۆڵە

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١٠٤-١٠٥ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.

(١) جاهێڵی: نەفامی یان جاهێڵی: گەنجی لاون

## دیسان پەند و ئامۆژگاری*

خێر و صەدەقە بکە بەفەقیر(١)
ئەمما فەقیرێ سەقەت بێ یا پیر
طەلەبەی علووم حەفەظەی قورئان
هەموو قابیلن بەخێر و ئیحسان(٢)
دەروێشی عیفریت زەلامی ملهووڕ
کە پێیان ئەڵێن: دەروێشی کەڵهووڕ
خێریان پێ مەکە ئەوانە ساغن
خاوەنی ماڵن زۆر بەدەماغن
لە پەنای سواڵا نەرم و سەرکزن
لە حەقیقەتدا ئەغڵەبیان دزن
موعاوەنەتی شەخصی بێ چارە
زەڕڕە بەزەڕڕە لای خوا دیارە
کەسێ بەکاربێ یا هەشت نۆ ساڵ بێ(٣)
خێری پێ مەکە نەک فێری سواڵ بێ
تەمەڵی مەکە بەو زیو و زەڕە
کەسێکە عوضوی جەمعی بەشەرە

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ٤١-٤٢ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە لە لاپەڕە ٢٢ی دەستنووسی شاعیریشدا هەیە. کاتی خۆی لە ڕۆژنامەی (ژیان)ی ژمارە ٤٠٧ی ساڵی ١٩٣٤ی ز لەگەڵ پەخشانێکدا بەبێ ئەوەی ناوی زێوەری لەسەربێ بڵاوکراوەتەوە.





(١) بکە (ژیان)، بدە سۆزی نیشتمان و دەستنووس.

(٢) قابیلن (ژیان)، لایقن سۆزی نیشتمان ئەم دێرە شیعرە لە دەستنووسی شاعیردا نییە.

(٣) با هەشت نۆ ساڵ بێ ژیان بام هەشت نۆ ساڵی بێ سۆزی نیشتمان و دەستنووسی شاعیر.

## پەند و ئامۆژگاری*

زەمانە هەر کەسی هێنایە مەیدان
ئیطاعەی فەرزە لای قەولی حەکیمان
مەڵێ: من فاضیلم ئەو بێ کەماڵە
مەڵێ: من ئیختیارم ئەو مناڵە
مەڵێ: من دەوڵەمەندم ئەو فەقیرە
مەڵێ: ئەو هیچە من باوکم ئەمیرە
خەیاڵ و فکری بێ مەعنان ئەمانە
بڵێی من عالمم ئەو هیچ نەزانە
هەچی فەضڵێ کە تۆ ئەیکەی بەحوجەت
ڕەزا بە بەو بەشە بێ دەرد و میحنەت
ڕەئیسی میللەتێکی خاوەن ئۆردوو
کەس نازانێ باوکی گاورە یا جوو؟
هونەر ئەمڕۆ بەسەعیی و عیلم و دینە
حەسادەت کاری شەیتانی لەعینە

* ئەم شیعرە بەو ناوونیشانەی سەرەوە لە لاپەڕە ٤٠-٤١ی سۆزی نیشتمان دا چاپ کراوە.

## پەند و ئامۆژگاری*

یەک عەیبی خەڵک ئەبینی خۆت صاحێبی هەزاری
خەڵکت لەلا خەرارە خۆیشت و وەکو دەواری
ظاهیر فەقیر و سالم بەڕەنگ و بەرگی عالم
ئەمما لە ناو دەروونا مارێکی زەهرداری
چۆن پێت بڵێم: موسوڵمان؟ یا فەردی نەوعی ئینسان
دووری لە خێر و ئیحسان مەستی مەی و قوماری
دەستت لە صنعەتا بێ ناوت لە حورمەتایە
قەلبت لە غەفڵەتا بێ قەڵب و زەلیل و خواری

* ئەم شیعرە لە ل٣١-٣٢ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.

## ئەی عالمانی حەق بین

ئەی عـــالمانی حـــەق بین تەدریس بکەن بەبێ کین
لادەن لـە تـەعن و تـەلعین لادەن لـە وردەکـــــاریی(١)
ڕێی دین گوشادە دەروێش، بەمن چی بوویتە بەنگ کێش
بنوارە مــورشـــیـــدی پێش مــەنوارە بەنگ و مــاری
هەتا بلّــێن خــەتای کــرد شــێــخی ڕەضی یو طووسی
هەروەک قەدیم بەسیی ساڵ ناگەیتە (قاضی لاریی)(٢)
ئەی تاجــرانی صـــادیق وەی کـــاســـبـــانی لایق!
ڕەحـــمێ لەگـــەڵ خـــەلایق دە بە دوازدە توجـــاری
هەر مــوشــتــەری کــە دێتــە بەردەم دوکـــانی ئێـــوە
صــابوون مــەدەن لە ژێر پێی، نەشــتــەر لە شـادەمـاری

..........................................................................

(١) تەعن = طەعن: تانە و تەشەرە. تەلعین: لەعنەت کردن. وردەکاریی: قـووڵ کردنەوەی شتی بێ هوودە. زێوەر لەم دێرە شیعرەدا هێرشێکی ڕەوای کردۆتە سەر شێوەی خوێندنی بڕێ مەلا و فەقێی ئەو سەردەمە کە بەحاشیە و پەراوێز هێندێکیان هێندێکیانیان بەر تانە و تەشەر داوە بەڵکو هی وایان هەبووە ناحەزی خۆی بەکافر زانیوە و لەعنەتی لێ کردووە زیاد لەوەش ئەوەندەیان وردەکاری لە شوێنی بێ هوودەدا کردووە ئەوەندە خۆیان بەشتی پێویست نەبووەوە خەریک کردووە بەجۆرێک فەقێی وا هەبووە هەموو تەمەنی خەریکی خوێندنی دوو سێ کتێبی نەحو و صەرفی عارەبی بووە نەشی زانیوە دەڵێ چی، هی وایان هەبووە بەهەزارەها بەڵگە و قونە قەیدی نەحوی لەبەر بووە بەڵام نەیتوانیوە چوار پێنج دێر بەعەرەبیەکی ڕێکوپێک بنووسێ.

(٢) شێخی ڕەضی: رضی الدين الاسترابادی شەرحێکی دوور و درێژی لەسەر شەرحی جامی کردووە کە (جامي = الفوائد العنيائية) بۆ خۆی شەرح و شیکردنەوەی کتێبی (كافية)ی ئیبن و حاجیبە.
طووسی: نصيرالدين الطوسي ١٢٠٠-١٢٧٣ز. خاوەنی کۆمەڵێک کتێبی گرینگە یەکێ لەوانە کتێبی (تجريد الكلام)ە لە عیلمی عەقیدە و خواپەرستی دا.
قاضی لاری: کتێبێکی (مصلح الدين الانصاري) بە شەرح و لێکۆڵینەوەیە لەسەر (شەرحی قاضي مير) کە ئەمیش شەرح و لێکۆڵینەوەیە لەسەر کتێبی (هداية الحكمة)ی (أثيرالدين الأبهري) لە عیلمی مەنطیق دا.

## گرتنی چەخماخسازەکان*

شـایعـە کـەوتە هەمــوو جـێگە و بیــســتم خـەبەرێ
کـە حکوومـەت بەسـزا سنفی تفـەنگ سـاز ئەگـرێ
شــۆڕش و غـــولغـــولە هەســـتـا لە هەمــوو کــۆڵانێ
بووە ئەو ڕۆژە کـە زیرۆح هەمـوو یەک یەک ئەمـرێ(١)
تێکچوو کوورەو دەمـە، لاچوو چەکوش و گیـرە و گاز
کـونجی دووکـانەکـەیان لێ بووە کـونجی سـەقـەرێ



تەسکەڵەو(زەردەمل)و(لوولە)و(چەرخ)و(خشکە)(٢)
کلکە مـــشکە لە کـــونە مـــشک ئەنرا تا نەبرێ
(نەرمەساو) باوی نەما (کلکە شێرە) و (فەڕدۆنی)
(چێوەسان)، (جەڕڕە حەتیتە) بووە داری چەپەرێ(٣)
تاقمی زەبتییـە وەک باز و هەڵۆ سووڕی ئەخوارد(٤)
بۆ دوو (بێـچوو) لە پەناییێک بگرن قوڕبەسەرێ(٥)
زیکەزیک (عەینە مەل)و بوونە (مەلەخ) وەستاکان(٦)
باوکی خـاوەن شـەفـەقـەت ڕووی نە ئەکـردە پسـەرێ
هەورەبان بوو بووە بەست تێی ئەخـزان ورد و پچـووک
سواری کۆڵی یەک ئەبوون وەک مەسەلی سەربەسەرێ
پێ پەتی هاتوو هەڕای کــرد بەبێ کـەوش و کـڵاش
تازە شـاگـردە یەکێ جـووکـەیێ، گـوێچکە کـەرێ
لەنگەری گـــرت لە هەوا بازی ئەدا وەســـتـــاییێک
وتی: ئەســـتـــۆم بشکێ نیـــو نمەکم لێ نەنرێ
تووشی وەسـتـایەکی تر بوون کـە لە گـردی سـەیوان
وتـی دەروێشـم و دەروێش ئـەبێ هـەر مـــــار بگـرێ
کـــوڕی ئازا لە هەمـــوو جـــێگەیێ خـــۆی ئەنوێنێ
ئافـەرین وەسـتـا عـەزیز دەست بەسـیـلاح هاتە دەرێ
خـەنجـەری کـرد بەکـەمـەریا کـە لەسـەر فـیـشـەک لغ
وتی: فـەرقی نیـیـە ئەمـڕۆ چ مـوشـیـر و نەفـەرێ
گـــەرچی دۆســـتی من و ئەربابی شـــەو و ڕۆژی منە
باسی وەسـتـا ڕەشـیـد زۆر خـۆشـە کـە شـەرحی بدرێ
هەر بەچەرمـە ڕەقـەکـەی ڕاسـتـەوە بوو پێـیـان وت:
کـــوڕە دانیـــشـــە مـــەڕۆ نابێ لە بۆ تۆ زەرەرێ
سـەگ و تانجـیی و گـەماڵ و توولە شـوێنی کـەوتن
وەختـە بوو قـوڕ بەسەرە چەرمـەڕەق و خۆی بخـورێ!
ئاشناکـەم لە تەنیـشت حـوجرە فـەقـیـرە، بەسـتـەزمـان
کـاڵەک و نانی ئەخـوارد بیـسـتی لەناکـاو ئەسـەرێ
هێـــزی ئەژنۆیی بڕا هەم حـــەپەســـا هەم ترســـا
لە وجـــوودیا بەقـــەدەر زەڕڕە نەمـــابوو هونەرێ





وتی: ســـا ئێـــوه لە بەرکـــەن جلەکـــانم نەوەکـــو
لێم بســـێنن بەســـزا، جـــەردە، لە شـــار بچـــمە دەرێ
عـــاریان بێ بەخـــوا دائیـــرەی چەخـــمـــاخـــســـاز
لە وڵاتـا ئەتـەقن هەریـەکـــــە بۆ جێ و گـــــوزەرێ

.........................................................................

* مامۆستا نەجمەدین مەلا دەڵێ: لە دەورەی دەوڵەتی عوسمانیدا کۆمەڵێک وەستا لە شاری سلێمانی سەریان دابووە یەک دەستگایان دانابوو کارخانەیان کردبووەوە. تفەنگیان دروست ئەکرد و پێیان ئەوتن: (جەخماخ ساز) حکوومەت ئەمەی پێ ناخۆش بوو، کە تفەنگ زۆر بێ و دەست ئێلاتی کورد بکەوێ کە ڕاو و ڕووتی پێوە بکەن. ئەمجا هات دەستگاکانی لێ داگیر کردن و کارخانەکانی پێ داخستن و دەستی کرد بەگرتنی وەستاکان. زێوەریش ئەم هەڵبەستەی خوارەوەی وت: (سۆزی نیشتمان لاپەڕە ٨٣-٨٥).

(١) زیرۆح: ذی روح: خاوەن گیان، گیانلەبەر.

(٢) ئەو وشانەی لە ناو کەوانەدان ناوی دەستگای چەخماخسازیی ئەو سەردەمەن.

(٣) ئەو وشانەی ناو کەوانەکان ئامێری چەخماخسازی بوون.

(٤) زەبتییە: ضبطیە: پۆلیس و یاساوڵی عوسمانی بوون.

(٥) بێچوو: جۆرە پارەیەکی ئەو سەردەمە بووە.

(٦) عەینەمەل: باڵدارێکی ڕەشە لە چۆلەکە گەورەترە زۆر دژی کوللەیە، کۆمەڵ کۆمەڵ دەژیەن بۆ میوە و بەروبووم زیانی زۆرە، هەر ساڵێک کولله زۆربێ لە شوێنێک دانیشتووانی ئەو شوێنە دەنێرن بۆ ئەو ناوچانەی (عەینەمەل)یان تێدایە ئاوی کانی دەهێنن و بەدەغڵـودانی هەڵ دەپرژێنن لەم ڕووە گوایە عـەینەمـەل بەشوێن ئاوی وڵاتەکەی خۆیدا دێت ئیـتر دەست دەکا بەقەڵاچۆکردنی کوللەی ئەو شوێنەی ئاوەکەی لێ پرژاوە.

## کاربەدەستانی ئیستیبداد*

وەک تیـر لە کـەوان دەرئەپەڕن تاقـمی مـەئمـوور
بۆ قـــاوەو و بۆ چای بەرەو خـــوار و بەرەو ژوور
بۆ لاقـــە مـــریشکێ ئەچنە کـــانیی ئەزمـــڕ(١)
بۆ قـوبڵی ئەڕۆن لێـرە هەتا چەشـمەی ئامـوور(٢)
[یازیق ســـزە ئەی قـــوجـــە حکومت أمناسی
کیم یەسلـەیە جگەر سزی کیمدر سزە مشکور]

.........................................................................

* ئەم پارچە هەڵبەستە لە ل٥٣-٥٤ی سۆزی نیشتـمان وەرگیراوە. زێوەر لێرەدا چاوچنۆکی و بەرتیل خۆری مووچە خۆرانی ڕژێمی سەردەمی پاشایەتی و داگیرکەری عێراقیمان بەگوێدا دەسرپێنێ.

(١) کـانیی ئەزمڕ: سـەرچاوەی ئاوێکی سـارد و سـازگـارە کـەوتـووەتە ئەو دیو دەربەندی کـێـوی ئەزمڕ و بەسـەر شـارباژێڕدا دەڕوانێ.

(٢) چەشمە: سەرچاوە. ئاموور: چەمی ئاموور، ئاموور: ڕووبارێکە کەوتۆتە شیمالی ڕۆژهەڵاتی ئاسیاوە لە نێوان سیبریا و مەنشوریا. چوار هەزار و سێ سەد و حەفتا و حەوت کیلۆمەتر درێژە و دەڕژێتە بەحری ئاخۆ تسکەوە.





## ستایشی ئاسایشی*

حـەمـد و لیللا وا لە دەورەی بانی دێ سـەنگەر نەمـا
ئەشقیا شەق بوو شەقەی پێنج تیر و ماووزەڕ نەما(١)
دائیـمـا شـوکـری حـوکـوومـەت کـەن ئەهالیی سەرچنار
تەشـقـەڵەی کـوردی گـەڕی جـافی زیانی مـەڕ نەمـا
چاکی کـرد بۆ خـۆی مـچیـل مرد و دوکـانی شـاردەوە(٢)
چونکە خـۆبادان و دەست دانانی سـەر خـەنجـەر نەمـا
ڕوو لە هەر جـێـیـەک ئەکـەی بۆ خـۆت بچۆ باکت نەبێ
لووتی لۆتی شۆڕە سەر سمت و کەفەڵ وەروەر نەما(٣)
(با) نەبێ کـەس لێـفـە نافـڕێنێ بنوو بێ غـەم بەشـەو
گـەندەدز لێـــفـــە فـــڕێنی ســـاڵی پێـــشـــووتر نەمـــا
نانتـان بێ غـەم بخـۆن ئەی ئەهلی ڕەحم و مـەرحـەمـەت
تووخـوا و تووبی ڕەسـول پاڕانەوەی سـواڵکەر نەمـا
سـەیری کـۆڵانان بکە ئێـسـتـا کـە چەند پاکـە و تەمـیـز
پیسیی و تۆزی سەرەنگوێلک لە ڕێی مەعبەر نەما(**)
خـواجە فـەندی گـەر دڵی عـاجز نەبێ عـەرزی ئەکـەم(٤)
ڕۆژی دەرسی کـوردییـە تەئریخـەکـەی (نادر) نەمـا(٥)
(صـاحـبـا أمـیـدگـاها دەست بوسم) تێـپـەڕی(٦)
دەرسی کوردیی خۆم ئەخوێنم باوی ئەسکەندەر نەما(٧)

.........................................................................

* وەکو دەڵێن: لە دوای نەمانی شۆڕشی شێخ مەحموودی نەمر ئاژاوە و بێ گەورەیی کەوتبووە ناوشاری سلێمانییەوە، وڵات بێ گەورە و نیظام و ئاسایش بوو دز و پیاوکوژ زۆر بوو بوو و برسێتی و بێ ئیشی باو بوو. ئەگێڕنەوە دز و ئەشقیا بەجۆرێک زۆر بوو بوون شەو بەسەر بانەکانەوە گەڕاون چییان بەردەست کەوتبێ دزیویانە. تەنانەت دەگوترێ جاری وا هەبووە پشتێنی پیاو دز پڕی داوەتێ و سەرێکی بەدەست دزەکەوە بووە و سەرێکیشی بەدەست خاوەنەکەیەوە بووە. ماوەیەک گوریس کێشەکێ و سمڕسمڕێنیان لەگەڵ یەکتریدا کردووە. زۆر کەس کە ئەم ئاشووب و نائاساییەیان بەچاوی خۆیان بینیوە ئێستا لە ژیان دان و دەیگێڕنەوە. ئیتر شیعرەکەی زێوەر ئاماژەیە بۆ ئەو سەردەمە. شایانی باسە کە مامۆستا نەجمەدین مەلا لە پەراوێزی ل٣٠ی سۆزی نیشتماندا شتێکی تری دوور لە واقیعی کردووە بەموناسەبەی ئەم شیعرە بەپێویستی نازانین بینووسینەوە.

(١) ئەشقیا: پیاو خراپ. پێنج تیر و ماوزەڕ: دوو جۆرە تفەنگ بوون.

(٢) مچیل: پیاوێکی شێرگەر بووە لە سلێمانی (ن.م)

(٣) وەروەر: دەمانچە.

(**) مەعبەر: شوێنی پێدا ڕابووردن.

(٤) خواجه ئەفەندی: ناوی عەزیز کوڕی وەسمان ئاغا کوڕی ڕەسوڵ کوڕی حەسەن لە نەوەی عەلی بانوشیرە لە هۆزی گەڵاڵییە ساڵی ١٨٤١ی ز لە سلێمانی هاتۆتە دنیاوە لە ژیاندا زۆر خزمەتی زانستی کردووە و مەدرەسەی تایبەتی کردۆتەوە زۆر خەڵکی تێدا فێری خوێندەواری بووە، ساڵی ١٩٤٢ی ز کۆچی دوایی کردووە.
(٥) مەبەستی کتێبی (تاریخی نادری)یە کە ئەو کاتە خوێندنی باو بووە.
(٦) لە سەردەمی حوکمی عوسمانیدا لە سلێمانی نامە بەفارسی دەنووسرا کوردی باوی نەبوو.
(٧) ئەسکەندەر: مەبەستی نامیلکەی (ئەسکەندەر نامە)یە.

## باسی دونیا(١)

دەقی شیعرەکە لە ڕۆژنامەکەدا، ئەم پێشەکییەی بۆ نووسراوە: ئەم شیعرە لە وەختی خۆیدا لە تەرەف ساحێب ئیمزاوە بۆ دەرج و نەشری تەودیعمان کرابوو. «فقط مع الاسف» تا ئێستا لەبەر زەیقەت مەجال مومکین نەبوو، لێمان ببورن.

ساحێب ئیمزا: واتە ناوی شاعیرەکە (فایەق زێوەر)ە.

بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم شیعرە زیاتر مۆرک و شەقەڵی (زێوەر)ی پێوەیە بەڕاستمان زانی بەناوی خۆی خودی (زێوەر)ەوە بڵاوی بکەینەوە خوێنەری بەڕێزیشی لێ ئاگادار بکەین. ئەمە و چەندین شیعری تری سەردەمی خۆی بەو جۆرە بڵاو کراوەتەوە. دیارە ڕەقابە لەسەر شیعرەکانی زێوەر بووە لەلایەن حاکمی سیاسی ئەو سەردەمەوە.

گەه بەفر و باد و باڕەش و سەختیی و مەرارەتە
گەه گەردەلوول و تۆز و بوخار و حەرارەتە
سەددی تەریقی ویسالی و موحیبانی عالەمە
میحنەت هەمیشە قیسمەتی ئەولادی ئادەمە
دنیا چ ڕەنگە ڕەنگە، گەهی سوورە گەه سپی
باوەڕ نییە بەڕاستی کەوا ڕاستە یا چەپی

**

دەشت بوو بەشاخ و شاخ و تەپە چوونە ئاسمان
حەیوان و تەیری وەحشی پەنای خستە ناومان
لەم بەفرەدا بەسەیر و هەوەس مەیلی ڕاو ئەکەین
هەر شەوێ خەیاڵی گۆشتی سەر پڵاو ئەکەین
هەی هەی چ غافڵین و چ بێ باک و سەرسەرین
حەیوانی کێوی بێ خەبەرە، (قەومی) خۆ خۆرین

**

شاهەنشەهی جبال مەگەر شاخی بەرزی پیر(٢)
ئەم سیلسلەی جبالە لە ژێر چاویا ئەسیر



وا سەیری شەرق و غەرب و جنوب و شیمال ئەکا
ئەم مەنزەرەی لەتیفەیە دەفعی مەلال ئەکا
سوورکێو، سەگرمە، گۆیژە و قەندیل سوپاهیە
تەختی زەمینە قووبەی گەردوون کولاهیە

**

ئەم بەفرە زیوی خالیسە یا بەحری یاسەمین
یا قەترەیەکی ڕەحمەتە کەوتۆتە سەر زەمین
سەرچاوەی حەیاتی شەتی دیجلەیە و فورات
دنیای فەیز و نیعمەتە بۆ ئەهلی کائینات
ئەمڕۆ جەفای سەردیە (سبحەی سەفای) دڵ
ئەم بەفرە جازیبەی تەرەب و شەوقی بولبولە

**

ئەی سەبزەیی بەهار ئەی خونچەی ئەمەل
لابەی لە چاوی ئێمە هەموو عیللەتی سەبەل
کەی تۆ لە خاکی پاکی وەتەن جلوەگەرد دەبی
کەی ڕۆشنی دەروون و جەلابی نەزەر دەبی
دڵشادم ئێستە ئاخری ئەم دەردە مەرهەمە
دوای (عُسرِیُسرَ) نەصی خوداوەندی ئەعزەمە

.........................................................

(١) ئەم شیعرە لە سۆزی نیشتماندا مامۆستا نەجمەدین مەلا بەدەستکاری خۆیەوە بڵاوی کردۆتەوە بەڵام ئەم دەقە ڕاستییەکەیەتی کە لە ڕۆژنامەی ژیان ژمارە ١٤ی ساڵی ١٩٢٦دا بەئیمزای فایەق زێوەر بڵاوکراوەتەوە بەڵام لە ڕاستیدا هی (زێوەر) خۆیەتی.
(٢) (شاخی بەرزی پیر) مەبەست پیرەمەگروونە.

## سەرگوزەشتەی کاربەدەستانی دەوری عوسمانی*

باسی مەئموری دەوری عوسمانی
هەمووی مەعلوومە لای سولەیمانی
نیک و بەد هەرچی بوو ئەوا ڕابوورد
شیر نەما، دۆ برا، کە مانگا مرد
غایەتێ باس ئەکەم لە یەک مەئموور
وەختی ئینگلیز کە تاوی دابوو تەنوور





پیاوێ قەرزی ئەبێ ئەچێتە شکات
حەقی چەند ساڵەکی بدا کە نەجات
ئەنووسێ قەبضەییێک مودیری زەمان
کە ئەبێ بێتە لام فلانی فلان
خاوەنی قەرز ئەچێتە سەر کابرا
قەبضەکەیشی لە ڕووی ئەوا دەرئەخا
پیاوی بێ چارە پێی ئەڵێ: ئەی یار
حەقی تۆ ثابیتە بەبێ ئینکار
نیمە من عالەمێ بکەم ڕازی
ضەبطییە و تۆ مودیر لەگەڵ قازی(١)
بەقەدەر حەقی تۆ ئەبێ دیاری
بۆ مودیر بەگ بەرم نەکا لاری
پیاوی چاک بە، ڕەفیق بە، تووبی خوای
حەقی خۆت وەرگرە مەچۆرەوە لای
مەسئەلە حەلل و فەصڵیان کرد زوو
لێک ترازان بەدڵ خۆشی هەردوو
کە ئەوەی بیست مودیر دڵی ئێشا
ضەبطییەی نارد و کابرای کێشا
وتی: بۆچی نەهاتی هەووەڵ جار
وتی: ئیش حەل کرا بەبێ ئینکار
وتی: تۆ خائینی نەفام و مناڵ
بدە سەد ڕوپیە و مەچۆرەوە ماڵ
ڕقی زۆر بوو مودیر، جەریمەی کرد
نەک جەریمە، کە قیمە قیمەی کرد
ئەمەبوو حالی ئەسبەق و سابیق
خوا بکا ئیتر وانەبێ لاحیق

* ئەم سەرگوزشتە شیعرییە لە ل٦٤-٦٥ی سۆزی نیشتمان دا چاپ کراوە.
(١) ضەبطییە: زەبتییە، پۆلیس





## سیاسەت*

لینی وتی: بازێ ئەبەمە میسر و فەڵەستین(١)
بۆ خۆم ئەبمە سەروەر و سوڵتان و سەلاتین
هیتلەر وتی: لینی! مەکە زۆر موشکیلە ئیشت(٢)
تۆ بەم حەرەکە مەیگرە گوو ڕیشم و ڕیشت
مەغروور بوو قسەی هیتلەری نەکرد بەقرانێ
هێنایە وجوود واتەی هیتلەر بەتەکانێ

* ئەم سێ دێرە شیعرە لە لاپەڕە ١٠٥ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراون.
(١) مەبەستی مۆسۆلینییە کە یەکێک بووە لە پیاوانی بەناوبانگی ئیتاڵیا و دامەزرێنەری حزبی فاشیستی (الاتحادی)یە ساڵی ١٩٢٩ی ز موعاهەدەی (لاتران)ی مۆر کرد کە ڕێککەوتنێک بوو لە نێوان کورسی ڕەسولی و ڕژێمی ئیتاڵیا ١٨٨٩-١٩٤٥ز.
(٢) هیتلەر: سەرۆکی حزبی وەتەنی سۆشیالیست (نازی) سەرۆکی ئەڵمانیا بوو، شەڕی دووەمی جیهانی هەڵگیرساند و کاتێک دەورەی بەرلین گیرا خۆی کوشت.

## ئامۆژگاری*

چونکە دنیا، هەرچی بیبەخشێ ئەبێتە عارییە(١)
گەر قوبوڵی کەی بەخۆشی عیللەتی بێ عارییە(٢)
حوڕ نەبیت ناژیت، لە عالەم لەززەتی تۆ مردنە
ڕاستێکی دنیا و قیامەت لەززەتی ئەحرارییە
داعییەی گەورە و ڕیایی و خزمەتی یاری فەقیر
تا دەوامی بێ خراپی لەم دیارە دیارییە(٣)
داری دەس قەڵباغی سەر پۆتین پێ ناتخاتە پێش
داری دەستی میللەتی پێشکەوتووان بێدارییە(٤)
میللەتی ئەسلاو هەتا بێ چارە بوون چاریان هەبوو(٥)
ئێستە کە چاریان پەیا کرد شەئنیان بێ چارییە(٦)
قەت مەڵێ: من کورد و مەدحەت تورک و سەعدوون عارەبە(٧)
جوملە ئیسلامین برایمان لە شەرعا جارییە
قەومی کورد هێشتا مناڵە لانک و بێشکەی پێ ئەوێ
بۆ قەومی شێری شادمان پڕ قورگ و زارییە

* ئەم شیعرە لە ل١٠٧-١٠٨ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.
(١) عاربیە: عاریە: خواستەمەنی، ئەوەی بیدەی بەیەکێکی تر بەو هیوایە لێی وەربگریتەوە.
(٢) عیللەتی بێ عاری: هۆی بێ ئەدەبی و کەم تەربیەتی. لەنێوان (عاربیە) و (بێ عاربیە)دا جۆرە طیباقێک هەیە.
(٣) دیار: وڵات. دیاربیە: ئاشکرا و دەرکەوتوو. لەنێوان (دیار) و (دیاری) جۆرە جیناسێکی جوان هەیە.
(٤) بێداری: بەخەبەری و هۆشیاری لە نێوان (داری) و (بێداری) جیناسی ناقیص هەیە.
(٥) میللەتی ئەسلاو: مەبەستی گەلانی سلاڤە.
(٦) بێ چارە: بەدبەخت و چارەڕەش. چاریان هەبوو: چار، لێرەدا واتە قەیصەر.
(٧) مەدحەت: مەبەستی مەدحەت پاشای تورکە (١٨٢٢-١٨٨٤ز) یەکێک بووە لە هەرە پیاوانی لێهاتووی عوسمانییەکان، زۆر قانوون ناس و ئیداری بووە ماوەیەک والی بەغدابووە.
سەعدوون: مەبەستی (عەبدولموحسین ئەلسەعدوون)ە کە بە (عەبدولموحسین پاشا) بەناوبانگە. ساڵی ١٨٧٩ی زایینی لە ناصریە لە دایک بووە بۆ خوێندن نێردراوەتە ئاستانە لە (مدرسة العشائر) دەرچووە دوایی چووەتە (المدرسة الحربیة) ئەویشی تەواوکردووە، بووەتە زابتێکی لەشکری عوسمانی دوایی بووەتە (مرافقي) سوڵتان عەبدولحەمید، دوایی گەڕاوەتەوە بۆ عێراق، دوای جەنگی یەکەمی جیهانی کراوە بەوەزیری داخیلیە، ئەمجا کراوە بە سەرەک وەزیران هەروا بووەتە سەرۆکی (مجلس الأعیان) و (مجلس النواب)یش، ساڵی ١٩٢٩ی.ز. خۆی کوشتووە.

## چ خۆشە؟*

چ خۆشە حوکمی عەدالەت، نەمانی مەحکومی
چ خۆشە ڕەفعی سەفالەت شیعاری مەظلوومی؟
لە بەینی قەوم و میلەلدا چ خۆشە مەوجوودیی
چ ئافەتێکە حەقیقەت بەڵای مەعدوومی
چ نەگبەتێکە ئیلاهی جەهالەتی میللەت
چ دەوڵەتێکە مویەید ئەساسی مەعلوومی
نەما لە سایەی عەدلی ئیلاهـ و لوطفی خوا
لەسەر خراپەی ئەم کوردە سایەیی بوومی
لە فەیضی لوطفی خواوە ویلایەتی مووصڵ
نەجاتی بوو بەتەواوی لە پەنجەی ڕۆمی
بەڵێ نەتیجەی زوڵم و جەفایە بۆ هەر کەس
بەرۆکی خۆی ئەگرێ عاقیبەت بەمەشئوومی
کولاهی فەخری هەموو کوردەکان گەیشتە فەلەک
کە تورکی دا بەزەویدا خەیاڵی مەوهوومی
کە عوصبەتول ئومەم ئەم حوکمە عادیلانەی دا
حەیاتی دا بەعێراق و نەماوە مەحروومی





بژی بەعەدلەوە عوصبە لەگەڵ بەریتانی
چرای وڵاتە قەراریان بەلەفظی مەفهوومی

* زێوەر ئەم شیعرەی بەهۆی ئەوەوە گوتووە کە ساڵی ١٩٢٤ی ز لەلایەن مەجلیسی عوصبەتول ئومەمەوە، ولایەتی موصڵ لە تورکیا دابڕا و خرایەوە سەر عێراق. (سۆزی نیشتمان لاپەڕە ٤٦-٤٧)

## من ئەڵێم*

من ئەڵێم: لازم نییە فێربم لە دنیادا حیساب
پێم ئەڵێن: ئەی چۆن نەجاتی خۆت ئەدەی ڕۆژی حیساب؟(١)
من ئەڵێم: مەهدی لە دنیادا نییە و زیندوو نییە(٢)
شاه ئیسماعیل ئەڵێ: ئەتهێنمە بەر داری عەزاب(٣)
من ئەڵێم: هیچ حەوسەڵەی سەیری کیتابم لا نییە
پێم ئەڵێن: مەجبوور ئەبێ بگری بەدەستێکت کیتاب
من ئەڵێم: هەر باری عەشقی ئالی حەیدەر کافییە
ئەهلی سوننەت پێم ئەڵێن: سەرباریبە حوببی صەحاب(٤)
ئێوە مەهدین یا نەبی یاخۆ لە بابی پرس ئەکەم
ئەم سوئالەی من لە ئاخردا دەمێنێ بۆ جەواب
من ئەڵێم: کەی میللەتی خۆت خۆش ئەوێ غەمیان ئەخۆی؟
پێم دەڵێ: وەختێ شەرابێکم ببێ گۆشت و کەباب
من ئەڵێم: کەی یادی حەشر و دۆزەخ و ئاگر ئەکەی
پێم ئەڵێ، وەختێ ببینم سووفیی و مەلای خەراب

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ٣٦-٣٧ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.
(١) حیساب: لە نیوە دێری یەکەمدا مەبەستی زانینی ژمارە و لێکدانەوەیە، لە نیوە دێری دووەمیشدا مەبەست ڕۆژی قیامەتە.
(٢) مەهدی: مەبەست حەزرەتی مەهدییە کە گوایە لە ئاخری زەمانا دێتەوە بۆ ناو خەڵک.
(٣) شاه ئیسماعیل: مەبەست شا ئیسماعیلی صەفەوییە کە بەزۆر خەڵکی کردووە بەشیعە. ئەم شا ئیسماعیلە ساڵی ١٤٨٧ی ز هاتۆتە دنیاوە لە ئەردەبیل هەر لەوێش ساڵی ١٥٢٤ی ز مردووە. بناغەدانەری حکوومەتی صەفەوییە بەبنچینە دەچێتەوە سەر ئیمام موسای کاظم لە کاتێکا ئێران پشێویی تێدابوو چووە سەر حوکم و فارس و ئازربیجانی داگیرکردن ساڵی ١٥٠٣ی ز نازناوی پاشایەتی بۆ خۆی پچڕی و وڵاتی داگیرکردن لە ڕۆژهەڵاتەوە تا هوراتی گرت و لە جنوبەوە بەغدای خستە ژێر دەستی خۆیەوە دەستیشی بەسەر نەجەف و کەربەلادا گرت مەزهەبی شیعەی بڵاو کردەوە. لەگەڵ عوسمانییەکان کەوتە شەڕەوە لە شەڕی چالدێراندا ساڵی ١٥١٤ی ز تێ شکا.
(٤) صەحاب: کۆی ئەصحابە واتە یار و هاوڕێکانی پێغەمبەر.

## شێتە هەر کەس*

شێتە هەر کەس وا تەماشای ئێستەی هیتلەر ئەکا
یا بەهەڵپەی خۆترێنی ئەو کەمێ باوەڕ ئەکا
ئەو کەسەی بڕوا بەنەصری ئاخری ئەڵمان ئەکا
یا کەرە و دەرکی نییە یا تێ ئەگا و خۆی کەر ئەکا
هەڵمەتی نازی ڕووەو خاوەر سەراپا حینەتە
ئاگرێ سوور بێ موحەققەق خۆی بەخاکستەر ئەکا(١)
ئاخری ئەم هەوڵ و ئەم پێشکەوتنەی خۆکوشتنە
کێ ئەسەلمێنێ کە پووشو شەڕ لەگەڵ ئەخگەر ئەکا(٢)
ئاو و گڵ هێنای بەشەق بۆ ساحەی مەوت و فەنا
ظاهیرەن مەقبەر لە تۆیی خاک و گڵی خاوەر ئەکا
زوو ئەگەر بێتوو بگاتە شەرقی ئەوسەط من ئەڵێم:
سینگی نازی حەز لە نووکی سونگیی و خەنجەر ئەکا
ئەم تەم و هەور و هەڵایە یەک شەوە، تێپەڕ ئەبێ
ئاخری ڕۆژی ظەفەر ڕۆژێ لەکەل سەر دەرئەکا

............................................................

* ئەم شیعرە لە (ژین)ی ژمارە ٦٤٧دا بەناوونیشانی «شاعیرێکی بەناوبانگ و ئەدیبێکی شیرین زمان وا ئەڵێت» بڵاوکراوەتەوە. لیژنەی لێکۆڵینەوەی دیوانی پیرەمێرد بەهی پیرەمێردیان دانابوو بەڵام ئەو پسپۆڕ و برادەرانەی مسوەددەی دیوانەکەیان هەڵسەنگاند بوو تێکڕا داکۆکییان لەسەر ئەوە کردبوو کە هی زێوەر بێ نەک هی پیرەمێرد بۆیە ئێمەیش خستمانە نێو دیوانی زێوەرەوە. بەتایبەتی کە زێوەر یەکێک بووە لەو دژ بە(نازی)یانەی کە هەرگیز نەرمی نەنواندووە بەرامبەر بەفاشیزم و نازیبیەت، هەموو کات هەڵوێستی تایبەتی خۆی لە کۆڕ و کۆبوونەوە و هەڵسان و دانیشتنیا دەربڕیوە خەتی ڕیجعەی بۆ خۆی نەهێشتۆتەوە.

(١) خاکستەر: خۆڵەمێش.

(٢) ئەخگەر: پشکۆ ئاگر، خەڵووزی گەشاوە و داگیرساو.

## سیاسی نیم*

سیاسی نیم و عەسکەر نیم بەڵام دیارە بەئاثاری
کە هیتلەر لەڕ بووە نەیماوە هەڵپەی پار و پێراری
لە بەر کەڵبە و بڕەی وردکردووە ورچێکی کوێستانی
لە ئاویشا بەجارێ دوو نەهەنگ داویە پەلاماری
ڕەفیقیشی کە مۆسۆلێنییە مەعلومە لای عالەم
لە دەست یۆنان گەییشتە ئاسمان فریاد و هاواری



ڕەفیقی حیزە، خۆی بێ هێزە، مانەندی کەری دێزە
بەتۆپینیش ڕەزایە مەرگی هاوەڵ بوو بەسەرباری
بەتوند و تیژی هاتە پێشەوە هیتلەر بەڵام دوایی
پەتی پچڕا و، هیوای بڕا، دەفی دڕا، نەما چاری
دەخیل ئەی خێڵی ئینگلیزی صەقالیا پڕ لە ئیسلامە
ئەبێ چاودێری بکرێ چ دێهاتیی و چ ناوشاری
سەداکەی فاتیکان فتوای جیهادی دابوو بۆ سەر ڕووس
منیش فتوا ئەدەم (پاپا) بەپایەک بێننە یاری

............................................................

(*) زێوەر ئەم شیعرەی ساڵی ١٩٤٤ی ز. لە بابەت جەنگی هیتلەرەوە گوتووە، لە ل٥٢ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.

## تێک ڕژاون

تێک ڕژاون خۆ بەخۆ سوور بوو بەخوێن دەشت و چیا
ئینتیقامی ئەهلی ئیسلامە لە ناو ئەسپانیا
گەر هێلاسلاسی موسڵمانانی خستە ناو کەمەند(١)
حەق تەعالا دەستبەجێ بۆی نارد شەقی ئیتالیا
چونکە ئەووەڵ خزمەتی ئیسلامەکانی کرد حەبەش
ناوی چاکەی باقییە لای ئەورووپا و ئاسیا
هەر ئەڵێم: باسی سیاسەت ناکەم و لێی دوور ئەبم
عاقیبەت ئەمخاتە نووسین ظوڵمەکانی تورکیا
ستالینیش نەبێ نوطقێ بدا بۆ کوردەکان
خاک و ئاو و جێگەمان دوای خستوون فینلندیا
دەست لەمل قەومی عەرەب کەن موتتەحیدبن دوو بەدوو
شوهرەت ئاوازەتان ئەڕوا هەتا ژاپۆنیا

............................................................

* ئەم شیعرە لە ل٢٩ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە لە پێشەوەشی ئەو دێرە نووسراوە کە دەڵێ: «زێوەر ساڵی ١٩٣٥ بەهۆی هێندێ شۆڕش و ئاژاوەی جیهانەوە وتوویەتی».

(١) هیلاسلاسی: هایلەسلاسیە: ئیمپراتۆری حەبەشە بووە ساڵی ١٩٣٠ لەگەڵ ئیتالییەکان بەشەڕ هات. ساڵی ١٩٣٥ پەنای بردەبەر ئینگلیز.





## فەلەستین*

گریانە فەلەک چاوی لە ئەحوالّی فەلەستین!!
بوریانە مەلەک جەرگی لە ئەهوالی فەلەستین
لەعلی یەمەنە سوور بووە شاخی هەموو ئاخۆ
ڕەنگینە بەخوێنی ژن و منداڵی فەلەستین
شەللالەی ئاو سەیری مەکە زۆرە لە دنیا
شەللالەی خوێن سەیرە لەناو ماڵی فەلەستین
هەر کوشتنە، خوێن ڕشتنە، ئیعدامە، لە هەر لا
سووتاوە بەبۆمبای عەدوو باڵی فەلەستین
جەژنە، خەنەبەندانە لە هەر شار و دیارێ
خوێناوە خەنەی بازن و خەڵخاڵی فەلەستین
لاشەی شوهەدا دەعوەتی ئینگلیزە لە سەحرا
کردوویەتی بۆ وەحش و قەل و داڵی فەلەستین
شەو چاترە لەم عەصرە کە عەصری مەدەنی بێ
ئیثباتی قسەم شاهیدە ئەقوالی فەلەستین
ئەی هیندو عەرەب، تورک و عەجەم، کوردی موسوڵمان
چۆن جوولەکە بێ حاکمی فەعالی فەلەستین
وا ئەهلی صەلیب هاتەوە سەر قودسی موبارەک
ئەی ڕوحی صەلاح لابەرە زیلزالی فەلەستین
بێ ڕزق و ئیرادە هەموو مەئیوس و پەرێشان
بۆتە ڕەمەزان ئەووەلی شەووالی فەلەستین
صەهیوونی لە ئەڵمانەوە دێ خاوەنی موڵکە
خاوەن نییە بێ مایە و حەممالّی فەلەستین
ئینگلیز، بەحەرب داخڵی ئەم خاکە نەبووی تۆ
چۆن ڕووت هەیە خۆت کردووە بەجەنراڵی فەلەستین
ڕێی حەق ئەگرن طالبی عەدلن هەموو ئیسلام
بەو واسیتەوە ڕەوشەنە ئیقبالی فەلەستین
مەشهوورە کە جوو لەشکری دەججالە، لە ئاخیر
مەهدیی هەیە بۆ چارەی دەججالی فەلەستین





گەر موددەعی بەم قەتل و قیتالە دڵی خۆشە
گوم نابێ لە ئەحفاد و لە ئەنجالی فەلەستین

..........................................................

* ئەم شیعرە کاتی خۆی مامۆستا زێوەر بەو شێوەی سەرەوە گوتوویەتی و بەمەش شاعیر لە سنووری وڵات چۆتە دەرەوە و هەڵوێستێکی پیرۆزی نواندووە و هاوبەشی لێقەوماوانی فەلەستینی کردووە بەگوێچکەی زەمانەیدا سرپاندووە کە چەوسێنراوەکان و گەلە ژێردەستە و ئاشتیخوازەکان هەموویان یەک هەڵوێست و یەک مەبەستیان هەیە. کەچی مامۆستا نەجمەدین مەلا هاتووە شیعرەکەی لەو ئاسۆ فراوانەوە هەڵگێڕاوەتەوە بۆ بارە کوردایەتییەکە و وشەی (فەلەستین)ەکانی گۆڕیون بە (وڵاتم) لە سۆزی نیشتمانیشدا لاپەڕە ٣٧-٣٨ هەر لەسەر شێوەی نووسینی نەجمەدین مەلا چاپ کراوە. ئێمە خستمانەوە سەر شێوەی خۆی بەمەش زۆر خوێنەری چەواشە کردووە ئەمەش بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگری دەست تێوەردانی خوالێخۆشبوو نەجمەدین مەلایە بۆ چەواشەکردنی مێژووی شیعری و هەڵوێستی زێوەر چ بەرامبەر بەکورد و چ بەرامبەر بەبیانەش.

## ئیستقبال بۆ تازە پێگەیشتووەکان(١)

صوبحینی ئەم تەجەدود، بۆ تۆیە ئەشەباب
بۆ تۆیە ئەی ئومێدی وەتەن خادمی حەیات
ئەی ئافتاب فەجری ئەمەل مایەی حەیات
صوبح سەعادەتێکی عەجەب و پاک و بێ صەحاب
هەر چاوەڕوانی تۆیە دەسا فرسەتە شەباب

**

ئەی فەجری غوبار و کەدەر عالەمی ئەمەل
چاوی لە تۆیە کە ئومێدی هەموو کەسی
ئەلحەق عیلاجی دەردی دەوایەکی نەورەسی
هیند چاوەڕێ بوو چاری هەتا پێکەنی صەبەل
فەرموو درەنگە وەختی طلوعێکە بێ حجاب

**

بەڵکو کە صەرفی ماضی تاریک و هەوڵناک
بکرێتەوە خەتی لە پڕ دڵ بچێتەوە
نەختێ بەهاری عەیش و وەتەن و وەختی بێتەوە
شاهید خەزان عومری بکاتە سینە چاک چاک
بکرێتەوە فەهمی ماضی پڕ عەزاب

**

ئەی نووری سیدەکان و وەتەن وەقتی غیرەتە
تەحصیلی عیلم و مەعرەفە مایەی شەرەف
تێ کۆشە بۆ سبەینێ نەوەک بتکەنە هەدەف
صوبحینی خاک و ئەم وەتەنە لات ئەمانەتە
خزمەتی وەتەن شەرەفی هەموو بۆ تۆیە ئەی شەباب

**

ئەی موحتەرەم موعەلیمی هۆشیار و بەویقار
ئەی دوشمنی جەهالەت و ئەی خادمی بەشەر
ئەی خەصمی یەئسی دائیمی ئەی مایەی ظەفەر
ئەی مەحضەری سەعادەت میللەت بەئیفتیخار
لادەن لە ڕووی ماء وەتەن زیللەت نیقاب

**

ئێوەن بەنووری عیلم منەوەر ئەکەن وڵات
ئێوەن کە خزمەتی وەتەن میهرەبان ئەکەن
تەنویری فیکری عالەم و تەعلیم شەئن ئەکەن
ئیحضاری مەعریفەت ئەکەن فرصەتی نەجات
پڕ نوور ئەکەن وڵاتی وەکو شەوقی مەهتاب

**

مەحبووبەی جوانی وەتەن شۆخ و ماهڕوو
ئارایش بەخشڵی عیلم دەن مەکەن قصوور
تەنویر کەن بەشوعلە بەهێزی کەن ثبور
قەد بێ جیازی ئەم کچە هەرگیز مەدەن بەشوو
بەڵکو ببێ وەتەن لە سەعی ئێوەوە فیضاب

**

ئیتر ئەکەم بەیانی خلوصی و تەشەکوران
تەقدیمی ئیحترامی خصوصی بەدڵ و بەجان
بۆ خزمەت جەنابی مودیر و موعەلیمان
ئەم بووکە سەبزە با بکەم دیاری و خەڵات
هەرچەندە زەرەری هیچ نییە شەوقی ئافتاب

م. نووری

........................................................

(١) شێخ نووری شێخ ساڵحی شاعیر لە ڕۆژنامەی پێشکەوتن ژمارە ٨٣ی ٢٤ی تشرینی دووەم ساڵی ١٩٢١دا ئەم هەڵبەستە بڵاودەکاتەوە زێوەریش وەڵامی دەداتەوە.





## ئەی بولبولی!*

ئەی بولبولی حەدیقەی موڵکی هونەروەری
دەرحەق بەلوتفی خاصی جەنابت خەجاڵەتین
لەو مەدحە بێ غەشە هەموو بێ قەدر و قیمەتین
قابیل بەمەسلەکی ئودەبایە سوخەنوەری
«للّه درّکم» کە گەیشتوویتە ئەنوەری(١)

**

شوکرت ئەکەم بەناوی مودیر و موعەللیمان
مەدحت ئەکەم بەناوی ڕەفیقانی موحتەرەم
ئەی نووری دیدەیی وەتەنی پاک و موحتەشەم
دەرحەق بەعیلم و مەکتەب ئەتۆ هاتوویتە زوبان
فیکری بلّندی تۆیە گەیشتۆتە موشتەری(٢)

**

خاکی وەتەن کە گەوهەری هاڕاوەیە هەمووی
وەک سورمە وایە بۆ نەظەری ئەهلی مەعریفەت
نایێتە ڕێی ژمارە کە لەو دایە هەر صیفەت
پڕ ئاوەکەی حەیاتە هەموو شیشەو و سەبووی
بێ نرخە گەوهەری کە نەگا زوو بەجەوهەری

**

چاوی لە دەستی ئێمەیە ئەم دایکە بێ کەسە
دەورەی تەجەددودە، ئەمە عەسری تەکامولە
عەیبێ کە نەقص و گەورەیە ئەمڕۆ تەکاسولە
خوێندن لزوومە سا چ لە مەکتەب چ مەدرەسە
بەسیە سەماعی چەنگ و نەی و عومری سەرسەری

**

عیلم و فنوونە بۆتە چرای موڵکی سەر زەمین
فەننە جەمادی کردووە ئەمڕۆ بە «ذو حیات»
دیقەت کە تۆ بەچاوی حەقیقەت لە کائینات

جەهلە کە بۆتە باعیشی فەوتانی مولّک و دین
عیلمە کە صاحێبی دەگەیێنێ بەسەروەری

**

یارەب! هیدایەتێ مەربووطی قودرەتە
بێ بەش نەبین لە نیعمەتی عیلمێ کە نافیعە
دەرخەی چرا بەحورمەتی زاتێ کە شافیعە
لامان بدەی لە جەهل و نەفامی کە ظوڵمەتە
فەڕمان فڕیوە جیقەی سەرما نەبێ فەڕی**

........................................................

* مامۆستا زێوەر ئەم شیعرەی لە وەڵامی هەڵبەستێکی شێخ نووری شێخ ساڵحەوە کە لە ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)ی ژمارە ٨٣ی ٢٤ تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢١ی ز بڵاوکراوەتەوە.
شیعرەکەی زێوەریش لە لاپەڕە ٢٢-٢٤ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.
(١) لله درکم: واتە پاداشی چاکەدانەوەی ئێوە هەر بەدەست پەروەردگارە. ئەم ڕستەیە لە عەرەبیدا وەکو پەندی پێشینانی لێ هاتووە بۆ مەدح و دوعای چاکە بەکاردەهێنرێ.
ئەنوەری: شاعیرێکی ناوداری فارسە.
(٢) موشتەری: مەبەستی ئەستێرەی موشتەرییە.
** فەڕ: عەقڵ و ژیریی. جیققە: چقەی پاشایەتییە شتێکە وەکو تاج و نەجمە بەکڵاوەوە شەتەک دەدرێ.
واتا عەقڵ و هۆشمان فڕیوە و بێ عەقڵی نەجمە و نیشانی سەرمانە.

## وەرامی زێوەر بۆ شێخ نووری شێخ ساڵح*

ئەی مەرحە لە پەیمایی فەضای لایەتەناهی
ئەی دافیعی حوزن و کەدەر و ڕەنگی سیاهی
ئەی شەمعی ئیلاهی
ئەی نووری سەماوات و زەمین ڕەهبەری گوم بوو
ئەی ڕۆشنی بەخشایی غەریبانی موکەددەر
ئەی ماهی مونەووەر
هەرتۆی کە بەشەو مونیسی مەردانی غەریبی
تۆ واسیتەی خۆشیی ئەغیار و حەبیبی
بۆ خەستە طەبیبی
سەیرت ئەکەن ئەهلی وەتەن و دوور لە وەتەن هەم
شەمعێکی لەطیفی لە نەزەر دیدەیی عالەم
بێ مەسرەفی درهەم



جەزری هەیە، مەددی هەیە دەریا، سەبەبی تۆی
سەرباخ و خیابان لە وەوە زینەتی عەردە
وەک مەرهەمی دەردە
توو عەشقی جەمالت وەرە ئەی قاصیدی یەزدان
نامەم بگەیێنە بەدەسی مەردی سوخەندان
یاری شەکە ڕەفشان(١)
ئەو ساکینی هەولێرە کە شارێکی قەدیمە
ئۆتێلی شەریف مەسکەنە بێ یار و نەدیمە
دۆستێکی حەمیمە
عەرزی بکە ئەی تووتیی صەحرایی مەحەببەت
سەرمەستی ئەدەب، سەرخۆشی صەهبای مەحەببەت
دانای مەحەبیەت(٢)
چوارشەممە بەسەیارە و عەرڕادە لە هەرلا(٣)
سەیرانە لە سەیوان و لە شەخسان و لە صەحرا
سەیرێکە دلارا
ئەم ساڵ وەکو ساڵان نەبوو ئەم شارە بەهاری
بۆتە گوڵی ناو چیمەنی ئاهووی تەتاری
وەک نەقش و نیگاری
نازک بەدەنان دێن و ئەچن عیشوە فرۆشن
وەک حۆری ئەڕۆن سوندوس و ئیستەبرەق ئەپۆشن
مەهوەشن و بەهۆشن(٤)
ئەو قۆربە شکاوە کە دەکەی یادی، نەماوە
سەیرانگەهی یارە بووەتە دەشتی سەماوە
تەغییری تەواوە
جێ گۆڕکەیە ئێستاکە مەسیر بووەتە وەیس(٥)
ئەو دەشتە لەطیفە بووەتە لانی غەزالان
جێی لەیلە لەگەڵ قەیس
(نووری) مەبە عاجز وەکو ئێرانەیە هەولێر
جێی عیلم و عەمەل، فەضڵ و هونەر، لانەیە بۆ شێر
هەم مەنبەعە بۆ خێر





فەرزی بکە ئۆتێلە کە لای سۆفی شەریفە
زۆر ئەهلی سلێمانی لەوێ بۆتۆ حەریفە
شارێکی زەریفە
هاو شەهرییەکانت کە لەوێن مەردی گوزیدەن
مەعلوومە هەموو صاحێبی ئەفعالی حەمیدەن
شابەیتی قەصیدەن
بیخوێنەرەوە گوفتەی وەک شەککەری نالی
لابا لە مەذاقا کە ببێ ترشیی و تاڵی
شیرینە مەئالی
(عاجز مەبە قوربانی کە ئەمە دەورە نە جەورە
ساقی کەرەمی یەک بەیەکە نۆرە بەنۆرە)*

..................................................................

(١) شەکەرە فشان: شەکەر ئەفشان بۆ وەزنی شیعر وشەکە سووک کراوە. بەواتا شەکر پرژاندنە مەبەستی قسەی خۆش و تەڕ و پاراوە.

(٢) صەهبا: شەڕاب. موحببەت: خۆشەویستی.

(٣) عەرڕا: عرّادە: عەرەبانە.

(٤) سوندوس و ئیستەبرەق: لیباس و کاڵای ئاوریشم و زەڕکەش

(٥) وەیس: سەیرانگە و مەزاری پێشەواییێکە بەناوی وەیس قەرەنی. مایی دەشت: ئەوسا لە قەراغ سلێمانی بوو، بە تەواوی شوێن کارگەی جگەرەی ئێستایە.

* نەجمەدین مەلا ئەم دێرە شیعرەی خستۆتە ناو کەوانەوە بەهی نالی داناوە گوایە زێوەر تەضمینی کردووە بەڵام لە دیوانی نالی دا بەرچاوم نەکەوت.

***

ئەم شیعرە لە لاپەڕە **٢٣٩-٢٤٢**ی کەشکۆڵی (أ) وەرگیراوە. هۆی وتنی شیعرەکەش وەکو نەجمەدین مەلا لە لاپەڕە **٢٣٦**ی کەشکۆڵەکەدا نووسیویەتی ئەمەیە «ساڵی **١٩٣٩**ی ز. شیخ نووری شێخ ساڵح کە ئەوسا لە هەولێر کاربەدەست بوو هەڵبەستێکی موستەزادی نارد بۆ مامۆستا زێوەر ئەویش هەر لەسەر ئەو وەزن و کێشە وەرامی دایەوە جارێ لە پێشەوە هەڵبەستەکەی شێخ نووری ئەنووسین ئەمجا وەرامەکەی زێوەر، ئەمە هەڵبەستەکەی شێخ نوورییە:

ئەی بادی صەبا! پەیکی خەیاڵاتی ئەدیبان
ئەی میر وەحەیی فێنکی زامی دڵی سووتاو
ئەی بادی خەرامان!
وەختێ کە ئەدەی شەو لە لق و پۆپی درەختان
سەد دەنگی نەیی و ناڵەی عوودت بەفیدابێ
ئەی موطریبی ناڵان!



گەر تۆ نەئەبووی ئەی ئەثەری قودرەتی لاهووت
چۆن پێ ئەکەنی غونچە دەمی فەسڵی بەهاران
ئەی نەی زەنی بۆستان
چۆن ناڵەی مەحزوونی کەوی دامەنی کێوان
تەئثیری ئەکردە جگەری لەت لەت و برژاو
ئەی موونیسی مورغان
ئەی بادی صەبا هەستە مەوەستە وەکو ئینسان
ڕوویێ بکەرە مەسکەنی جارانی سولەیمان
مەدفوونە لە سەیوان
ئەو شارە کە مەشهوورە بەکاشانەیی بابان
یەنبووعی ئەدەب، کانی هونەر، مەعدەنی عیرفان
هەم لانەی شێران
سەیرێ بکە بنوارە بەشار و بەکەنارا
دەورێ بدە نەختێ لە دەمی صوبحی بەهارا
ئەی بادی دلارا!
ئەم نامەیە جوان بگرە بەدەستێکی بلوورین
ڕازاوەتەوە چونکە بەمیهر و مەه و ئەنوەر
عەینەن وەکو ئەفسەر
بەو شەرتە لە تەقدیمی ئەوا واسیتە بێ ژین*
بیخەیتە سەری شاهی ئەدەب حەزرەتی (زێوەر)
ئەی بادی پەیەمبەر!
زاتێکی ئەدیبە بەئەدەب چۆرە حوزووری
عەرزی بکە چاکە بەدڵی ئێوەیە نووری
هەر ماتە لە دووری
عەرزی بکە ئەی هەیکەلی شیعر و ئەدەبیات
بێدەنگی بەسە گیانە! لە ئۆتێلی شەریفا**
ئوستادی ئەدەب شاعری پڕ فیکر و خەیاڵات
نابێ بەزەییت بێ بەغەریبێکی زەعیفا
مەظلووم و نەحیفا
ئاخۆ ئەثەرێ ماوە لە سەیرانگەهی یارە***
چوارشەممە ئەڕازانەوە نەو ڕستە نیهالان
وەک توولی نەمامان





لاگیرە بەسەریانەوە وەک ڕۆژی درەخشان
گەردانە لە ملدا ئەبووە ماه و ستارە
بەم فەسڵی بەهارە
چواشەمە کە دێ ناڵە ئەکا دڵ لە قەفەسدا
وەک مورغی ستەمدیدەی مەحبووس و موکەددەر(١)
وەک کۆتری پا بەستە لە ئەثنایی هەوەسدا
مەبهووت و سەراسیمە موکەددەر لە موقەددەر
بێ تاب لە نەفەسدا
دائیم دڵەکەم ئێستە لە لای قۆریە شکاوە****
ئەو جێیە کە مەشهوورە بەمەڵبەندی نیگاران
جێی سوحبەت و سەیران
چۆنە ئەثەری ماوە، وەیان بۆتە کەلاوە
کیسرایی سلێمانییە ئاثاری نەماوە
هەر بوومی لەناوە

.........................................................

* شێخ نووری مەبەستی ئەوەیە کە مامۆستا زێوەر ئەم شیعرە لە ڕۆژنامەی (ژیان)دا بخوێنێتەوە واتە ڕۆژنامەکە واسیتەی گەیاندنی شیعرەکەی شێخ نووری بێ بۆ زێوەر.
** مەبەست بە (ئوتێلی شەریف) چایخانەی دەروێش شەریفە کە ئەوسا شاعیر و ئەدیبەکان لەوێ بوونەوە.
*** سەیرانگەهی یارە: مەبەستی گردی (مامە یارە)یە کە کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی شاری سلێمانییەوە جاران سەیرانگا بووە ئێستا مەزاری پیرەمێردی شاعیر و ئەوڕەحمان بەگی بابان و جەمیل صائیبی لێیە.
(١) لە دەستنووسەکەدا نووسراوە: (ناتەواویەک هەیە لێرەدا) -ئاراس-
**** قۆریەشکاو: سەیرانگایەکی سلێمانییە.

## خوابی خەرگۆشی*

خوابی خەرگۆشی هەتاکەی، وەعدەی بێدارییە(١)
دوژمنی خۆت و منداڵت ئەژدەهای بێکارییە
پیاوی تەمەڵ دوژمنی خۆی و عەدووی هەر کەسە
قەولی «الکاسب حبیب الله» لە عالەم دیارییە
چاو لەمووچە و توورەکانە مەبڕە دائیم ئەی زەلام(٢)
مایەیی دنیا و دینت کەسب و صەنعەتکارییە
سەد غەرامافۆن فیدای هۆهۆیی جووتیارێ بکە
جوققەی شاهی بەپەنجەی خزمەتی جووتیارییە(٣)





وا بەجێماوی لە خێڵ ناگەیتە کوێستانی مراد
کوردە! سادەی غیرەتێ. غیرەت نەوەی دینداریيە
مەغریبی باری گەیاندە مەنزڵی ئەمن و ئەمان(٤)
تۆش لە ناو قوڕدا چەقیوی عەیش و نۆشت زارییە
«لیس للانسان الا ما سعی» بیخوێنەوە
سەعی و غیرەت ئەمری مەشرووعە، کەلامی بارییە
بەسیە شۆربا خواردنی ناو تەکیەکان و خانەقا
ڕووت لەدەرگاهی (تَوَكُّل) بێ سەبەب بێ عارییە(٥)
مونکیری شێخی تەریقەت نیم، حەقیقەت پێت ئەڵێم
چاوت ئاوسا هێندە نووستی، وەعدەی هۆشیارییە
صووفی! جەرگم بۆتە خوێن، فەوتاوە دنیا و دینمان
چەند هەزاران پیاو و ژنمان بوونە عەبد و جارییە

.........................................................

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١١-١٣ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە لە پێشەوەشی نووسراوە: «ئەم هەڵبەستەی خوارەوە ساڵی ١٩١٢م لە گۆڤاری هەتاوی کورد لە ئەستەموول چاپ کراوە.»
(١) خواب: خەو. خەرگوش: کەروێشک. خوابی، خەرگوشی: واتە کەروێشکە خەو یان خەوی کەروێشکی.
(٢) توورەکانە: ئەو موچەیەیە کە خزمەتکار لەسەر خەرمان ئەیدرێتێ.
(٣) جوققە: نیشایەکە بەکڵاوی شاهانەوە کراوە. لە تۆقی سەریان بەقەوس بەرزبۆتەوە.
(٤) مەغریبی: واتە ئەوروپایی.
(٥) توکل: تەوەککول: واتە پشت بەخوا بەستن دیارە پشت بەخوا بەستن بەبێ ئەوەی کە کابرا بۆ خۆی هیچی لە دەست بێ پەسند نییە، لە حەدیثدا هاتووە کە کابرایێک هاتە خزمەت پێغەمبەر عەرزی کرد قوربان! وشترەکەم ببەستمەوە یان تەوەککولم بەخوابێ؟ پێغەمبەر فەرمووی بیشی بەستەوە وتەوەککولیشت بەخوابێ.

## ئەم سپی و سوورە

ئەم سپی و سوورە چەشنی لەشکری ڕووس
ڕاو ئەنێن ساردیی شیتای عەبووس
وەکوو چەرچڵ هەور ئەگرمێنێ
ئەمر ئەکا دوشمنانی ئەفڕێنێ
قاسە قاسپی کەوە و چریکەی قاز
ڕوو لە کوێستان ئەکەن بەسەد ئاواز
چاووڕاوی نەماوە هێتلەری دەی
غەمی ناڕوا بەسەد قەرابەی مەی

حەق حەقی کۆتر و نەوای بولبول
مارشی فەسڵی بەهارە بۆ شای گوڵ
پیرەمێردیش بەهەڵپەڕین جوانە
چونکە نەورۆزی گەردی سەیوانە
گەردی سەیوان بەئەرغەوان ڕەنگین
ئاسمان خۆزگە خوازە بێ بەزمین
کوردە سا هەستە وەختی جۆماڵە
شاخی کوێستان کە ئیستە خاڵ خاڵە
شەتڵی تووتن بچێنە، گوڵ ببڕە
پەردەی زوڵمەتی شەوت بدڕە
وادەی کارە بۆی مەنوو، هەستە
گیانلەبەر نەشئەدار و سەرمەستە
دەنگی بلوێری شوان و هۆهۆی جووت
ئەوەیە بۆ ژیانی میللەت قووت

## بڕوام پێ بکەن*

قەسەم بەسێبەری شاخ و شنەی نەسیمی بەهار
بەقاسپەی قاسپی کەو و دەنگی کۆترانی نزار
بە ئاوی صافی چیاو و هەوای بێ تەپ و تۆز
کە مەقصەدم نییە ئیللا تەڕەققیاتی دیار(١)
تەڕەققیاتی دیاریش یەکێ لە وان عیلمە
دووەم زەراعەتە سێیەم صەناعەتێکی بەکار
چەهارەمین وەسیلەی عەمارەت و تەعمیر
کە ڕووبکاتە هەموو جێگە دێ بێ یاخۆ شار
ئەمانە هەموو مەبعووثی تازە ڕێکی ئەخا(٢)
ئەوە وەکیلی هەموو میللەتی فەقیر و هەژار
وەکیلی پێشوو قوصووریان نەبوو حەقیقەت ئەڵێم
هەتا لێوای نەخۆشی کەوتە دارەدار بەدار
حەکیمی حاذیقی پێ لازمە نەخۆشی ضەعیف
هەتاکو قووەت و خوێن دێتە ناو وجوود و دەمار

........................................................

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ٤٤-٤٥ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە. ئەو ناوونیشانەی سەرەوەی دراوەتێ لە ل ٩ی دەستنووسی





شاعیریشا هەیە بەڵام بەبێ ناوونیشان.

(١) تەرەققیاتی دیار: پێشکەوتن و سەربەرزی وڵات.

(٢) مەبعووث: مەبەستی ئەندامانی پەرلەمانی نوێنەرانە کە ئەوکاتە پێیان وتوون (مەبعووث).

## فەلسەفە*

بێ فائیدە سەودازەدەیی پارەو و پوولی(١)
بێ سوودە کە بەسراوی خەمی پەرچەمی لوولی
ڕێی ڕاستی قەت ناگری، هەر چەوتییە ڕێگات
لەم عەرصەی دنیایە وەکو هاودەمی کوولی
نوستووی لە بەرابەر صەنەمی عیففەت و ئەخلاق
بۆ زەوق و صەفا و ڕاهی سەفاهەت چ عەجوولی
مەحروومی لە دەرگاهی هەموو ئەهلی سەعادەت
خۆشیت چییە لای ئەهلی هەوەس ئێستە قوبووڵی
ئەمڕۆ بەفەرەح ڕادەبوێری لە هەموو جێ
وەڵڵاهی سبەی قوڕ بەسەر و مات و مەلوولی
ڕۆژ و شەوت ئەڕوا بەعەبەس دوور لە ئیطاعەت(٢)
شەرمەندی دەرگاهی خوداوەند و ڕەسوولی
هاومەجلیس و هەم پیاڵەی سوڵتان و خەلیفەی
بۆ حیرص و طەمەع پێشڕەوی هۆردوویی مەغوولی(٣)
هەرچەندە جگەر گۆشەی گەورەی شوهەدابێ(٤)
گەر بێ عەمەلی لەککەی بەرچاوی بەتوولی(٥)
بەهلوولی بەدینداری و زەغلوولی بەگوفتار(٦)
حەققەن نە ئەوی، نەئەمی بێ دین و جەهوولی
ئەی غافڵی بێ کردەوە بێ ئاوی و بێ زاد
وریابە سەفەر کردەی سەحرای بەطوولی

........................................................

* ئەم شیعرە بەناوونیشانی سەرەوە لە لاپەڕە ٣٤-٣٥ی سۆزی نیشتمان دا چاپ کراوە.

(١) سەودازەدە: ئەوەی دەردی عەشق یا خۆشەویستی یا هەر شتێکی تر کاری تێ کردبێ. یا بە مانا پەرێشانە.

(٢) عەبەس: بێ هوودە و بێ سوود.

(٣) هۆردووی مەغوول: لەشکری مەغوولەکان کە بەسەرکردایەتی جەنگیزخان بەشێکی زۆریان لە وڵاتانی نێوان صین و بەحری ڕەش داگیر کرد.

(٤) گەورەی شوهەدا: مەبەستی حەزرەتی حوسەینی کوڕی ئیمامی عەلییە.

(٥) بەتوول: بتول: مەبەست حەزرەتی فاطیمەی کچی پێغەمبەرە.
(٦) بەهلوول: باڵوڵی دانا صۆفییەکی سەردەمی (هارون الرشید) بووە. بەتەواوی دەستبەرداری دنیا بووە، بەشێتیان داناوە.
زەغلوول: سەعد زەغلوول (١٨٦٠-١٩٢٧ز) تێکۆشەرێکی میسری بەناوبانگە خەطیبێکی زمان پاراو و نیشتمانپەروەرێکی نموونە بووە لە مەدرەسەی ئەزهەر خوێندنی تەواو کردووە، سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانی میسر بووە ماوەیەک وەزیر بووە، دامەزرێنەری پارتی (وەفدی) میسریش بووە.

## شاخی تاریدەر*

ئەمشەو کە دەی تەمووزە لەسەر شاخی تاریدەر
چەند خۆش بوو عەکسی ئاگر و شەوقی ضیای قەمەر
ئاگر حەرارەتێکی ئەبەخشی لەسەر زەمین
مانگیش برووەتێکی بلاو کردەوە لەسەر
بەهـ بەهـ لە خاشەخاشی گەڵای سەر درەختەکان
هەی هەی لە قاسپە قاسپی کەوی شاخەکان سەحەر
سەرمای هەوای مانگەشەو و گەرمیی ئاگریش
ڕەنگێکی ئیعتیدالی پەیا کرد بوو مەقەڕ
لایێ وزەی سەماوەر و لایێ جزەی کەباب
دۆی سارد و مزری بوو بەمەزەی چای پڕ شەکەر
شاخانی ئەورووپا بەفیدای ئەم مەقامەبن
هەر مەنظەرە طەبیعییەکەی مەحوەکا کەدەر(١)

.......................................................

* مامۆستا زێوەر ئەم شیعرەی لە تەمووزی ساڵی ١٩٣٥ی ز. کە بۆ گەشت و سەیران چووە بۆ شاخی تاریدەر لەشاربازێڕ گوتووە. لە ژیانی ژمارە٤٩١ ساڵی ١٩٣٦ بڵاوکراوەتەوە هەروەها لە ل١٥-١٦ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.
(١) مەحوەکا: واتە: مەحو ئەکا، لەبەر کێشی شیعرەکە سووک کراوە.

## مەتەڵ*

کۆنە شارێکە لە جێیێکی دەشت
حورووفەکانی دووی کەمە لە هەشت
دووانی تەبیعەت داویە بەخەڵک
سیانی چشتێکە بۆ ڕووی ئەرز بەکەڵک
وەری گێڕیەوە پەڵەی نەمێنێ
چشتێکی وایە عالەم ئەژیێنێ
لەیەک تا پێنجی هێندە بەتامە





لێرە بەرەو خوار خۆراکی عامە
دووان و سیان و چوار دەردی بێ دەوا
سیانی دوایی خەڵک شەقییە لە دوا
یەکی سەرەتا و دووانی دواییینە
بە دوو ڕوو لە ڕووی دایک شیرینە
چواری ئاخری حیسابی گەرێکە
لە شازدە خانە خەبەر دەرێکە

.......................................................

* ئەم شیعرە لە ژینی ژمارە ١٠٤٩ی ١٩٥١/٥/١٠دا بڵاوبۆتەوە لە لاپەڕە ١٢٣ی سۆزی نیشتمانیشدا چاپ کراوە.
هەڵهێنانی مەتەڵەکەش: شاری خورماڵە چونکە پیتەکانی شەشن (خ و ر م ا ل). دوو پیتی سەرەتای بەشێوە نووسینی سەردەمی زێوەر دەبێتە: (خو: خوو) پیتی یەکەم ودووەم و سێیەم دەبێتە: خۆر (ڕۆژ) ئەگەر خۆرەکە هەڵگێڕیەوە و نوختەی خێیەکەش لابەری دەبێتە (رۆح).
لە پیتی یەک تا پێنجەم دەبێتە (خورما). پیتی دووەم و سێیەم و چوارەم (و،ر،م) دەبێتە (وَرَم)ی عەرەبی و دەردێکی کوشندەیە. سێ پیتی کۆتایی واتە(م،ا،ل) دەبێتە (ماڵ) و هەموو خەڵک بۆی تێدەکۆشێ. پیتی یەکەم و پێنجەم و شەشەم واتە (خ،ا،ل) دەبێتە (خاڵ) کە دوو مانای هەیە یەکەمیان برای دایک دووەمیان نوختەییێکی ڕەش یا ماوی لەسەر ڕوخسار یا شوێنێکی تری جیسم بێ هەردووکیشیان لای ئافرەت خۆشەویست و شیرینن. پیتی سێیەم و چوارەم و پێنجەم و شەشەم واتە: (ر،م،ا،ل) بەشێوەی نووسینی عەرەبی دەبێتە (رمّال) لەسەر کێشی (فعّال) سیفە موبالەغەیە و بەکەسێک دەگوترێ کە زانیاری (ڕەمڵ) بەباشی بزانێ و حسابگەر بێ. زانیاری ڕەمڵ بریتییە لەوە کە لەسەر ئەرز چەند خەتێک بکێشرێ و خانە بکرێ بەشێوەیەکی تایبەتی بۆ ئەوەی شتی نەزانراو و غەیبی پێ بزانێ.
شایانی باسە کە زانیاری ڕەمڵ شتێکی خەرافی و پڕ و پووچە و لەگەڵ زانستی ڕاستەقینەدا ناگونجێ.
ئەوەش لە بیرنەکەین کە مامۆستا ئەخۆڵ «ئەحمەد دەروێش» بە دە شیعر ئەم مەتەڵەی زێوەری شی کردۆتەوە ئەمەش شیعرەکانە.

جوابی زێوەرە ئەی پیری پڕ مەعنا و ورد خاڵە!
ئەوا دۆزیمەوە ئەمجا مەتەڵ شەش پیتە خورماڵە
یەک و دوو کەوتە سەریەک بوو بە(خوو) مەوجودە لای عالەم
لەلای هەندێ پەسند ئەکرێ و لە لای بەعزێ بەڵایە و غەم
کە سیانیان کەوتە پاڵ یەک خۆری ئاڵتونین لە دەشت و دەر
گوڵ و میوەو درەخت و گیا ئەبووژێنێتەوە یەکسەر
وەری گێڕی بەبێ نوختە ئەبێتە ڕوح لە دونیادا
کە بۆ ژینە لە ئینسان و مەل و پادار و بێ پادا
لەیەک تا پێنجی خورمایە بەڵێ تامدار و شیرینە
بەڵام خۆشتر هەیە خاڵە! لە لای تۆش زۆرە هەنگوینە
لە دوو تا چوار کە یەک کەوتن (وەرەم) دەردێکە بێ ئامان
کە تووشی هەر کەسێ بوو ئەیکوژێ بێ فایدەیە دەرمان
بەڵام سێ پیتی دوایی ماڵە بۆ شاو و گەدا ئاوات

وەکو سەعدی ئەڵێ: سەتتاری عەیبە و (قاضي الحاجات)
یەک و پێنج و شەشی کێیە ئەوەندە خۆشەویست، خاڵە
وەکی تر داغی دڵدارە نیشانەی ڕوومەتی ئاڵە
لەسێهەم پیتەوە تا شەش ئەوە (رمّال)ە تالع گەر
بەڵام عەیبی نەبێ پاداشی لای کامتانە تۆ و زێوەر
ئەگەر لای خۆتە تێرمان کە ژەمێ خۆم و بلە و گۆران(١)
بەڵام گەر لای جەنابی زێوەرە ڕێکی ئەخەین خۆمان

(١) خۆم: ئەحۆڵ: ئەحمەد دەروێش
بلە: مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد
گۆران: مامۆستا عەبدوڵڵا گۆران

## جوابی مەتەڵ*

جوابی مەتەڵ شارێکی خۆشناو
وەهات عەرز ئەکەم ئەی حورمەت گیراو
لە شاری کوردان (جەننەتی ثانی)
ئەگەر حەز ئەکەی ئەتۆ بیزانی
ئەووەڵی (بێ)یە ئاخریەکەی (هێ)یە
بەهـ چەندە خۆشە! (بانە) ئاوا بێ
با، بۆ (موثبەتە)، (نە) بۆ مەنفییە
بانە دوو هیجا و چواری حەرفییە
ئەووەڵی لابەی ئانەی قیمەتدار
دیواری بڕمێ بنە قووەتدار
(هێ)ی لێ لابەری بانێکی بەرزە
یاخوا مەحفووظ بێ لە بەڵا و تەرزە
سەر هەڵوەشێن قیمەت ئەبەخشێ
دیوار بڕمێنی قووەت ئەبەخشێ
گەر بێ بناغەی هەڵگێڕی و گوم بێ
ناوی بڵندی ئەو وەختە هەڵدێ

..........................................................................

* لە ل ١٢٥ی سۆزی نیشتمان دا نووسراوە: کە لەژمارە یەکی گۆڤاری دیاری کوردستان ساڵح زەکی بەگی ساحبقران ساڵی ١٩٢٥ی م مەتەڵێکی جوانی نووسیبوو مامۆستا زێوەریش بەشیعر جوانی وەرام داوەتەوە جارێ ئەمە مەتەڵەکەی ساڵح زەکی بەگە:

شارێکی خۆشناو موثبەت و مەنفی
لەم سەرو لەوسەر مەعنای دوو حەرفی






## خانەنشین*

مووددێکە کە مەحکوومی گەلێ ناکەس و کەس بووم
وەک بولبولی کەم دانەیی ناو کونجی قەفەس بووم
مەحکوومی هەموو نەوعە موفەتتیش کە دەهاتن
گۆیا (وسوواغا)ن و منیش عەینی حەرەس بووم(١)
تەسدیقی بەیاناتم ئەکردن کە درۆش بوو
دوو ڕوو سیفەتیم گرتبوو وەک عەینی عەدەس بووم(٢)
سەد شوکر نەجاتم بووە سەربەستم و ئازاد
شاهێن نەظەرم ئێستە کە جاران کە مەگەس بووم(٣)

..........................................................................

* مامۆستا زێوەر ئەم شیعرەی بەبۆنەی خانەنشینی خۆیەوە ساڵی ١٩٤٠ی ز. گوتووە. شیعرەکە ئاوێنەیەکە بۆ تاقیکردنەوەی ژیانی وەزیفی شاعیر خۆی. نارەزامەندیی خۆی بەرامبەر ئەو ژیانە تاڵە دەربڕیوە گلەیی خۆی لە ڕۆژگار دەکا، چونکە هیچ کاتێک زەمانە بەئاوات و ئارەزووی شاعیر نەبووە.
(١) وسوواغا پیاوێکی ئازا و دلێر بووە ئەوکاتە سەرۆکی پاسەوانان بووە.
(٢) عەدەس: نیسکە لە پەندی پێشینانماندا نیسک کراوە بەنموونەی بێ باری ئەگەر کەسێک بێ بار بێ و دووڕوو بێ دەڵێن: وەکو نیسک وایە بەر و پشتی لێک جیاناکرێتەوە.
(٣) شاهین نەظام: واتە ڕوانینم وەکو شاهین وایە.
شاهین: پەلەوەرێکە لە شێوەی هەڵۆ چاوی یاری پێ دەشوبهێنن لە توانای ڕاوکردنی دڵی دڵداراندا.

## پردی وەتەن*

وا تەواومان کرد پردی (تەگەران)
بەسەریا بڕۆن گەلی هاوسەران
پردێکی تریش بۆ (قەڵا چوالان)
نۆرە دێتە سەر (سیوەیل و ئالان)
پۆستەی شارباژێڕ ئیتر ئاو نایبا
ڕەنجی مەلەوان دراوە بە با
زستان و بەهار ڕێگا بەندان بوو
مەئمووری چوارتا ئەهلی زیندان بوو
ئێستا وا ڕێیان بۆ کرایەوە
تەنها پردێکی سیوەیل مایەوە
ئەویش بەخێری دێتە کایەوە

مـــسكێن زاڵـمی لێ تەکـــایەوە
بەفـری سـەر (گـمـۆ) وا تـوایەوە(١)
هەژار لە بێگار وا حـــەســـایەوە
(ئەدهەم) لەم دەشـتـە لەبەر هەتاوە
ئەچەوسـێـتـەوە هێـزی نەمـاوە
قـەی ناکـا با ئەو بسـووتێ خـاوە
بەڵام خـزمـەتی هەر لە پێش چاوە
بـا ئـەو وێـران بـێ وەتـەن ئـاوابێ
فـیکری هەمـوومـان وا چاکـە وابێ

........................................................

* زێوەر ئەم شیعرەی بەناوی (ئەدهەم ئەفەندی)یەوە لە ژینی ژمارە٦٠٩ بڵاوکردۆتەوە. ئەدهەم ئەفەندی مامی فایەق هۆشیار و ئەحمەد زرنگە بووە، ئەو کاتە سەرپەرشتی دروستکردنی پردی تەگەرانی کردووە.
(١) گمۆ: چیایەکی بەرزە کەوتۆتە ناوچەی شاربازێڕ لە پارێزگای سلێمانی.

## نامەوێ...*

نامـەوێ گـۆشـتی لات و بزنی گـەڕ
منەتی شـێخ جـەمـیل بەکـێری کـەر
خـواردنی ئێـمـە تا کـەوی جەبەلە
سەد کەڕەت گووی خلە بەگۆشتی بلە
مـیر عـەلی دەستی وا بەکـەو فـێرە
تا پشـیلەیش لە گـۆشتی کەو تێرە

........................................................

* ئەم شیعرە بەعینوانی «شەش باڵی»یەوە لە لاپەڕە ٢٤٦ی کەشکۆڵی (أ) هەیە و لە سەرەتایەوە نووسراوە «ساڵی ١٩٤٠ی ز. کە مامۆستا زێوەر لە بەرزنجە مامۆستا بووە فەرموویەتی.

## ماڵ جوێ کردنەوە*

١٩٢٤

یابە! فەرزەن تۆ شای سەر زەمینی
ڕازیم بەبەشی خۆم و مسکێنی
دیجلە و فوراتت با هەر بۆ خۆت بێ
منیش کوردستان شاخی ڕەنگینی
هەواکەی شاهۆ، ئاوەکەی قەندیل(١)
لائەبا لە دڵ ئێشی برینی
قەت ڕێک ناکەوێ دەست لەمل یەک کەن
حەنتووش دەلاوی و ڕەسووڵ سیرینی
من لام باش نییە سواری شانم بی
وا عەرزت ئەکەم هەر بەشیرینی
خورمای خۆت بۆ خۆت مێوژم بۆ خۆم
(لکم دینکم ولي ديني)

..........................................................

(*) ئەم شیعرە لە لاپەڕە ٣٥-٣٦ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە ڕووبەڕووی مەلیک فەیسەڵی یەکەم لە شاری سلێمانیدا خوێنراوەتەوە.

(١) شاهۆ: شاخێکە لە هەورامان.

## ئەی شەماڵ*

ئەی شەماڵ! ئەی شەماڵی شاخی شیمال!
ئەی فیدای جیلوە و شنەت سەر و ماڵ
حورمەت و حەسرەتی منی بەدحاڵ
بگەیێنە بەشاخی باخی میشال
جارێ ئیفایی ڕەسمی تەعظیم کە
بۆسەیی لاتەناهی تەقدیم کە(١)

**

چونکە ئەو شاخە زەوقی مییللییەت
عەشق و سەودا و خەیاڵی حوڕڕییەت
تیا دەژی فیکری بەرزی کوردییەت
لە بەهەشت زیاترە بەقودسییەت(٢)



چونکە ئەو شاخە بەرزە گوڵگوونە(٣)
مەعدەنی ڕۆحە شاخی ئاڵتوونە

**

تورک ئەڵێ: قەبری کوردە ئەو شاخە
بام بڵێ، چونکە باطینەن باخە
باخی مەردانی چوست و گوستاخە
جێی وەطەن پەروەری جگەرداخە
تورکەکان نەشئەیان دەرئاغۆش کرد(٤)
بۆچی تەئریخیان فەرامۆش کرد

**

هەر فیدائی لە ئینقیلابا چوو
پێی مەڵێ مردووە بڵێ زیندوو
چونکە بێ شوبهە مووەتێکی زوو
شێری مەیدان لە نەسلی پەیدابوو(٥)
قارەمان و دلاوەرانی پەسین
وەتەن ئیحیا ئەکەن بەعەزمی مەتین(٦)

**

گڵ و بەرد و درەختی خون ئالوود(٧)
میللەتێکی جەسیم ئەخاتە وجوود(٨)
ناصیری کوردە حەزرەتی مەعبوود(٩)
کوردی مەزڵوومی دەستی تورکی عەنوود(١٠)
ماڵ و منداڵی کوردی بێ چارە
بام پەرێشان کرێن و ئاوارە

**

ئەی شەماڵ! پێی بڵێ: لە بەعدی سەلام(١١)
بەرزتری تۆ لە عەرش و کورسی لە لام
قابیلی تۆیە حورمەت و ئیکرام
نووری تۆ نووری مانگ و ڕۆژە تەمام
مەئمەنی خاصی قەومی کوردانی(١٢)
ئەبەدیی مەنزیلی شەهیدانی

**

ئوفــوقت ئەرخــەوانییــە کــە بەهار(١٣)
ڕەنگی ســوورت شــەفــەق ئەکــا ئیظهــار
ئینعــــیکاسی تەصــــادومی ئەنوار(١٤)
تاجی قـەوس و قــەزەح ئەکـا بەنیـشـار(١٥)
لالـە زارت کـــــە ســــــوور و ڕەنگـینـە
عــەکــسی خــوێنی شــەهیــدی ڕێی دینە

**

ئەو مــەقــامــە، مــەقــامی، لاهووتە(١٦)
ســورمــەیی چاوی قــەومی مـەبهــووتە(١٧)
جــــێی زیاراتی ئەهلی ناســـــووتە(١٨)
ئەو گـــــڵــــە بۆ حــــەیاتی دڵ قـــــووتە
کـــــورد نەڕەنجێ لە خـــــوێـنی ڕێژراوی
نەخـــشی ســـەر ڕۆحــە بەردی خــوێناوی

**

قــەومی صــاحــێب مــەتانەت و بەثەبات
چونکە بێ قــەدرە لای هەوای حــەیات(١٩)
حـورمـەت و غـیـرەتی ئەکـا ئیـثـبـات(٢٠)
باقـیــیە عـەزمی تاکـو ڕۆژی مـەمـات(٢١)
عــاقــیبــەت شـاخی بەرزی کــوردســتــان
عـــەلەمی کـــوردی تیـــا ئەکـــا جـــەولان

..........................................................

* مامۆستا زێوەر ئەم شیعرەی بەهۆی ڕووداوە خوێناوییەکانی ٢٤ی ئایاری ساڵی ١٩٢٥ی ز گوتووە کە ئەو هەموو ناودار و مەزنە پیاوانەی کورد لە تورکیا لە سێدارەدران و ئافرەت و منداڵ و پیر و جوانی کورد بەنووکی سونیەوەکران و خانوو بەرە و گوند و شارۆچکە و شاریان بەدەستی کـەمالییـەکـان سووتێنرا و خاپوور کرا خەڵکەکەشی دەربەدەر کران و وڵات کوندەبەبووی تێدا خوێند.

شایانی باسە کە ئەم شیعرە لە ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان)ی ژمارە ٣٠ی ساڵی ١ی ١٩٢٥/٧/١٠ بڵاو کراوەتەوە لە لاپەڕە ١٧-١٩ی سۆزی نیشتمانیشدا چاپ کراوە هەروا لە ل٢٤٢-٢٤٤ی کەشکۆڵی نەجمەدین مەلا- کە لە کتێبخانەی ئەوقافی مەرکەزی لە سلێمانی نمرە ٣٩ پارێزراوە - نووسراوەتەوە شەش دێری سەرەتاییشی واتە یەکەم تا شەشەم لە ژمارە ١ی گەلاوێژی ساڵی ١٠ی ١٩٤٩ی ز. لەگەڵ ژینامەی شاعیردا بڵاو کراوەتەوە.

(١) واتە جارێ پێش هەموو شتێک دابونەریتی چوونە لای گەوران چۆنە بەتەواوی بەجێی بێنە ئەم جار دەست بکە بەماچ کردنی یەک لە دوای یەک.

(٢) قودسییەت: ڕێز و نرخ، پیرۆزی.





(٣) گوڵگوونە: گوڵ ڕەنگ.
(٤) دەرئاغۆش کرد: گرتییە باوەشی.
(٥) لە کەشکۆڵی نەجمەدین مەلا و سۆزی نیشتماندا نووسراوە (شێری مەردان) لە نەسلی پەیدابوو.
(٦) ئیحیا: إحياء: ئاوەدانکردنەوە. مەتین: قایم و قۆڵ.
(٧) خوون ئالوود: خوێناوی.
(٨) جەسیم: جسيم: گەورە و مەزن.
(٩) مەعبوود: خوای پەروەردگار.
(١٠) عەنوود: عنود: سەر ڕەق و سەرپێچی کەر.
(١١) لە بەعدی سەلام: لە دوای سەلام.
(١٢) مەئمەن: مأمن: جێگای ئاسایش و ئارام.
(١٣) ئوفوق: أفق: ئاسۆ.
(١٤) ئینعیکاس: إنعكاس: ڕەنگدانەوە. تەصادوم: تصادم: لێککەوتن، بەیەکدادان.
(١٥) قەوس و قەزەح: پەلکە زێڕینە، شۆقە زێڕینە. نیثار: بەقوربان بوون.
(١٦) لاهووت: زانستییەکە پەیوەندی بەخودا و خودا ناسینەوە هەیە و باسی شتی غەیرە ماددی دەکا بەپێچەوانەی ناسووتەوە کە هەر باسی شتی ماددی دەکا و لە سروشت و مرۆڤ ئەدوێ.
(١٧) مەبهووت: سەرسام.
(١٨) ئەهلی ناسووت: مرۆڤ.
(١٩) هەوای حەیات: ئارەزووی ژیان.
(٢٠) ئیثبات: اثبات: چەسپاندن.
(٢١) مەمات: ممات: مردن.

## ئەم کوردە*

ئەم کـوردە عـەجـەب ساحێبی بەختێکی زەبوونن
هێشـتـاکـو ئەڵێی داخـڵی سـەحـرای نەبوونن(١)
نانێ بەدووســەد ســینەیی ســۆزان کـە پەیا کـەن
بێ بەهرە لەویشن بەمـەسـەل عـەینی فـروونن(٢)
بێ بەش لە هەمـوو نیـعـمـەت و ئازادیی عـالەم
پامـاڵی جـەفـای دەهرن و مـەنفـووری عـوبوونن
بۆ قـۆندەرە و قـەمـچـیی زاڵم هەمـوو لەشـیـان
خـاراوە لە پێـسـتـا وەکـو گـامێـشی چەتوونن
ئەقـوامی زەمین سـاحـێبی ئاڵـتوون و قـصـوورن
ئەم کوردە لەبەر زۆریی قوصوور ماڵیکی توونن(٣)
هەر مـیللەتێ قـەدی بوو بەئەلف پیـر و جـەوانی
هەر قـەومێ وەنەوشە و گـوڵە وا قـەد وەکـو نوونن

کەس کەشفی نەکرد سیرڕی دەروونیان لە جیهانا
بێ شەرح و بەبێ حاشیە وەک کۆنە متوونن
سەررای ئەوە دوژمن بەیەکن جوملە عەشیرەت
حەقیانە ئەڵێن کورد هەموو مەحکوومی جنوونن
ئەم حاڵە دەوامێکی تەبیعی هەیە بۆ کورد
تا غافڵ و بێ بەهرە لە عیلم و لە فنوونن

..........................................................................

* ئەم قەسیدەیە جگە لە شیعری شەشەم – لەگەڵ کورتە ژینامەیەکی شاعیر لە گۆڤاری گەلاوێژی ژمارە ١ی ساڵی ١٠ی ١٩٤٩ی ز. دا بڵاوکراوەتەوە لە لاپەڕەکانی ١٠٦–١٠٧ی سۆزی نیتشمانیشدا چاپ کراوە چ جیاوازیەکمان لە نێوان ئەم دوو سەرچاوەیەدا بەدی نەکرد.

(١) زەبوون: لاواز و بێ تین.

(٢) فروون: کۆی (فرن)ە بەمانا تەندوور و شتی وا.

واتە: چۆن تەندوور بەسینگ سووتاوی و هەزار دەرد و ئازار نانێک پەیدا دەکا کەچی لەگەڵ برژاندی خێرا ناهێڵن سوودی لێ ببینێ نانەکەی لێ دەکەنەوە و دەری دەهێنن بەو جۆرە گەلی کوردیش بەهەزار ناڕەحەتی تا شتێکی دەست دەکەوێ کەچی لەگەڵ هاتە بەرهەم خێرا لێی داگیر دەکەن و لێی بێ بەهرە دەبێ.

(٣) (قوصوور)ی یەکەم کۆی (قصر)ە بەمانا خانوو باڵەخانە. (قصوور)ی دووەم بەمانا کەمتەرخەمی و نەفامییە. مالیکی توونن: واتە خاوەنی توونی حەمامن.

## کوردە ڕۆژی غیرەتە*

کوردە ڕۆژی غیرەتە، لەم ڕۆژە ویجدانت ببێ
تۆ، کە ئیسلامی شوکور، کردەی موسوڵمانت ببێ
کوردە! ناوت کەوتە ناو ناوانەوە، گوێ ڕاگرە
لازمە بۆ تۆش بەدایم کردەوەی جوانت ببێ
دەرحەقی هاوشەهریی و هاومەذهەب و هاودینەکەت
ئیقتیدارت گەر هەیە ئینعام و ئیحسانت ببێ
دەس لە بێ ئینصافی هەڵبگرە ئەگەر مەردی بەناو
ڕەحم و ئینصافت لەگەڵ زومرەی فەقیرانت ببێ
گەر قەصابی یا بەقاڵی، یا عەلافی یا توجار
خۆت بەلەعنەت قەت مەکە باوەڕ بەقورئانت ببێ
چەند هەزار دینار ئەکەیتە مەصرەفی قەصر و بینا
باوەڕت بێ بۆ دە دوازدە ساڵە ئیمانت ببێ





پارەکەت وا بوو بەبارێ لیرە تۆ نایبەیتە گۆڕ
شەرتە بۆ ڕێگەی قیامەت تۆشەو و نانت ببێ
کوردە قەومی تۆ ذەلیلە تۆش بە سەودا مەیکوژە
میللەتی خۆ خۆر مەبە ئەخلاقی ئینسانت ببێ
گرد و دەشت و کێو ئەکێڵی سەعی ئەکەی بۆ چارەکێ
یەک دەقیقەش یادی چوونە گردی سەیوانت ببێ
تاکو مومکین بێ درۆ و ناڕاستی و غەشەشت نەبێ
ڕووی خەندان، خوڵقی مەردان، فکری چاکانت ببێ
کاسبی و قازانج و تێکۆشین پەسەندی عالەمە
نەک بەجارێ پشت لە حەق کەی مەیلی شەیطانت ببێ
تا، بەئومێدی وەظیفەی، ئەی جوان هەر ڕاسیبی
عەشقی عیلم و مەشقی حیلم و شەوقی عیرفانت ببێ
عیلمە ئەتخاتە مەقامی بەرز و جێگەی ئیفتیخار
عیلمە بۆت نێزیک ئەکا گەر فیکری کەیوانت ببێ
ساڵی سەعی و غیرەتە ساڵی وەفاو و ڕەحمەتە
تۆ کە نەیبەخشی چ سوود مولکی سولەیمانت ببێ
نوێژ و ڕۆژوو و حەج و عەمرە نەفعی هەر بۆ خۆت هەیە
خۆت لە پەنجا نەوع ئەخۆی، یادێکی جیرانت ببێ

..........................................................................

* ئەم شیعرە لە ژینی ژمارە ٦٩٠ی ساڵی ١٩٤٢ی ز.دا بڵاوکراوەتەوە. هەروەها لە گۆڤاری گەلاوێژی ژمارەی ٧ی ساڵی ٩ی ١٩٤٨ی ز. لاپەڕە ٣٩–٤٠دا بڵاوکراوەتەوە.

## کێیە؟*

کێیە تا سەر لە فەضای دەرد و غەمابێ، مابێ(١)
ئەوە هەر کوردە کە چاوی لە هەوابێ، وابێ
هەر، سلێمانییە عیفریتی حەسەد سواری بووە(٢)
هود هودی خۆش خەبەرم گەر لە«سەبا» بێ، با، بێ(٣)
ڕاستی ڕێگەی ڕاستت ئەدەب و ئەخلاقە
نەمدی هەرگیز لەکەسێ ڕووی لە(کەچا) بێ چا بێ(٤)
مارە بۆ گەردن و ماڵت چ خومار و چ قومار(٥)
گەرچی باوە، ئەوە پیاوە، بەشەرابێ ڕابێ

ئەی وەتەن پەروەری تەن پەروەری پڕ لاف و گەزاف
ئەسەری خزمەتی تۆ چین، بەحیسابی سا بێ
چ زەمانێکە؟ زمانی تەڕ و پاراوی ئەوی
غایە و فیکری لە هەرکەس کە مەلا بێ، لا بێ
وەرە مەیدانی هونەر گەر ئەتەوێ بەرزیی وەتەن!
وەصڵی مەحبووبە بەبێ ڕەنج و عیتابی نابێ

........................................

* مامۆستا زێوەر ئەم شیعرەی ساڵی، ١٩٢١ وتووە لە گۆڤاری گەلاوێژی ژمارە ٨ی ساڵی ٩ی ئابی ١٩٤٨ی ز. دا بڵاو بۆتەوە، لە لاپەڕە ١٦-١٧ی سۆزی نیشتمانیشدا چاپ کراوە.
(١) فەضا: بۆشایی، دەشت، صەحرا.
(٢) عیفریت: دێو.
(٣) هودهود: پەپوسلێمانکە. سەبا: وڵاتی سەبەئە (سبأ) واتە ئەگەر پەپوسلێمانکە وەکو چۆن خەبەری بەڵقیس و وڵاتی سەبەئی هێنایەوە بۆ حەزرەتی سلێمان ئەگەر بۆ منیش خەبەرێکی ئاوا خۆش دێنێ بابێ بۆ لام و بۆم بگێڕێتەوە.
(٤) ڕووی لە کەچا بێ چابێ: واتە ڕووی لە کەچی و ناڕاستی بێ و چاک بێ.
(٥) خومار: سەرمەستی.

## بەناوی خوای گەورە و میهرەبان*

هیچ کەس نییە بەسۆزی دڵ و سینەم ئاشنا
شادم کە دڵ بەدەردی دەوای کوردە موبتەلا(١)
ناشکێ بەتۆپ و بۆمبا، سەر ئەفرازە قەومی کورد(٢)
لایق نییە بەتەبعی بڵندان درۆ و ڕیا
تابیع بەقەصد و حیسسی هەوایە حقووقی ناس
جەبرەن ئەسیری باطیلە حەق، وا کرا فیدا(٣)
حەقق و مرووەتێ نییە بۆ ئێمە، قەومی کورد
بۆ (ئەهلی) حەق موعینی ئەتۆ دائیم ئەی خودا
دنیا لە غەشش و حیرص و ڕیا و مەنفەعەت پڕە
ئالوودە پێ، فەزاحەتە، پابەندی ئیفتیرا(٤)
ویجدان و قەلب و حەوسەڵەی ئەم هەموو کەسە
ئای، وای، بەرد و ئاسنە، ناگرێتە گوێ صەدا!
مەغلووبی جەهل و فەقر و سەفالەت بووە موحیط(٥)
ئالایە بێخی میللەتەوە لەهبەی فەنا(٦)
هەر میللەتێ خەریکە حقووقی لە دەست گرێ
ئەم قەومە کۆنە بۆ نییەتی حەققی ئیعتیلا؟!(٧)



بێ غایە، بێ نەتیجە چلۆن گیان فیدا بکا
لایق مەبینە بۆ سەری ئەم میللەتە جەفا
بەستەی سیاسەتی دووە لە حاڵی زاری کورد
لەم بوعدی لاتەناهییە بێ شەوقە وەک سوها(٨)
مولک و حەیات و ثەروەتی ژێر باری ذیللەتە
لەم ظوڵمی بێ ئەمانە، خودامان بدا پەنا!
وا هەرچی عاطیلە ئەکرێنرێت و مەحو ئەبێ
بەم عەسری حازرە کە دەڵێن عەسری ئیستیفا(٩)
ئاه ئەی فەقیری بێ کەسم ئەی کوردی بێ خەبەر!!
ئەی طوعمەی مەصائیب و قەهر و شەڕ و جەفا(١٠)
بدرێنە، لادە، جامەی ژێر باری میحنەتت(١١)
ئەی کورد! بەعەزم و غیرەتی خۆت فەرزە ئیرتیقا(١٢)
بۆ خاتری ڕەزایی خوا و عەشقی ئەحمەدی
بەسیە نیفاق و بەسیە شیقاق و ڕق و ئەذا(١٣)
وا ئەرمەنی و یەهوودی حەقی گرتە دەستی خۆی
بۆ بۆ حقووقی شەرعیی خۆت ناکەی ئیددیعا(١٤)
ئیجاب ئەگەر سیلاحە، دەسا وەختی فرسەتە
حازر بە! گەر بەکوشتنە، ئیثباتی موددەعا(١٥)
هەر کەس خەریکی خزمەتی ئەهلی تەغەللوبە(١٦)
بێ دەنگ بووە حقووق و ناکەن کەمێ حەیا
ئەی گەورەکانی کورد و بەگ و میر و زابتان!
یەک بن هەموو تەوەققوفە لەم عەسرەدا خەتا(١٧)
ئەی شێخ و سەیید و عولەما یەک صەدایی حەق!!
بۆ ئینتیباهە لازمە «حَيّ على الصلا»
کورد هیممەتی بڵندی هەیە صەوڵەتی هەیە(١٨)
سا با، ئەویش لیوای حکوومەت بڵند بکا(١٩)
ئەڵبەت لە بەینی میللەتی کورد چەند (صەلاحەدین)
پەیدا بووە بەغیرەتە و ئەکمەل و دەها
حەققێکی ئیبتیدائی کە ئێستە نەسێنرێ
بۆ کورد لە عاقیبەت چ نییە نووری موقتەدا(٢٠)





کــورد ئاخــری مــوئەییــەدە، خــۆی حــاکــمــە و ئەمــیــیــر
لەم عـەزمـە ڕوحی حەزرەتـی (مەحمـوودە) پێشـەوا(٢١)

* ئەم هەڵبـەستە «جگەر خوێن» بەشێوەی کوردی بۆتان وتوویەتی، ساڵح زەکی بەگی صاحێبقران کە نازناوی (ئەمیییرە) کردوویەتی بەتورکی. زێوەریش کردوویە بەکوردی شێوەی سلێمانی (ن.م).
ئەم شیعرە لە لاپەڕە ٩-١١ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.
(١)موبتەلا: گیرۆدە.
(٢) سەر ئەفرازە: واتە سەربەرز. دەبێ لە کاتی خوێندنەوەدا (ئە) کە تۆزێک سووک بکرێ و (سەرەفرازە) بخوێندرێتەوە.
(٣) هەوا: هەواو هەوەس. (جەبرەن: جبـراً) واتە بەزۆرەملێ. واتە مـافی خـەڵک بەگـوێرەی هەوا و هەوەسی تاقـمـێک بەڕێوەدەچێ، حەق و ڕاستی دەست و پێ بەستراوی باتڵن و حەق بووەتە قوربانی ناحەق.
(٤) ئالوودە: تێکەڵاو بوو، تێهاڵاو. پابەند: پێ بەستراو. ئیفتیرا: درۆ هەڵبەستن و بوختان.
(٥) مەغلووب: ژێرکەوتوو، بۆڕدراو.
(٦) لەهبە: بڵێسە ئاگر. لەهبەی فەنا: واتە کڵپە ئاگری سووتێنەر.
(٧) حەققی ئیعتیلا: مافی سەرکەوتن و بەرزبوونەوە وە پێشکەوتن.
(٨) بوعـدی لاتەناهی: مـەسافـەییێکە کـۆتایی نەبێ، لێـرەدا مـەبەسـتی دنیـاییێکی پان و پۆڕە. سـوها: ئەسـتـێـرەیەکـە لە ئەستێرەکانی کۆمەڵی حەوتەوانە. (بنات النعش) لەبەر دووری و پچووکی نابینرێ.
(٩) ئیستیفا: استفاء: عەسری ئیستیفا: واتە ڕۆژگاری ماف وەرگرتن.
(١٠) طوعمە: خۆراک. مەصائب: بەلا و موسیبەت. قەهر: ڕق و کینە.
(١١) جامە: پۆشاک، کراس.
(١٢) ئیرتیقا: إرتقاء، بەرزبوونەوە و گەیشتن بەئامانج.
(١٣) نیفاق: نفاق: ئەوەیە شتێک دەرببڕی عەکسی ئەوە بێ کە لە دڵتایە. (شیقاق: شقاق): دوژمنایەتی و کێشە و نیزاع. ئەذا یان ئیذا (اذاء): ئازار دان، ئازار وەرگرتن و تەحەممول کردنی.
(١٤) ئیددیعا: إدّعا: داواکردن.
(١٥) ئیجاب: پێویست. ئیثباتی موددەعا: چەسپاندنی هەڵوێست.
(١٦) ئەهلی تەغەللوب: بەرەی سەرکەوتوو، ئیستیعمار و داگیرکەر.
(١٧) تەوەققوفە لەم عەسرەدا خەتا: واتە لەم ڕۆژگارەدا ڕاوەستان لە تێکۆشان و پاڵدانەوە خەتاییێکی گەورەیە.
(١٨) صەولەت: صولە، هەڵمەت و شاڵاو بردن.
(١٩) لیوا: (لواء)، ئاڵا.
(٢٠) واتە مافێک کە لە سەرەتاوە بۆ کورد نەسێنرێ و نەچەسپێنرێ لە دواییدا کە کار لەکار ترازا تازە چ ڕووناکییەک دەست ناکەوێ بیکەینە ڕێوشوێنی کەوین.
(٢١) موئەییەد: مؤیّد: یارمەت دراو. مەبەستی شاعیر بە (حەزرەتی مەحموود) شێخ مەحموودی حەفیدە کە لەو سەردەمەدا پێشەوا و زەعیمی ڕاستەقینە و دڵسۆزی کورد بووە و ژیانی خۆی تەرخان کردبوو بۆ خزمەتی گەل و نیشتمان و چەند جار دژ بەئینگلیـزە داگیـرکـەرەکـان جـەنگاوە و بەرەنگاریان بووەتەوە و برینداری و گـرتن و حـەپسـخـانە و ئاوارە بوون و شاربەدەرکردنی تۆزقاڵێک لە هەڵوێستی ڕەوای گەلەکەی نەهێنایە خوارێ.



## هاندان بۆ خوێندن و پێشکەوتن*

ئەی غـونچـەی ئومێـدی هەمـوو پیـر و جـەوان
بێـدارەوە بەوەخـتی جلیت بازیی و مـەیدان
عـالەم هەموو هەستاوە خەریکن هەموو مەردان
بشـکێنە بەبازووی هونەر تەوقی جـەهالەت
عـیلم و ئەدەبە مەرهەمی هەر دەرد و عـەطالەت
تۆ دەردی جـەهالەت بووەتە سـەددی ژیانت
یا شـوعلەی غـەم ئاگـرە بۆ ڕۆحی ڕەوانت
لەم کـەشمەکەش و حـادیثە بەسـتراوە زوبانت
بشـکێنە بەبازووی هونەر طەوقی جـەهالەت
عـیلم و ئەدەبە مەرهەمی هەر دەرد و عـەطالەت
دایکی وەطەن ئیـقـبـاڵی بەئیـقـبـالی ئەتۆیە
چاوی لە تەڕەقـقی و هەمـوو ئامـالی ئەتۆیە
ڕوشـدت کـە ببێ خـەزنەیە وا مـاڵی ئەتۆیە
بشـکێنە بەبازووی هونەر طەوقی جـەهالەت
عـیلم و ئەدەبە مەرهەمی هەر دەرد و جەهالەت

* ئەم شیعرە بەناوونیشانی سەرەوە لە لاپەڕە ٤٥-٤٦ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.

## مەعاریف*

مـەعـاریفـە کـە بڵندیی ئەدا بەقـەومی هەژار
جـەهالەتە کـە دەکـا مـەحـوی سـیلسـیلەی تاتار
فنوون و عـیلمـە کـەوا بۆتە باعـیـثی ئیـقـبـاڵ
جـەهالەت و حـەسـەدە بۆتە مـەنشـەئی ئیـدبار
برادەران و ڕەفـیـقـانی خـۆم مـەبن غـافڵ
لە تـەربیە و ئەدەب و سەنعـەتێکی باش و بەکـار
وەتەن وەتەن وەکـو «کـوکـوُ»ی کـۆترە باریکە
ببـێـتـە ویردی زوبان و دڵت بەلەیل و نەهار
بەمـاڵ و دەوڵەتی دنیـا مـەنازە ئەی حـاجی!
بینای مـەکـتـەب و پردێ حـیسـابە ڕۆژی شـومـار

حەیاتی ئێمە حەواڵەی سەخای ئەشرافە
که گەورە لوطفی نەبێ قورِ بەسەر سەفیل و صیغار

.........................................................

* ئەم شیعرە لە ڕۆژنامەی بانگی کوردستان ژمارە ٦ی ساڵی ١ی ١٨ی ١٩٢٢/٩ی ز. بەناوی شاگردی مەکتەب: فایەق زێوەرەوە بڵاوبۆتەوە لە لاپەڕە ١٤-١٥ی سۆزی نیشتمانیشدا چاپ کراوە.

## فەلسەفە*

١٩٢٢

چاوەکەم حوسنت زیاد ناکا بەلاپێچی سەرت
کافییە بۆ صەیدی دڵ غەمزە و نیگاهی دڵبەرت
تۆ زوبانت تیژ بکە بۆ جەلبی قەڵبی عالەمێ
فائیدەی ئێستا نەماوە نووکی تیژی خەنجەرت
مادەری پیری وەطەن ئوفتادەیە و بێ دەستەڵات
نەوجەوانا! خزمەتێ بنوێنە دەرحەق مادەرت(١)
ئەی مودەڕڕیس عیلمی دین و فەننی دنیام پێ بڵێ:
تا ڕەواجی بێ لە لای ئەم خەڵکە جوببە و مێزەرت
ڕێگەیێکم پێ نیشان دە پێی بژیم لەم عەصرەدا
وەرنە من باوەڕ ئەکەم زاهید! بەڕۆژی مەحشەرت(٢)
پێی دەڵێن: ئەم عەصرە عەصری ئینتیباه و ئیرتیقا(٣)
تۆیش کەچی هەر نووستنە هەر ڕاکشانە جەوهەرت
تۆ کە ماری پێوە داوی چاری تریاکێ بکە(٤)
کەی شیفایە ناڵە ناڵ و کەوتنی سەر بوستەرت(٥)
تا هەوای سەیری موغەننی و نەغمەیی تارت ببێ
ڕۆژی ڕووناکت شەوێکی تازە نەحسە ئەختەرت(٦)
ڕێگەیێ باشت نیشان دەم. تۆ لە جێی تاقە و غەزەل(٧)
ئیفتیخارە گەر لە بەرکەی شیعری باشی (زێوەرت)

.........................................................

* شاعیر ئەم شیعرەی بەناوونیشانی فەلسەفەوە ساڵی ١٩٢٢ی زایینی وتووە لە لاپەڕە ٢٤-٢٥ سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە. لە(ژین)ی ژمارە ١٠٨٣ی ساڵی ١٩٥١ی ز. دا لەگەڵ کورتەیەک لە ژیانی شاعیر و وێنەیەکی کوردانەیدا بڵاو کراوەتەوە.

(١) مادەر: دایک، مەبەست نیشتمانە.

(٢) زاهید (سۆزی نیشتمان)، واعیظ (ژین).





(٣) ئینتیباه: انتباه: هۆشیار بوونەوە.

ئیرتیقا: ارتقاء: بەرزبوونەوە و پێشکەوتن.

(٤) تریاک: دەرمانی زەهر و مارەنگازی.

(٥) بوستەر: وشەیەکی فارسییە واتە سەرین.

(٦) نەحس: شووم، ئەختەر: ئەستێرە.

(٧) تاقە: جۆرە خشڵێکی ئافرەتە لە دراوی زیو دروست دەکرێ یا دانە دانە بەکڵاوی سەرەوە ئەچەسپێنرێن و پێی دەگوترێ کڵاوەسەر. یان بەزنجیرە بەلاسەرەوە هەڵدەواسرێ پێی دەگوترێ لاگیرە.

غەزەل: شیعری دڵداری بەڵام لێرەدا بەمانای پارچە قوماش بەکارهاتووە. نالی دەفەرمووێ:

قوربان وەرە با ئەم غەزەلە تازە لەبەر کەین
عیزز و شەرەفی نالییە تەشریفی قەدی تۆ

## سەر زەنش*

ئەگەر بۆیا و پۆدرە هەڵبگیرێ ئەم فرۆفێڵە
گەلێ جوان ئیختیارە، زۆر سمێڵ وەک ئەسپەرەی بێڵە
موجەسسەم بێ ئەگەر دین و حەمییەت سووڕەتێکیان بێ
گەلێ دێن شکڵی مەیموونە گەلێ شێریش وەکو دێڵە
لەگەڵ خەڵک و لەگەڵ خالیق بەمەردی بێرە ناو مەیدان
سەداقەت ڕێی سەعادەت بێ، چ سوود ئەم چەوتیی و چێڵە
بەغەیرەز قەومی کورد مەحروومی سەعیێ هەمدەمی غەفڵەت
هەرچی قەومێ شعووری بێ لە سەحرای کۆششا وێڵە
چەکی هەر میللەتێ عیلمە و مەعاریف، بۆ ژیانی خۆی
لەناو ئێمەیش -خوا فەوتی بکا- جەهلە چەکی خێڵە
زەمینت سەختە مەوزووعت نەتیجەی تازە نابەخشێ
نە، زیهنت کول بکە، نەخامە، ئەم مەیدانە مەیکێڵە!!

.........................................................

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١٠٨ی سۆزی نیشتمان دا چاپ کراوە.

## کوردێکم ئەوێ

کوردێکم ئەوێ زرنگ و چالاک
بۆ مووددەعی چوست و بێ باک
کوردێکم ئەوێ کە ڕۆژی ئەمڕۆ
جێ خەنجەرەکەی نەکا بەسیواک

کـــوردێکم ئەوێ بەهۆش و دانش
بۆ وەزعی زەمـانە خـاوەن ئیـدراک
کـــوردێکم ئەوێ نەکـا مـــەرایی
بۆ خاوەنی فلس و مولک و ئەملاک
کـوردێکم ئەوێ کـە خـواش بناسێ
ئیـمــانی ببێ بەشــاهی (لولاک)
کـــــوردێـکم ئـەوێ نـەبێ بـەدایم
مەشغولی خەو و خەیاڵ و خۆراک
کـوردێکم ئەوێ کـەمـال و فـیکری
لای مـیللەتەکـەی بگاتە ئەفـلاک
کـــوردێکم ئەوێ کـــەوا نەترسێ
هەرگـیز لە وەزیر و میـری سەفـاک
کـوردێکم ئەوێ کـە هێــزی وابێ
بێگانە بخـاتە سـەر زەوی و خـاک
کـــوردێکم ئەوێ لە ڕێی وەتەندا
بێ غـەش بکەوێتـە خزمـەتی چاک
کـــوردێکم ئەوێ هەمـــــوو براب‌ن
هیـچ فـەرقی نەکـا نەبـاب و نەداک
گـــــەورە بەبچـــــوک بـڵێ براله
چوکەش کە بەگەورەکەی بڵێ کاک
بەم ڕەنگە ئەگەر دەستم کەوێ کورد
بێ گـیـانی ئەکـەم هەزار زوحـاک

ڕۆژی نوێ ژمارە ٤ ساڵی ٢ لاپەڕە ٧٨

**لەم وەختە***

لەم وەختە کە پڕ فیـتنە و ڕێ بەستنە ئێـستـا
خـۆشی کـە ببێ مـردنە، یا نووسـتنە ئێـسـتـا
دوو یاری وەفـادار و بەبێ غـەش نیبیە هەرگـیز
هەرچی کە تەمـاشای ئەکەم دوشمنە، ئێستـا



ئاشووب و بەڵا و فیـتنە وەکو و تەرزە ئەبارێ
هەر جـەردەیی و هەر دزیی و کـوشتنە ئێـسـتـا
فـەرقێکی لەگەڵ شیعە نەما مەذهەبی سوننی
هەر گـرتن و لێ بردن و تێ خـسـتنە ئێـسـتـا
لەم شـارە کـەوا مـەنبـەعی ئاشووب و فـەسادە
دەرمـانی شـیـفـای خەسـتە دڵان ڕۆینە ئێسـتـا

........................................................

* زێوەر بەم شیعرەی لایەنێکی زۆرداری و ئاشووبی سەردەمی عوسمانییەکان دەردەخا. وەکو ئاوێنەیەکی باڵانوما هەموو ئاژاوە و نەخۆشی دز و جەردەیی ئەو ڕۆژگارەی تێدا دیارە.
ئەم شیعرە لە لاپەڕە ٥٢-٥٣ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە. دوو دێر شیعری یەکەم و دووەمیشی لە گەلاوێژی ژمارە ١ی ساڵی ١٠ی ١٩٤٩ی ز. لەگەڵ ژینامەیەکی کورتی شاعیردا بڵاو کراوەتەوە.





## لابده پەردە*

لابده پەردە، ئەی گوڵی ڕەعنا!
دەرکەوێ با دوو نێرگسی شەهلا
یا دوو لەعلی عەقیقی بێ هەمتا
تا بە جان ئێمە بێینە سەر سەودا
کائیناتێ ئەخەیتە وەجد و تەرەب(١)
بەتەماشایی ماهەکەی نەخشەب(٢)
وەه چ خۆشە شەهدی گوفتارت(٣)
هەی لە جیلوەی بەنازی ڕەفتارت
بەه لە غەمزەی دوو چاوی سەحەرت(٤)
بارەکەڵڵا لە حوسن و ئەنوارت(٥)
سوپەرت بێ هەمیشە هیممەتی غەوث(٦)
حافیزی چاوی بەد، کەرامەتی غەوث
تۆی شەهەنشاهی حوسن و ساحێب تاج
حازرن شاهیدان بەجیزیە و باج(٧)
هەموو تەسلیمن و نیانە عیلاج
هەر بەتۆ لایقە عەتایی خەراج(٨)
مەجلیسی تۆیە بارەگاهی فەرەح
دوور لە ڕووی تۆیە خوابگاهی تەرەح(٩)
ئەی بتی شۆخ و نازک و گوستاخ(١٠)
نەفەسێکم نییە بەبێ سەد ئاخ
بوومە مەجنوونی دەشت و سەر کەل و شاخ
چاوەڕێی لوتفم ئەی بە ڕوو گوڵەباخ
مەرحەمەت کە بەناڵە و فەریاد
بە جەفا مەمکوژە وەکو فەرهاد
چەند خۆشە لە فیرقەتا کاغەذ
وەرگری تۆ لە پۆستەدا کاغەذ
وەک شیفایە لە هیجرەتا کاغەذ
نیصفی وەسڵە لە میحنەتا کاغەذ



خەبەری دولبەری شەکەر گوفتار(١١)
وەک تەداوی حەکیمە بۆ بیمار
صەیدی کردم بەداوی غەمزە و ناز
دولبەری چیهرە ئەسمەری چاوباز(١٢)
دولبەرانیش ئەخاتە بەحری نیاز
شاهبازێکە زۆر بڵند پەرواز(١٣)
وەنییە هەر شێتی عەشقی من بم و بەس
سارییە دەردی عەشقی بۆ هەرکەس
شوعلەی حوسنی دلبەری مەهوەش(١٤)
دڵی کردووە بەکوورەی ئاتەش(١٥)
کەس نەناس و بەدەعیە و سەرکەش
لە هەموو لوتف و مەرحەمەت بێ بەش
لەکەفی دا دی جەوری، دووره خەلاص(١٦)
عادەتی کوشتنە بەغەیری (قیصاص)
نییە هاوڕەنگی تۆ لەسەر ڕووی ئەرض
گەر بەسەریا بڕۆی بە طوول و عەرض
چۆن نەبێ میهری تۆ لەسەرمان فەرض(١٧)
بە زوبان دێم ئەکەم تەشەککیم عەرض(١٨)
لە جەفای عاشقان بەسە ئیفراط(١٩)
نۆبەتە بۆ وەفا و عەیش و نیشاط
با نەڵێن خەڵکی عاقڵە و واعیظ(٢٠)
عالمی چاکە عادلە واعیظ
چونکە لای ئێمە جاهیلە واعیظ
گوفتوگۆ و وەعزی باطلە واعیظ
مەسلەکی عاشقانە وەجد و سەماع(٢١)
بەهەزار وەعظ ناکرێن ئیقناع
خۆشە فەسڵی بەهار و دیدەنی باغ
نەغمەی بولبولان لە گوڵبەنی باغ(٢٢)
سەیری ئەشجاری بەرزی مەعدەنی باغ
سەیری ئارایشی مولەووەنی باغ

غایەتی بێ حەبیب ئەبێتە ئەسەف
شەوقی عومرت هەموو ئەچێ بەتەلەف(٢٣)
ماهی من ظاهیرە لە ناو ئافاق(٢٤)
دائیما بەدرە، ناکەوێتە میحاق(٢٥)
حوسنی ئەو عالەمێکی خستە مەراق
کەس نەماوە کە بۆی نەبێ موشتاق
شوهرەتی حوسنی گەییە عەرش و فەلەک
بوونە خەددامی، بارەگاهی فەلەک
ئەی مەهی ئاسمانی حوسن و جەمال(٢٦)
لە غەمی بەدری رووتە بوومە هیلال(٢٧)
ئەو کەسە بۆتە صاحێبی ئیقباڵ(٢٨)
کە نزیک بێتەوە لە بەزمی ویصاڵ(٢٩)
هەر غەمی تۆیە بۆتە هاو دەردم
زەربەی عەشقە چیهرەی زەردم(٣٠)
هەروەکو ئەهلی بێ میزاجە زەمان
مەسلەکی ثابتی نییە بۆ مان
دەردی دنیایە ناکرێ دەرمان
مەر لە دنیا ئەجەل بکا دەرمان(٣١)
خەڵەفاوین لە ئافەتی، من و تۆ
بەش براوین لە نیعمەتی، من و تۆ
دولبەری شۆخ و شەنگی دیدە سیاه(٣٢)
گەه بەغەمزە گەهێ بەتیری نیگاه
عاشقانی بەبێ خەتا و گوناه
هەموو خستۆتە دەرد و ناڵە و ئاه
دوورە بۆ دولبەران وەفاکاری
سەهوە بۆ نائومیدەگان زاری

..........................................................

* ئەم شیعرە لە کەشکۆڵی نەجمەدین مەلا (أ) بەشی دووەم لاپەڕە ١٢٣-١٢٦دا چاپ کراوە. شایانی باسە ئەم شیعرە سەرەواکانی هەموو پیتەکانی هیجایی لە خۆگرتووە. لەبەر ئەوە لێرەدا پیتەکانی سەرەوا بەعەرەبی نووسران.

(١) کائینات: بوونەوەر. وەجد: عەشق و دڵداری، تەرەب = طرب: کەیف خۆشی.





(٢) ماهی نەخشەب: واتە مانگی شاری نەخشەب. مەبەستی ئەو مانگەیە کە حەکیمی کوڕی عەتا لە وڵاتی (ماوراء النهر) لە شاری نەخشەب بەدەرمانی کیمیاوی مانگێکی دەستکردی دروست کردووە و لەسەر شاخێک دایناوە لە شەو ماوەی چوار سەعات ڕێگا بەدەوری خۆیدا ڕووناکی دەبەخشی.
(٣) شەهدی گوفتارت: قسەی شیرینت.
(٤) سەححار (سّحار): سیحرباز و ئەفسووناوی.
(٥) حوسن: جوانی. ئەنوار: کۆی نوورە، واتە ڕووناکی و پڕتەو بەخش.
(٦) غەوث: مەبەستی شێخ عەبدولقادری گەیلانییە.
(٧) جیزیە: جزیە: سەرانە و خەرج و باجێکە لەو کافرە کیتابییانە دەستێنرا کە لە وڵاتی موسڵمانان دەژیان لە جیاتی واجباتی نیشتمانی.
(٨) خەراج: بەشێکی دیاریکراوە لە بەروبووم ئەدرێ بەمیری. لە ئەرزێکی دیاریکراوا.
(٩) خوابگاه: شوێنی نووستن + تەرەح= ترح: خەم و خەفەت و ناخۆشی.
(١٠) گۆستاخ: ڕوو هەڵماڵراو و بێ پەروا و نەترس و سەربەست.
(١١) شەکەر گۆفتار: شیرین قسە و گفتوگۆ خۆش.
(١٢) چیهرە: ڕوخسار.
(١٣) شاهباز: شاباز گوایە گۆشتی مردارەوە بوو ناخوا.
(١٤) شوعلە: بڵێسە ئاگر، شۆق و ڕووناکی. مەهوەش: ئەوەی ڕوخساری وەکو مانگ جوانە.
(١٥) کوورەی ئاتەش: کوورەی ئاگر، ئاگردان.
(١٦) لە دەستنووسەکەدا بە بەتاڵی هێڵراوەتەوە -ئاراس-
(١٧) میهر: خۆشەویستی.
(١٨) عەرضی تەشەککی: بەیانکردن و ڕوونکردنەوەی لێقەوماوی و شەکوای حاڵ.
(١٩) ئیفراط: ئەوپەڕگرتن لایەنی ئیجابی.
(٢٠) واعیظ: ئەو کەسەی نەصیحەتی خەڵک دەکا.
(٢١) وەجد: عەشق و خۆشەویستی.
(٢٢) گوڵبەن: داری گوڵ.
(٢٣) لە دەستنووسەکەدا بە بەتاڵی هێڵراوەتەوە -ئاراس-
(٢٤) ئافاق: کۆی (اُفق)ە بەمانا گێتییە.
(٢٥) بەدر: مانگی شەوی چواردە. میحاق: ئەو کاتەیە کە مانگ دەگاتە ئەو پەڕی لاوازی و لەبەرچاو ون دەبێ ئەم حاڵەتەش لە دوا ڕۆژەکانی مانگی عەرەبی و لە یەکەم ئێوارەی مانگی نوێدا ئەبێ. کە مانگ زۆر باریک و زەعیفە کەم کەس دەی بینێ.
(٢٦) مەهی ئاسمان: مانگی ئاسمان.
(٢٧) هیلال: مانگی یەک شەو.
(٢٨) صاحیبی ئیقباڵ: خاوەنی نگین.
(٢٩) بەزمی ویصال: داب و نەریت و هەرا و بەزمی بەیەک گەییشتن.
(٣٠) چیهرەی زەردم: ڕوخساری زەردم.
(٣١) مەر: مەگەر.
(٣٢) دیدە سیاه: چاوڕەش.

## بنازم*

بنازم پەرچەمت زللەی لە کەللەی عوود و عەنبەردا(١)
صەفای ڕوخسارەکەت طەعنەی لە ئاوێنەی سەندەردا(٢)
شەڕ ئەفرۆشێ بەعالەم بێ سەبەب ئەو چاوە مەستانە
هەچی هاتە تەماشای چاوی تۆ سینەی لە خەنجەردا(٣)
بەڵێ عومری (خضر) قیسمەتمە گەرچی عومر کۆتابێ(٤)
کەسێ نەقدی حەیاتی خۆی بەیاری شۆخ و ئەسمەردا
لە تەعریفی قەدی مەوزوونی، شاعیر کەوتە وریایی
هەموو دێڕێکی ئەفکاری خەیاڵاتی لە «میسطەر»دا(٥)
کە زاهید هاتە سەیری قەوسی ئەبرۆی تۆ بەناچاری(٦)
فڕێی دا سەبحە و سەججادە سەد لەقەی لە مینبەردا
دەمی تۆ خونچەی نەشکوفتەیە، یا نوقتەی مەوهووم(٧)
بەخەندە دوڕ بەسەر لەعلا و لەعلیشی لە شەککەردا(٨)
بەرامبەر حەلقەی پەرچەم خەدەنگی چاوی مەخموورت(٩)
بەعەینی وەک (جیهان بەخشە) لەگەڵ تیری لە(ئەژدەر)دا(١٠)
بەمەرهەم زەحمەتە زەخمی دڵی بێچارە ناگیرێ
بە تەحریکی برۆ ئەو شۆخە دەردێکی بە (زێوەر) دا

..........

* ئەم شیعرە لە کەشکۆڵی (أ)، ل١٢٨ و کەشکۆڵی (ب) لاپەڕە ٦دا نووسراوەتەوە. کاک محەمەد عەلی قەرەداغیش لە گۆاری بەیان ژمارە ١٣٧ لاپەڕە ١٩ بڵاوی کردۆتەوە.
(١) عوود: داری عوود. عەنبەر: گیایەکی بۆن خۆشە.
(٢) ئاوێنەی سکەندەر: ئاوێنەی ئەسکەندەر: دەڵێن: ئەسکەندەر ئاوێنەیەکی هەبووە هەموو دنیای تێدا دیار بووە.
(٣) مەبەستی بە (خەنجەر) برۆی یارە.
(٤) عومری خضر: تەمەنی خدری زیندە، مەشهوورە دەڵێن: خدری زیندە ئاوی حەیاتی خواردۆتەوە و تاڕۆژی دنیا وێران بوون نامرێ.
(٥) میسطەر، مسطر: خەتکێش، جاران مەلا و فەقێ و خەت خۆشەکان شتێکیان دروست دەکرد لە مقەبا و لە دەزوو دەیانهێنا دەزوویان بەسەر مقەباکەدا ڕایەڵ دەکرد و دەیان چەسپان بەمقەباکەوە ئەمجار ئەو کاغەزەی بیان ویستایە شتی لەسەر بنووسن مقەباکەیان دەخستە ژێری و دەستیان بەسەر دادەهێنا شوێنی دەزووەکە لەسەر کاغەزەکە دەردەچوو و خەتخەتی دەکرد ئەمجار نووسەرە کە بەسەر خەتەکاندا دەینووسی، بەو مقەبا و دەزووەیان دەگوت میسطەر. واتە ئامێری خەت.
(٦) زاهید: خواناس، بەزۆری بۆ خواناسی لە خۆبایی بوو بەکار دەهێنرێ. سەبحە: تەزبیح. سەججادە: بەرماڵ. مینبەر: شوێنی خوتبە خوێندنەوە.





واتە: زاهیدی لە خۆبایی کاتێ سەیری کەوانە برۆی تۆی کرد تێگەیشت و بۆی ڕوون بووەوە کە ئەوە میحرابی حەقیقییە ناچار تەزبیح و بەرماڵە ڕواڵەت کارییەکەی فڕێدا و شەقێکیشی لە مینبەر و شوێنی وەعظ و نەسیحەت کردنەکەشی هەڵدا و وازی لێ هێنان و ڕووی کردە میحرابی جووت ئەبرۆی تۆ.
(٧) خونچەی نەشکوفتە: غونچەی نەپشکوتوو، نوقتەی مەواهووم: جەوهەر، جوزئی (لایتجزأ) ئەو نوختەیەیە کە بۆ کەرت کردن نەشێ. زۆربەی زانایانی عیلمی کەلام لایان وایە کە (جزء لایتجزأ) نییە و شتێکی خەیاڵییە بۆیە شاعیریش بە نوقتەی مەوهوومی ناو بردووە.
(٨) دوڕ: مەبەستی ددانەکانی یارە. لەعل: پوک یان لێوی سوور.
(٩) حەلقەی پەرچەم: زولفەکانییەتی. خەدەنگ: تیغ. مەخموور: مەست و سەرخۆش
(١٠) جیهان بەخش و ئەژدەر: دوو پاڵەوانی کۆنی ئێرانی بوون. ئەژدەر بەمانا (ئەژدەها)ش هاتووە.

## باعیشی دووریتە*

باعیشی دووریتە گەر دڵ ناڵە و ئەفغان ئەکا(١)
دەردی هیجرانە سەبەب گەر دیدە خوون ئەفشان ئەکا(٢)
هەر زەمان ناری فیراقت دێتە ناو کوورەی دەروون
میروەحەی ناڵەم لە هەر لا ئاگرێ پەخشان ئەکا(٣)
تۆ کە جەللادی بەئەڵماسی موژەت دڵ کون مەکە
زەخمی ئەبرۆت کارییە چارێ لە هەر دەرمان ئەکا
شەمعی ڕووت کەوتۆتە ناو زوڵماتی زوڵفی وەک شەوت(٤)
دڵ وەکو پەروانە هەردەم مەیلی خۆ سووتان ئەکا
نەو غەزالێکی تێدایە دڵ فڕێن و دولبەرە(٥)
سا بەخۆڕایی نییە دڵ مەیلی کانیسکان ئەکا(٦)
قەت بەمەقسوود و مەرامم ئاسمان دەوری نەدا
باغی خەڵقی دڵ گوشاد و باغی من وێران ئەکا
گەر هیلالی ئەبرووانت بێتە عەرصەی ظاهیری
سەد وەکو زێوەر بەساتێ دێت و خۆی قوربان ئەکا

..........

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١٣١-١٣٢ی کەشکۆڵی (أ) و لاپەڕە ٨ی کەشکۆڵی (ب) نووسراوەتەوە. لە ژمارە ١٢٧ی گۆڤاری بەیانیش لە لاپەڕە ٨٢دا بڵاوکراوەتەوە.
(١) ئەفغان: داد و هاوار و گریان.
(٢) خون ئەفشان: خوێن ڕژان.
(٣) میروەحە، مروحە: پانکە، باوەشێن.
(٤) زوڵمات، ظلمات: تاریکایی.
(٥) نەوغەزال: بەچکە ئاسک، مەبەست کیژۆڵەی تازەپێگەیشتووە.
(٦) کانیسکان، کانی ئاسکان: گەڕەکێکە لە سلێمانی. دەڵێن کانییەکەی پێش دروستکردنی سلێمانی جێی ئاسکان بووە.

## کە تۆ ڕۆیی*

کە تۆ ڕۆیی، بەجوز ناڵاندن و گریان زووبان چبکا(١)
کە ئاهوو ڕەم بکا، صەییاد بەجوز ناڵە و فوغان چبکا(٢)
لەسایەی عەسکەری موژگان و طوڕڕەی زولفی شەوڕەنگی(٣)
نیگارم پادشای حوسنە، لە حاڵی عاشقان چبکا(٤)
ئەلا ئەی عاشقی بێ دڵ نیگارت میهرجۆ نابێ(٥)
لە قاپیدا عەبەث کەوتووی، فەقیرە دەرگەوان چبکا(٦)
بەوەعز و پەندی دانا مەردی نادان بەهرەوەر نابێ
کە بەخت و تالعی ڕەش بێ گەڕانی ئاسمان چبکا
لە هەرلا ئیتتیفاقێ بوو، ئەگەر کێوە عەدوو هیچە
کە پەششە ئیتتیفاقی بوو ئەبێ فیلی دەمان چبکا(٧)
بە حوکمی حەق ڕەزا نابی ئەبەد مەطروود و مەحکوومی
ئەلا ئەی نەفسی دوون شەیتان ئەبێ غەیری زیان چبکا(٨)
کە بەد خولقی تەبیعەت بێ بەمیصقەل زەحمەتە لاچێ(٩)
لە دەست بووجەهل و ئەمثالی ڕەسووڵی ئینس و جان چبکا
لە دووریی تۆ ڕەقیبان و هەموو دنیام لەلا مەحوە
کە فەسڵی گوڵ نەما، بولبول لە باغ و باغەبان چبکا
لە جیلوەی گوڵ لەنەشئەی مەی، لە عەکسی تەلعەتی ساقی
کە دڵ ژەنگی غەمی تیابێ ئەبێ (زێوەر) لەوان چبکا

........................................

* ئەم شیعرە لە کەشکۆڵی (أ) لاپەرە ١٢٩ و کەشکۆڵی (ب) لاپەرە ٧-٨ وەرگیراوە. لەگۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ١٢٧ لاپەڕە ٧٨دا چاپ کراوە.

(١) ڕۆیی: کورت کراوەی (ڕۆیشتی)یە. بەجوز: بێجگە.
(٢) ئاهو: ئاسک. ڕەم: هەڵاتن، ڕاکردن، هەڵتریزاندن، صەییاد: نێچیرەوان.
(٣) طوڕڕە: لە بنەڕەتدا مۆرێکی شاهانەیە ئەنرێ بەکاغەزی تایبەتی پاشاوە یان بەپارە و سکەیەوە. ناو و نازناوی پاشای بەخەتێکی پێچ پێچاوی تێک چڕژاو لێ هەڵکەندراوە. شاعیران بەکاری دێنن بۆ زولفی پڕ پێچ و لوول کراو و تێک چڕژاو. طوڕڕەی زولفی شەو ڕەنگی: واتە زولفێک کە وەک مۆری طوغرا پێچ پێچ و لوول تێک هاڵاو بێ و وەکو شەوی تاریکیش ڕەش و کەسکوون بێ.
(٤) نیگار: وێنە، مەبەستی یارەکەیەتی، دەڵێ: یارم پاشای جوانییە چ کاری بەحاڵ و چۆنیەتی عاشقان نییە.
(٥) میهرجۆ: خاوەن عەطف و بەزەیی، یان ئەوەی بەدوای خۆشەویستیدا بگەڕێ.
(٦) عەبەث: بێ هوودە.
(٧) پەشە: پشیلە. فیلی دەمان: فیلی توورە.





(٨) نەفسی دوون: نەفسی پەست و پلە نزم.
(٩) میصقەل: ئالەتی مشتوماڵ کردن.

## ئەی نەفسی دەنی!*

ئەی نەفسی دەنی هەروەکو فیرعەونی لە کیبرا
ئەم حەشمەت و مەغروورییە تاکەی لە هەموو لا(١)
بۆ غەرق و هیلاکەت لەشەتی ئەشک دەمادەم(٢)
پەیدابووە وا صاحێبی حوسن و یەدی بەیضا(٣)
بۆ میللەتی مووسای ئەڵێ: موعجیزە ڕوومە
خۆی بەچچە یەهودێکە عەدووی موسلیم و تەرسا
بازاڕی هەموو گرتووە. وەک یوسفی ثانی(٤)
لافی ئەوەیە زیندە بکا دینی یەهوودا
بەززازە، بەنازە، چ عەجەب سیحر طیرازە(٥)
بۆ (موشتەری) ئەنوێنێ ڕۆخی زوهرەیی زەهرا(٦)
ئەی حەییەکە، بەد بەختەکە، بێ دینەکە کافر!(٧)
سوێندت دەدەم ئەمجارە بەئەلهاو و بەمووسا
تۆ و عەشقی (شوعەیب)ی نەبی و حورمەتی (ئیسحاق)(٨)
بۆ خاتری ئوفتادەیی دەر بانی کلێسا(٩)
گوێ مەگرە لە ئەقوالی ڕەقیبی وەکو (هامان)(١٠)
ئیظهاری مەکە فیتنەو و ثابیت مەکە دەعوا
ئایین و وەفا قاعیدەی میهر و نەوازش(١١)
بنوێنە لەگەڵ عاشقی دڵ خەستەی شەیدا
دەم، بەستەیە یا فوندوقە چاوت وەکو بادام(١٢)
ڕوو لالەیی نێو جەننەتە، قەد سەرووی دلارا
زولفت چییە، ڕەشماری دەسی ساحیری میسرە(١٣)
چیهرەت چییە خەزنەی زەڕی (قارونە) لە دنیا(١٤)
سەرخۆش بووە (زێوەر) بەمەیی ناز و مەحەببەت
لەو لەعلی لەبە، بۆ مەزە چەند بۆسە، بڵێ: ها(١٥)

........................................

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١٣٠ی کەشکۆڵی (أ) و لاپەڕە ٧-٨ی کەشکۆڵی (ب)دا نووسراوەتەوە.
محەمەد عەلی قەرەداغیش لە گۆڤاری بەیانی ژمارە ١٢٧ لاپەڕە ٨٩-٩٠ دا بلاوی کردۆتەوە، بڕێ جیاوازی لە نێوان

سەرچاوەکاندا هەیە.

(١) ئەم نیوە دێرە شیعرە لە بەیانی ژمارە ١٢٧دا بەم جۆرەیە: (ئەم سەڵطەنەت و حیشمەتە تاکەی لە هەموولا)

(٢) لەشەتی: کەشکۆڵ (أ-ب) لە «یەم»ی بەیان.

(٣) یەدی بەیضا: دەستی سپی و شوعلەدەر، مەبەستی دەستی حەزرەتی مووسایە کە موعجیزەی ئەوەبووە وەک چرا دەستی ڕووناکی بەخشیوە.

(٤)ئەم نیوە دێرە ئاماژەیە بۆ فرۆشتن و کڕینی حەزرەتی یوسف کە عەزیزی میسر کڕی.

(٥) طیراز: لە هەموو سەرچاوەکاندا (طەراز) نووسراوە سیحر طیراز: واتە سیحرباز، یان سیحراوی.

(٦) ڕوخ: ڕوو. ڕوخی زوهرەیی: ڕووی گوڵاوی.

(٧) حەبیبەکە: کوڕە جوولەکەیەک بووە زۆر جوان خاس و شێوە شیرین بووە لەسەر خواستی سەید ئەحمەد ئەفەندی حەمەی دایە مامۆستا زێوەر ئەم هەڵبەستەی لە جوانی و ستایشی کوڕە جوولەکەکەدا داناوە.

(٨) شوعەیب و ئیسحاق: دوو پێغەمبەری خودا بوون.

(٩) ئوفتادەیی: لە (بەیان)ی ١٢٧دا (ئیفتادە) نووسراوە.

(١٠) هامان: ستەمگەر و زۆردارێکی بێ بڕوای سەردەمی حەزرەتی مووسایە. وەزیری فیرعەون بووە.

(١١) ئایین و وەفا: لە بەیانی ١٢٧دا (ئایین وەفا) نووسراوە.

(١٢) فوندوق: فندق: بەعەرەبی پێی دەڵێن: بندق.

(١٣) ئاماژەیە بۆ سیحربازەکانی فیرعەون کە لەگەڵ حەزرەتی مووسادا بەرامبەری و حەنە حەبەشییان کرد.

(١٤) چیهرە: ڕوو، ڕوخسار، قاڕوون: دەوڵەمەندێکی سەردەمی حەزرەتی مووسا بووە، لەسەر بێ باوەڕی و سەرسەختی خۆی بەخۆی و سەرو سامانییەوە خوا ڕۆی برد بەزەویدا.

(١٥) لەعلی لەب: واتە لێوی وەک لەعل سوور. بۆسە: ماچ.

## دەماغ ئەمشەو...*

دەماغ ئەمشەو موعەتتەر بوو، صەبا بۆی دولبەری هێنا(١)
حەیاتم تازە بوو ساقی شەرابی ئەحمەری هێنا(٢)
فیدای چاوی ڕەشی بێ دڵ ئەگەر نەیبا بەپەنهانی
بە قوربانی دوو ئەگریجەم، صەبا لەو عەنبەری هێنا(٣)
عەرەق کەوتۆتە سەر ڕوومەت وەکو شەونم لەسەر ڕووی گوڵ
خەیاڵی قەددی تۆی کرد، دڵ موافیق عەرعەری هێنا(٤)
ئومێدی ئابی وەصڵم بوو، هەوای کیبرت زیاتر بوو
بەسەر خانەی دڵی سووتاو زەمانە صەرصەری هێنا(٥)
بە غەیری من کە مەحرووممم لە ماچی لێوی شیرینی
لە دنیا گەر هەبوو مەردێ لە چاهی غەم دەری هێنا(٦)
ئومێدی قەتڵی کێی بوو وا منی کێشایە خزمەت خۆی
بە حیلە و مەکر و عەییاری نەسیم ئەسکەندەری هێنا





بەپایەی شیعری ڕەنگاوڕەنگ خەیاڵی تازەگی دێنێ
لە دنیا کێ بەئوستادی خەیاڵی (زێوەر)ی هێنا!

..........

* ئەم شیعرە لە کەشکۆڵی نەجمەدین مەلا (أ) ل١٢٧دا نووسراوەتەوە هەروەها لە ل٦ی کەشکۆڵی (ب)دا دووبارە بۆتەوە.. کاک محەمەد عەلی قەرەداغیش لە گۆڤاری بەیانی ژمارە ١٣٧، ل١٩دا بڵاوی کردۆتەوە.

(١) موعەتتەر، معطر: عەتراوی. صەبا: بای بەری بەیان، لە ئەدەبی کۆندا بەپەیامبەری نێوان یاران و دڵداران دانراوە.

(٢) شەرابی ئەحمەر: شەرابی سوور.

(٣) عەنبەر: گیایەکی بۆن خۆشە، بەمایەیەکی بۆن خۆشیش دەگوترێ کە لە ناوسکی یان ڕیخۆڵەی ماسی دەری دەهێنن.

(٤) عەرعەر: سەرووی کێوی، درەختێکە کەمێک لە سەرووی عادەتی کورتتر و پچووکترە.

(٥) صەرصەر: بای بەهێز یان بای سارد.

(٦) چاهی غەم: چاڵی غەم و ناڕەحەتی.

شایانی باسە کە ئەم قەصیدە زۆر لە قەصیدەکەی وەفایی شاعیر دەکا کە دەڵێ:

نەسیمی بادی نەورۆزی شەمیمی عەبهەری هێنا
بەریدی عاشقان دیسان پەیامی دولبەری هێنا

تا دەگاتە کۆتایی و دەڵێ:

بەبێ شاباشی سەر بەقسەی (وەفایی) گوڵ چرا نابێ
کە بولبول هەر زمانی هەن هەندە پەروانەش سەری هێنا

(سالم)یش فەرموویەتی- بەڵام کێش جیایە-

ساقی لە پەردە دەرهات جامێ شەرابی هێنا
دڵ خیرە ما لە حیرەت، مەه ئافتابی هێنا

(ئەوڕەحمان بەگی بابان)یش دەڵێ:

شنەی هەوای بەیانی، بۆنی بەهاری هێنا
ئەم بۆنە عەترە بێزە نەشئە و خوماری هێنا

## شێتی ڕووتە*

شێتی ڕووتە، بۆیە وا سەر ڕووتە دائیم ئافتاب(١)
شەرمەساری بۆتە وا مەحجوب و پەنهانە گوڵاب(٢)
ماهی نەخشەب سیحربازێ بوو کە شەوقێکی هەبوو(٣)
تۆ بەبێ سیحر و دەغەڵ شەو تا سەحەر وەک ماهتاب(٤)
من لە کوورەی فیرقەتا ناکەم خەیاڵی غەیری تۆ(٥)
ئارەزووی باغی بەهەشتە دائیما ئەهلی عەزاب
ساقی بادەی ئەرغەوانی بێنە، وا خەملیوە گوڵ(٦)
شیشەی تۆبەم شکاند تا دەسکەوێ شیشەی شەراب(٧)

گوڵ لەسەر تەختی چەمەن شاهێکە، بولبول موطریبە
باغەبان ئامان دەخیلم، دێم و تۆ نەمەدەی جەواب!
زاهیرەن زاهید خەریکی دەس برینی عالەمە
بۆیە وەک دز خۆی خزاندە گۆشەی کونجی خەراب
نامەوێ ئابی حەیات و تەخت و جاهی خوسرەوی
گەر مویەسسەر بێ ویصالی دولبەری شیرین خیطاب
بمدەرە بەرتیری تەعنە تۆش وەکو عالەم، ڕەزام
گەر نەبێ میهرەت بەقەهرت شادمانم بێ حیساب
تۆ لە (زێوەر) قەت مەڕەنجێ خاکی دەرگات کا بەسەر
چونکە شێت هەرگیز نەبۆتە مەوریدی تەعنە و عیتاب

..........................................................

* ئەم شیعرە لە کەشکۆڵی (أ) ل١٣٤-١٣٥ و کەشکۆڵی (ب) ل١٣. هەروەها ژمارە ١٣٧ی گۆڤاری بەیان ل٢٠دا بڵاو کراوەتەوە.
(١) ئافتاب: ڕۆژ، خۆر.
(٢) بۆتە: سووککراوی (بۆنتە)یە، واتە: شەرمەزاری بۆنی تۆیە. گوڵاب: گوڵاو.
(٣) ماهی نەخشەب: لە پیتی (أ)دا شەرح کراوە سەیری شیعری (لابدە پەردە ئەی گوڵی ڕەعنا...) بکە.
(٤) ماهتاب: ئەوەی وەک مانگ بدرەوشێتەوە.
(٥) کوورەی فیرقەت: ئاگری لێک جودا بوونەوە. واتە من لەکاتی هەرەسهێنانی ئێش و ئازاری دووری تۆ و سووتان بەئاگر لە تۆ جیابوونەوە هەموو خەیاڵ و هەست و نەستم هەر گەیشتن بەتۆیە چونکە ژیان لە نزیک تۆ تامی بەهەشتی هەیە دووری لە تۆش ئازاری دۆزەخی هەیە ئەهلی دۆزەخیش هەموو ئاواتێکیان چوونە بەهەشتە.
(٦) بادەی ئەرغەوانی: شەرابی وەک گوڵە ئەرخەوان سوور.
(٧) شیشە: شووشە.

## مەحبووسی جەفات کردم*

مەحبووسی جەفات کردم و نەت خستە ڕیعایەت(١)
بێ جونحەو و بێ واسیتەی جورم و جینایەت(٢)
شاهێکی کەڵە ماهیی و ماهێکی سوپەهدار
لای کێ بنوێنم وەرەقی زوڵم و شیکایەت
گاهێ بەخەدەنگی مووژە، گاهێ بەنیگاهێ
سەندووتە لە من هۆش و خیرەد، فەهم و دیرایەت(٣)
بەم حوسنە لەسەر عاریضی تۆ عاریضە ئێستا
بێ باکیی و جەورت گەیییە ڕوتبەی غایەت





ئەم بەندەیە بەو خەندەیە دڵ زیندووە سادەی
تەجدیدی بکە عومرم، ئەوا هاتە نیهایەت
ئازاری دڵی خۆت مەدە ئەی واعیظی مەجلیس!
فەرقی نییە لای ئێمە چ وەعظ و چ حیکایەت
بێ پەردە لەگەڵ (زێوەر) ئەتۆ هاتییە مەیدان
نەت خستە موعەمماو و دەرت کرد لە کینایەت

..........................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٣٧ی کەشکۆڵی (أ)دا نووسراوەتەوە هەروەها لە ژمارە ١٢٧ی گۆڤاری (بەیان)دا بڵاو کراوەتەوە.
(١) مەحبووس: بەند کراو. جەفا: لێ دوور کەوتنەوەی خۆشەویست، دەنگ لێ دابڕین، زوڵم و ستەم. ڕیعایەت: چاوەدێری.
(٢) جونحە، جورم، جینایەت: گوناه و کردنی کاری ناڕەوا.
(٣) خیرەد: عەقڵ. فەهم: تێگەیشتن. دیرایەت: زیرەکی.

## پەرێشانم*

پەرێشانم بەتاتای کاکۆڵی موشکینی سەر شانت(١)
بریندارم بەتیری غەمزەیی دوو چاوی فەتتانت
هەناسەم ئاسمانی گرتە بەر، بێ طوڕڕەیی لوولت(٢)
سوورشکم لەعلی ڕوممانە بەبێ چیهرەی درەخشانت(٣)
نەسیمی صوبحدەم جارێ لە عەتری زولفەکەی بێنە(٤)
دەوای هەر دەردە، تەقصیرێ مەکە، جانم بەقوربانت
ئەمن وەک زەڕڕەی بێ جیلوە، تۆ خورشیدی عالەم گیر(٥)
چلۆن دەستم بگاتە خاکی پاکی چاکی دامانت
ئیرادەم وایە تەرکی عالەمی دنیا بکەم یەکجار
ئەگەر نەمخاتەوە داوی هەوای کاکۆڵی ئەفشانت(٦)
بە ئومێدی سەحابی فەیضی تۆیە گوڵشەنی سینە(٧)
دەروونم لالەسان داغە بەشەوقی بەرقی هیجرانت(٨)
لە دەورەی لەعلی لێوت قافڵەی خەت باری خۆی لێ خست(٩)
بەغەیری (زێوەر)ی بێ دڵ نەما توشنەی زەنەخدانت(١٠)

..........................................................

* ئەم شیعرە لە کەشکۆڵی (أ) ل١٣٦ وەرگیراوە.
(١) تاتا: تاڵ تاڵ. موشکین: مووی ڕەشی بۆن خۆش.
(٢) طوڕڕە: مۆری شاهانە: لێرەدا مەبەستی زولفی پێچ پێچ و تێک چرژاوە کە وەکو طوڕڕە وایە.
(٣) لەعل: بەردێکی گرانبەهای سوورە، ڕوممان: هەنار. مەبەستی ئەوەیە بڵێ: فرمێسکەکانم وەکو دەنکە هەنار سوورن.

چیهرە: ڕوخسار. درەخشان: ڕەوشەن و ڕووناک.

(٤) نەسیمی صوبحدەم: شنەی بای بەیانی.

(٥) زەڕڕە، ذەڕڕە: ماددەیەکی پچووکە بەشکردن هەڵناگرێ. بێ جیلوە: بێ شۆق و نادیار. خورشید: خۆر.

(٦) کاکۆڵی ئەفشان: زوڵفی بڵاو و بێ تەرتیب و شێواو.

(٧) سەحاب: هەور. فەیض: لێشاوی ڕەحمەت. گوڵشەن: باخ.

(٨) لالەسان: لالە ئاسا، وەک گوڵی لالە. لالە بۆ خۆی گیایەکی پچووکی کێوییە زۆرتر لە شوێنی تەڕ و شێداردا دەڕوێ لەسەرەتای ناوەڕاستی مانگی بەهاردا پێ ئەگا گوڵێکی سووری هەیە لە ناو گوڵەکەدا خاڵێکی ڕەش هەیە وەکو داخ وایە. شەوق: شۆق و ڕووناکی. بەرق: برووسکە. هیجران: جودابوونەوەی دوو خۆشەویست لە یەکتری.

(٩) لەعل: بەردێکی سووری گرانبەهایە، لەعلی لێوت: واتە لێوی وەک لەعل سوورت. قافڵەی خەت: کاروانی خەت، مەبەستی ئەوەیە کەوا لە دەوری لێوی (گەنەموو) سەری هەڵداوە تیا جێگیربووە. نالیش دەڵێ:

چ شیرینە خوطوطی دەوری لێوت
بەڵێ مەعلوومە خۆش خەططی یاقوت

(١٠) توشنە: تینوو. زەنەخدان: چەناگە.

## ئەساسی عەیشی*

ئەساسی عەیشی ئێمەی خستە سەحرا تیرە بارانت[١]
شکستی دا بەتابووری خەیاڵم تیپی موژگانت
ئەتۆ وەک یوسفی و من لە چاهی میحنەتا بەندم[٢]
ئەما من دیم لە خەودا کەوکەبی ڕوخساری ڕەخشانت
بە شمشێری برۆ ئەمرۆ سوپەهـ سالاری خووبانی[٣]
مەگەر ئینسان لە ڕۆحی خۆی ببوورێ بێتە مەیدانت
خوا شەوقێکی وای بەخشی بەدڵ قەت تێر لە تیر نابێ
لە موغناتیس گەلێ جاذیبترە بۆ جەذبی پەیکانت[٤]
ئەگەرچی نائومێدی باغی وەسڵی تۆم ئەما ناڵێم
بە تاراجی خەزانی ئاهی من چێ باغ و بوستانت
شەرابی عەهدی جەم بۆ کەی، دەخیلم هەستە سا، ساقی[٥]
بینای فەقر و غەمم لابە! بەجیلوەی جەور و جەولانت
دڵی (زێوەر) بەغەمزەی چاوەکەت مەشکێنە جێی خۆتە[٦]
تەرەحوم کە لە ڕێگای لوتف و عەهد و شەرتی جارانت

........................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٣٥-١٣٦ی کەشکۆڵی (أ) وەرگیراوە.

(١) ئەساسی عەیشی ئێمە: بناغەی دیواری ژیانی ئێمە.

(٢) چاهی میحنەت: چاڵی غەم، لێرەدا مەبەست ماڵی حەزرەتی یەعقووبە کە بەهۆی لێ ونبوونی یوسفەوە یەعقووب تووشی





ئەو ناڕەحەتی و خەم و خەفەتە بوو لە سەرووی هەموویانەوە چاویشی کوێر بوو. جا بۆیە لە ئەدەبی کلاسیکیماندا بەماڵی یەعقووب دەگوترێ چاهی میحنەت، یان میحنەتخانە یان بیت الأحزان... هتد. ئیتر ئەو ماوە دوور و درێژە حەزرەتی یەعقووب نە بەخەو و نە بەوەحیی و نە بەزاهیر یوسفی نەدی، بۆیە لێرەدا شاعیر خۆی لە یەعقووب بەختەوەرتر دەزانێ و لە نیوە دێری دووەمی شیعرەکەدا دەڵێ: من لە یەعقووب بەختەوەر ترم چونکە لە خەودا ئەستێرەی ڕوخساری ڕەخشانتم بینی و تۆزێک بیرۆشیم پێی هات.

(٣) سوپەهـ سالاری خووبان: سەر لەشکری جوانان.

(٤) مەعنای ئەم شیعرە تێکڕا بەم جۆرەیە دەڵێ:

خوا عەشق و سۆزێکی وای خستۆتە دڵمەوە هیچ کاتێ و بەهیچ جۆرێ تێر ناخوا لە تیری موژگانت تا تیری بۆ بهاوێژی ئەو زیاتر شێتگیر دەبێ و زۆرتر هەوەسی تیری تۆی دەبێ چونکە دڵ بۆ خۆی وەکو موگناتیس وایە تیری موژەشت لە ئاسن دروست کراون و دیارە موگناتیسیش کێشی ئاسن دەکا و بۆ لای خۆی ڕای دەکێشێ.

(٥) عەهدی جەم: سەردەم و ڕۆژگاری جەمشیدی کوڕی تەهمورث چوارەمین پادشای پێشدادیانە، دەڵێن لە سەردەمی ئەودا ئاگر و ئاسن دۆزراوەتەوە هەر لە ڕۆژگاری ئەودا دەستووری کشتوکاڵ دانراوە. واتە شەرابی کۆنی ڕۆژگاری جەمشید بۆ کەی بوو تاکەی هەڵدەگرێ (مەشهور وایە دەڵێن شەراب تا کۆن بێ باشترە) سا دەخیلت بم ساقی هەستە بۆم بێنە با بەسەریەوە نێم و خەم و خەفەتی پێ بە با دەم.

(٦) غەمزە: چاو هەڵتەکاندن. واتە دڵی زێوەر بەچاو هەڵتەکاندن و ئیشارە مەشکێنە چونکە ئەو دڵە جێ و مەکانی خۆتە و کەسی تری تێدانییە، جا کەوابێ تۆ بۆ بەخۆڕایی ماڵی خۆت وێران دەکەی!!

## شکاندی*

شکاندی شیشەی عەیش و نیشاطم چاوی سەححارت[١]
فڕاندی تاعەت و تەقوا و عیبادەت، زوڵفی زوننارت[٢]
بەقەد سەرووە، بەدەم غونچە، بەچاو نێرگس، بەڕوو وەک گوڵ
سەراپا باغی حوسنی جانفزایی باغ و گوڵزارت[٣]
لە ئەوقاتی تەغافول قیمەتی چینە نیگاهێکت[٤]
خەتایە، نرخی دنیایە نیگاهی چاوی بیمارت[٥]
بە باڵا سەروی، ڕەفتاری وەکو «کەبکی دەرێ» وایە[٦]
فیدای باڵای بەرزت بم فیدای عینوان و ڕەفتارت
بەڕۆح هاتوونە سەودا، بۆ تەماشای موشتەری ناکەی
لەسایەی شەککەری لێوت عەجائیب گەرمە بازاڕت
بەباڵای بەرز و سوخمەی سەوز و تەرزی دلبەری تاقی
کەوا تاقەی عیراقی، زۆرە وەک یوسف خڕیدارت[٧]
تەشەککور لازمە (زێوەر) لە ئاثاری وەفا و میهری[٨]
عەجەب تەئسیری کردە ئەو دڵە ئەفغان و هاوارت[٩]

........................................................

* ئەم پارچە شیعرە لە کەشکۆڵی (أ) لاپەڕە ١٣٨ وەرگیراوە.

(١) شیشە: شووشە، عەیش و نیشاطم: ژیان و هێز و توانام. چاوی سەححارت، چاوی سیحربازت.
(٢) زوننار: ئەو پشتێنەیە کە جاران پیاوە مەسیحییەکان لە پشتیان دەبەست بۆ ئەوەی لە موسڵمانەکان جوێ بکرێنەوە. مەبەستی ئەوەیە بڵێ: چۆن زوننار لە پشت بەستن نیشانەی ئەوەیە کە ئەوەی لە پشتی بەستووە موسڵمان نییە، بەو شێوە زوڵفی تۆش دین و ئیمانی لە من فڕاندووە و کردوومیە گاور و جوولەکە.
(٣) جانفزا: گیان ژێنەرەوە.
(٤) چینە: مەبەستی وڵاتی (چین)ە.
(٥) خەتایە: مەبەستی وڵاتی (خەتا)یە.
(٦) کەبکی دەری: سوێچکە.
(٧) خڕیدار: موشتەری و کڕیار: ئاماژەیە بۆ کڕینی عەزیزی میسر کە لە بازاڕی میسردا حەزرەتی یوسفی کڕی گوایە لەبەر جوانی ئەوەندە موشتەریی زۆر بووە هەر کەسە لە عاست خۆیەوە چی هەبوو بردی بۆ بازاڕەکە بەهیوای ئەوە یوسف بکڕێ تەنانەت دەڵێن پیرێژنێک دوو گلۆڵە مووی هەبوو ئەویش چووبوو خۆی کردبوو بەکڕیار، لێیان پرسی پیرێژن! کوا بەم دوو گلۆڵە مووە یوسف دەکڕدرێ لە وەڵامدا پیرێژن وتی: خۆ ئەگەر بۆشم نەکڕدرێ پێم دەڵێن موشتەری یوسف بووە.
(٨) میهر: خۆشەویستی.
ئەفغان: ناڵە و گریان.

## ئەنجومەن ئارایە*

ئەنجومەن ئارایە ڕووی ئەنوەرت(١)
تووتیایە بۆ بەصەر خاکی دەرت(٢)
زەمزەمە یا کەوثەرە چاهی زەنەخ(٣)
لەعلە یا یاقووتە لێوی ئەحمەرت(٤)
کەسبی هاڕووتی ئەکا چاوی ڕەشت(٥)
چەندە فەتتانە جەمالی ئەسمەرت
بێ سەبەب لێم زوێر ئەبی لێم دوور ئەبی
جان و دڵ هەردوو بەقوربانی سەرت
حوسنی بێ پەردەت پەسەندی عالەمە
بێ موبالاتی لە زیب و (زێوەر)ت(٦)

........................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٣٩ی کەشکۆڵی (أ) و ل١٥ی کەشکۆڵی (ب) و گۆڤاری بەیانی ژمارە ١٣٧ ل٢٠دا هەیە.
(١) ئەنجومەنی ئارا: مەجلیس ڕازێنەرەوە. ئەنوەر: ڕووناک.
(٢) توتیا: کل، سورجە. بەصەر: چاو. خاکی دەرت: خاکی بەردەرگات.
(٣) چاهی زەنەخ: چاڵی چەناگە.
(٤) لێوی ئەحمەرت: لێوی سوورت.
(٥) هاروت: یەکێکە لەو دوو فریشتەیە کە لە قورئانا ناویان هەیە و کاتی خۆی خەڵکیان فێری سیحر کردووە دوایی خوا غەزەبی لێ گرتوون و لە بیرێکا لە وڵاتی بابل سەرەوژێر هەڵی واسیون و تا ڕۆژی قیامەت دەمێننەوە بەو شێوەیە





بەهەڵواسراوی هەموو کاتێکیش تینوویانە و دەمیشیان ناگاتە ئاوی بنی بیرەکە. ئەم دووە لە ئەدەبی کۆنماندا نموونەی سیحربازی و جادووگەرین.
(٦) زیب: جوان.

## چ شیرین جیلوەییێکی گرتووە*

چ شیرین جیلوەییێکی گرتووە سەوزەی کەوا شیرداخ(١)
کەوا شێر داخ ئەکا شوعلەی نیگاهێکی کە بێ گوستاخ(٢)
هوجوومی کردە موڵکی دڵ سوپای موژگانی گەڕیاوە
بەمیسلی عەسکەری عوسمانیی و تەسخیرەکەی (سابڵاخ)
سوپاهی حوزن و غەم جەمعن لە لام، ئاهم فەلەک گیرە
بەڵێ بۆ زینەتی لەشکر ئەبێ ئامادەبێ بەیداخ(٣)
هەموو دڵ عەکسی تۆی بۆ خۆی بەوەجهی یادگاری گرت
لە نوسخەی موعەتەبەر بێ غایەتە جۆبایی ئیستینساخ(٤)
بەیادی شەهدی لێوی دولبەری زەنبوور قەد، دائیم(٥)
سەراپا جەرگ و دڵ وا لەت لەتە تێیدایە سەد سۆراخ
کە نەگریم و نەناڵێنم لە دووریی تۆ ئەبێ چ بکەم؟
نسیبی عاشقی بێ چارە شەو گریانە ڕۆژیش ئاخ
ئەگەر ئەهلی کەماڵی ڕوو لە ئارایش مەکە هەرگیز
لە مەعنا تێفکرە، مەنوارە ڕوخسار و سەر و ساچاخ
چ ظاهیر بینن ئەهلی ئەم زەمانە فەرقی کەس ناکەن
(مونەووەر) دڵ پەرێشانە بەشانەی پۆشتە و پەرداخ
لە کەس ناترسێ بۆیە حاڵی (زێوەر) ئێستە ناپرسێ
چ موحتاجە بەمورغی خانە بازو وەحشیی سەرشاخ

........................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٤١-١٤٢ی کەشکۆڵی (أ) و ل١٦ی کەشکۆڵی (ب)دا نووسراوەتەوە لە ژمارە ١٣٧ی گۆڤاری بەیان ل٢٠دا بڵاو کراوەتەوە.
(١) جیلوە: دەرکەوتن، شێوە. سەوزە: گەنم ڕەنگ. شیرداخ، جۆرە قوماشێکی خەت خەتاوی سەردەمی شاعیر بووە.
(٢) شوعلە: ترووسکە. نیگاه: تیلەی چاو. گۆستاخ: نەترس و پێ پەروا. داخ: بریتییە لە شیشە ئاسنێکی سەرپانی تایبەتی بەئاگر سووردەکرێتەوە هەموو خاوەن ئاژەڵێک گوێی مەڕ و بزن و حەیواناتی خۆی پێ داخ دەکا بۆ ئەوەی لە هی یەکێکی تر جیابکرێتەوە.
لەنێوان (شیرداخ) و (شێر داخ)دا جیناسی موڕەکەب هەیە، چونکە یەکەمیان یەک وشەیە و دووهەمیان دوو وشەی بەیەکەوە بەستراون.

(٣) واتە: لەشکری خەم و خەفەت لە دەورم کۆبوونەتەوە و دووکەڵی هەناسەم بەرزبۆتەوە بۆ عاسمان، دیارە ئەمەش شتێکی سروشتییە چونکە بۆ ڕازاندنەوەی لەشکر ئاڵا پێویستە. کەوابوو دووکەڵی هەناسە بووەتە ئاڵای لەشکری خەم و خەفەتم.
(٤) واتە: دڵم وەکو کامێرەیەکی فۆتۆگراف وێنەی تۆی بۆ یادگار گرتووە و بەس، نەک بەو هیوایە کە بیرۆشی بەو وێنەیە بێ و واز لە تۆ بێنێ چونکە تۆ بۆ خۆت نوسخەی ئەصڵیت و وێنەی دڵم ئیستینساخە دیارە تا نوسخەی ئەصڵی بێ نوسخەی گیراوە ئیعتیباری پێ ناکرێ چونکە فەرقی ئەم و ئەو عاسمان و ڕێسمانە.
(٥) شەهد: هەنگوین، شیرینی. زەنبوور قەد: قەدباریک. زەنبوور: زەردەواڵەیە، یان شامە تزینکەیە کە هەردووکیان قەد باریکن شاعیران بەکاریان هێناوە بۆ ئافرەتی قەد باریک.

## کەسێ تەشبیهی باڵای تۆ..*

کەسێ تەشبیهی باڵای تۆ بەسەرووی نەونەمامی کرد
زەمانی لازمە ببڕن بڵێن تەرکی کەلامی کرد
لە بەردەم کەعبەیا گەر مەنعە، صەبیادیی لە بەرچی بوو
لەبەر میحرابی ئەبرۆتا دوو چاوت قەتڵی عامی کرد!
بەمەدحی ڕووی و مووی و قامەتی ڕێکت زمان لاڵە
ئەگەرچی دڵ بەپەنهانی خەیاڵێکی تەمامی کرد
ئەتۆی ڕۆژێ کە پێت دانا لە خانەی سینەما دڵ ڕۆی
عەجائیب قەدری میهمانی نەگرت و زوو قیامی کرد
مەڵێن: مورغی دڵت بۆچی گرفتاری نیگارت بوو
بە غەممازیی هەزارێکی وەها مەحبووسی دامی کرد
نیگاهێکی نەکردە قەلبی زارم دولبەرم ئەمڕۆ
وەکو ئاهوو، وەکو تاووس بەبەر چاوما خەرامی کرد
صەبا! گەر تۆ بەکۆی جانانە واصڵ بووی بڵێ: (زێوەر)
لە حەسرەت ئیشتیاقی تۆ بەجارێ تەرکی کامی کرد

..............................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٤٢-١٤٣ی کە کەشکۆڵی (أ) و ل١٧ی کەشکۆڵی (ب) نووسراوەتەوە، هەروەها لە گۆڤاری بەیان ژمارە ١٣٧ ل٢٠دا بڵاو کراوەتەوە.
مورغ: باڵندە. گرفتار: دووچار. غەمماز: توانج گر. هەزار: بولبول. ژمارەیەکی دیاریکراویشە. مەحبووس: بەندکراو. دام: داو. قەلبی زار: دڵی نارەحەت و بریندار. ئاهو: ئاسک. خەرام: کردەوەییێکە کە لە ڕووی نازەوە بێ کینایەیە لە ڕۆیشتنی بەناز و لارولەنجە. صەبا: شنەبای بەیانی. کۆی جانانە: هەوار و مەندەڵی خۆشەویستان. کام: ئارەزوو.

## زاهید وەرە*

زاهید وەرە ئەمجارە بکەن تەرکی هەموو کار(١)
بێنە نەزەری دولبەری پڕ دانشی عەییار(٢)



ئەی شێخ و مەلا پیر و جوان ئێوە لەبەرچی
نایێنە تەماشا و نیگەهی ڕۆژی دووسەد جار
شەو ڕۆژە، بەڕۆژ، ڕۆژ ونە، حەیران لە فەلەکدا
وەختێ کە لە ماڵ بێتە دەرێ تورکی ستەمکار(٣)
ڕوومەت گوڵ و موو سونبول و قەد وەکو عەرعەر(٤)
بۆ سەیری ئەوەستن لە سەما سەبعەی سەییار(٥)
میحرابی برۆی جووتە وەکو قەوس و مووژەی تیر
تێی کردووە ڕوو ئەرمەنی و شیعەو و کوففار
ئەی دڵ بەعەبەث ناڵەی بێ فائیدە بۆچی
تەئسیری نییە ناڵەی عاشق لە دڵی یار
زێوەر! بەسە زاری کە لە زاریت هەموو عالەم
بێزارن و غەمبارن و ئەندوە و دڵ ئازار

..............................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٤٤-١٤٥ی کەشکۆڵی (أ)دا نووسراوەتەوە لە ل١٨ی کەشکۆڵی (ب)یشدا هەیە.
(١) زاهید: صۆفی بەڕواڵەت خواپەرست.
(٢) دانش: عەقڵ و کارەمایی. عەییار: زۆرزان تێهەڵاتوو چاوبەست و پیاو خەڵەتێن.
(٣) تورک: لە ئەدەبی کۆنماندا بەمانا جوان و ڕێکوپێکییە. ستەمکار: زۆردار و زاڵم.
(٤) سونبول: سمڵ، گوڵی سمڵ. عەرعەر: سەرووی کێوی، درەختێکە کەمێک لە سەرووی عادەتی کورت و بچووکترە.
(٥) سەبعەی سەییارە: (السبعة السيارة): حەوت ئەستێرەن: (عطارد، الزهرة، الأرض، المريخ، المشتري، زحل، أورانوس). ئەمەیان ساڵی ١٧٨١ زانایەک کە ناوی (هرتسل) بوو دۆزییەوە دوو ئەستێرەی تریش دۆزراونەوە (نبتۆن و بلوتون) نبتۆن ساڵی ١٨٤٦ی ز (لی فرییە) دۆزیەوە. (بلوتون)یش ساڵی ١٩٣٠ی دۆزرایەوە واتە: وێنە و نیگاری یارم وەکو مێرگ و مێرغوزارێکە هەموو جۆرە شتێکی جوان و بۆنخۆشی لە خۆگرتووە و بەڕوومەتی وەکو گوڵی و کەزیەی بۆن خۆشی و قەدی ڕاستی عەرعەری نەک تەنیا بنیادەم و خاوەن عەقڵ و فامی سەرسام کردوون و بەس، بەڵکو ئەستێرە گەڕۆکەکانیشی هێناونە سەیر و تەماشا کردن.

## یەک لەحظەی ویصالت*

یەک لەحظەی ویصالت ئەی ماهی میهر پەروەر(١)
نایدەم بەتەخت و تاجی داراو و مولکی سەنجەر(٢)
کێ بێ بەڕابەرت بێ، مووژگانی خەنجەرینت(٣)
جەوهەر دەبا لە خەنجەر، خەنجەر ئەدا لە جەوهەر(٤)
یاڕەب حەیاتی ئێمەی بۆ خستە ناو هیلاکەت
دەم چەشمەی حەیاتم مەحبووبی چیهرە ئەسمەر(٥)





هەرکەس بەدەردی عەشقت سووتا دەروونی ڕوونی
بۆ ئاتەشی مەصائیب دەڕوا وەکو سەمەندەر(٦)
ماددەی نیشاطی ئێمە یا هیجرە یا گرینە
بۆ فیعلی عاشقانتا، ئەو شۆخە بۆتە: مەصدەر
مەنوێنە دیدە جانا، بنوێنە ئاینەی ڕوو
تا ڕووی ببێتە بەر بەند ئایینەی سکەندەر(٧)
دەنووکی وەک قولنگە بۆ سەطحی صەفحەی گوڵ
بولبول ئەگەر ببینێ یەک دەفعە ڕووی دولبەر(٨)
(زێوەر) لە تەعنی زاهید بێ باک و بێ خەیاڵە(٩)
کەی خەوف ئەکا لە مالووم ڕەند مەشرەبی قەلەندەر(١٠)

..........................................

* ئەم شیعرە لە ل١٤٣-١٤٤ی کەشکۆڵی (أ)دا نووسراوەتەوە.
(١) لەحظە: چاوترووکاندن. ویصال: پێ گەیشتنت. ماهی میهرپەروەر: مانگی ڕۆژپەرست.
(٢) دارا؛ داریوش کودومان: پاشای ئێران بووە ساڵی ٣٣٥- ٣٣٠ پ.ز کوڕی داریوشی دووەم بووە. ئەسکەندەری مەکدۆنی ساڵی ٣٣٣پ.ز بەسەریدا زاڵ بوو.
(٣) خەنجەرین: خەنجەر ئاسا، تیژ وەکو خەنجەر.
(٤) (جەوهەر)ی یەکەم: ئەو خاڵ و پەڵەپەڵانەیە کە بەسەر خەنجەری دەبانەوە دەبینرێ بەتایبەتی کاتێ کە مشتومال دەکرێ. (جەوهەر)ی دووەم مەبەستی جوزئی لایەتەجەززایە کە قبووڵی کەرت کردن ناکا، مەبەستی ئەوەیە ئەوەندە تیژە جەوهەر دەپێکێ.
(٥) چەشمە: سەرچاوە. چیهرە: ڕوخسار.
(٦) ئاتەش: ئاگر. سەمەندەر: گیانلەبەرێکە لە شێوەی مارمێلکە لە ناو ئاو و وشکانیشا دەژیا هەر کاتی بگاتە ئاگر ماددەیەک لە لەشی خۆی دەردەکا ئاگرەکەی پێ دەکوژێنێتەوە لەم ڕووەوە گوتوویانە سەمەندەر گیانلەبەرێکە لەناو ئاگرا ناسووتێ.
(٧) ئاینەی سکەندەر: ئاوێنەی ئەسکەندەر، دەڵێن ئەسکەندەری مەکدۆنی ئاوێنەیەکی هەبووە هەموو دنیای تێدا دیار بووە.
(٨) واتە: ئەگەر بێتو بولبول جارێ ڕووی یار ببینێ بێ شک گوڵی پێش چاو دەکەوێ و بەدەندووکی شڕوڕی دەکا و دەیخاتە لاوە.
(٩) تەعن، طەعن: تانە و سەرزەنشت.
(١٠) مالووم: پیاوی ئایینی جوولەکانە. قەلەندەر: دەروێش، کەسێک هیچ شک نەبا دەستی لە دنیا شتبێ.

## چاوی وەک بادامی تۆ*

چاوی وەک بادامی تۆ عومری بە با دام ئەی پسەر(١)
ئاگرت بەردایە خەرمانی وجوودم وەک شەرەر(٢)
ظوڵمەتی ئابی حەیاتە گیسووانی عەنبەرین(٣)
یا وەکو «هالە» لە ناوخۆی گرتووە شوعلەی قەمەر(٤)



دەم بەدەم هەر لەحظە، هەر ساتێ ئەناڵێنم بەجۆش
ئەی خوا ساکەی حەبیبم سەر لە ماڵ بێنێتە دەر؟
صەبر و هۆشم چوو بەتاڵان ئەقڵ و فامیشم نەما
لەشکری دەرد و فیراقت حەملەیان هێنامە سەر
بەس ببارێنە سوروشک ئەی دیدە ڕەنجت بوو عەبەث(٥)
بەس بناڵێنە ئەتۆ ئەی دڵ لە یار ناکا ئەثەر
ئیلتیفاتێکی نەماوە گاه گاهێ دلبەرم
بۆ نەکەم خاکی هەموو دنیا بەسەر، خاکم بەسەر!
ئینتیخابی کردووە (زێوەر) لە دنیادا یەکێ
دەستی لێ هەڵناگرێ گەر بێتە ڕێی سەد شۆڕوشەڕ

..........................................

* ئەم شیعرە لە ل١٤٥-١٤٦ی کەشکۆڵی (أ) وەرگیراوە.
(١) پسەر: کوڕ. لە نێوان (بادام) و (با، دام)دا ڕەگەزدۆزییەکی جوان هەیە.
(٢) خەرمانی وجوودم: خەرمانی تەمەنم. شەرەر: پڕیشکە ئاگر.
(٣) ظوڵمەت: تاریکی. ئاب: ئاو. گیسووانی عەنبەرین: زوڵفی بۆن خۆش وەک بۆنی عەنبەر. واتە: زوڵفی ڕەش و بۆن خۆشت کەوا دەم و چاوی داپۆشیوی تاریکایی دەورەی ئاوی حەیاتە؟ ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە دەڵێن: ئاوی حەیات لە تاریکاییدایە.
(٤) هالە: ئەو شێوەیە کە مانگ خەرمانە دەدا و هەوری ڕەش دەوری دەدەن و تاهەورەکان ڕەش و پڕتر بن شۆقی مانگەشەوەکە جوانترە.
(٥) سوروشک: فرمێسک. عەبەث: بێ هوودە.

## صوبحی گوڵشەن*

صوبحی گوڵشەن کەی ئەگاتە لەززەتی لەیلی ویصال(١)
شەمعی مەجلیس کەی بەرابەر بوو لەگەڵ شەوقی جەمال(٢)
پڕتەوی نووری جەبینت لالەیی هەر مەجلیسە(٣)
شەوچرای بەزمی دڵانی، بێتە مەیدانی خەیاڵ
شاهڕاهی کۆیی تۆ هەروەک طەریقی جەننەتە(٤)
هەر کەسێ ئەو ڕێگە بگرێ هاتە سەر ڕێگەی کەماڵ
دەستی من ناگاتە داوێنت، لە ئەوجی عیززەتی
من گەدای بێ نەوا، تۆ پادشای صاحێب جەلال
دەفعەیێ سا شادمانم کە بەوەعدەی وەصڵی خۆت
تابەکەی عومرم گوزەرکا هەر لە ڕێی هیجر و مەلال





بادیەی غەم بێ دەلیلە دڵ لە ناویا کەوتووە
چاوی لوتفی خۆتی سەرخە، بێ بەسەر چەشمەی زولال(٥)
نەونیهالی ئارەزۆی هەر کەس زەڕە گەر بێ زەڕە
ئیعتیباری هەر کەسێکە «زێوەر» ئێستا نەقد و ماڵ

.......................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٤٨-١٤٩ی کەشکۆڵی (أ) وەگیراوە.
(١) صوبحی گوڵشەن: سەیر و سەفای ناو باخ دەمەدەمی بەیانی و پێش هەتاو کەوتن کە ئەوکاتە باخ و گوڵزار خۆ بەجوانی دەنوێنن. لەیلی ویصاڵ: شەوی بەیەک گەیشتنی دوو دڵ و دڵخواز و خۆشەویست.
(٢) شەمعی مەجلیس: چرای مەجلیس. شەوقی جەماڵ: شۆقی جوانی یار.
(٣) پڕتەو: ڕووناکی. جەبین: ناوچاوان، ڕوخسار. لالە: گوڵێکی جوان و بەشۆقە بەزۆری لە جێگای تەڕ و شێداردا دەڕوێ بەعەرەبی (شقائق النعمان)ی پێ دەگوترێ گەلێ جۆری هەیە سێ پەڕ، پێنج پەڕ، ماڵیش و کێویشی هەیە کێوییەکەی پەڕەکانی سوور و بنی پەڕەکانی خاڵێکی ڕەشی پێوەیە.
(٤) شاهراه: شا ڕێ. کۆ: کەژ و کێو
(٥) دەشێ ئەم نیوە دێڕەی دووەم بەم جۆرە بێ، (چاوی لوتفی خۆتی سەرخە بیبە سەر چەشمەی زولال).

## هەرگیز*

هەرگیز نەبووم بەخۆشیی ئەم کائیناتە مائیل(١)
ئیللا لە گەردنی تۆ دەستم بکەم حەمائیل(٢)
دەریای غەم شەپۆلی یەلکانی جیسمی هەڵدا(٣)
تێک چوو وجوودی نابوود، کەوتۆتە گێژی هائیل(٤)
ساقی بەعەشقی پیرت چاوم لە دەستی تۆیە(٥)
دەستی کەرەم پەیاپەی مەگرە لە مەردی سائیل(٦)
ئەی عاریفی حەقیقەت، وەی سالیکی تەریقەت(٧)
پیری موغان پەنایە بۆ حەللی هەر مەسائیل(٨)
عەکسی جەماڵی جانان شەوقی لە هەر دڵێ دا
گەر کێوە زوڵمەتی غەم زوو بوو وجوودی زائیل
هەر ناڵە ناڵی دڵمە وەک قومریێکی بێ باڵ(٩)
تاکەی ببێ بەوەصڵی ئەو سەر و قەددە نائیل(١٠)
دیسان ڕەقیبی وەک سەگ ڕووی کردە ئاسکیماڵی(١١)
کوا صاحیبی دیانەت مەنصووصە دەفعی صائیل(١٢)
عومدەی مەرامی عاشق جەلبی دڵی نیگارە
وەک فەزڵەیە لە لای ئەو، سیم و زەڕ و فەضائیل





چۆن نامەیێ بنووسێ وەختی فیراقی جانان
(زێوەر) کەوا سوروشکی وەک سەددە، بۆتە حائیل

.......................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٤٩-١٥٠ی کەشکۆڵی (أ) وەرگیراوە.
(١) مائیل: ئاواتەخواز.
(٢) حەمائیل: ئەوەی ڕاست و چەپ لە مل کرابێ وەک فیشەک لەغ و شمشێر و تەسبیحی دەروێشان و دوعای لە کیف گیراو و شتی وا.
واتە: هەرگیز من بۆ خۆشی و ژیان بەسەربردن لەم بوونەوەرەدا ئاواتە خواز نەبووم و، نابم مەگەر بۆ ئەوە کە خوا بۆم بڕەخسێنێ دەستم لە گەردنی تۆ لاونیو وەربهێنم و لە ئامێزت بگرم.
(٣) یەلکان: مەنجەنیق.
(٤) هائیل: ترسناک.
(٥) ساقی: گەنجی شەراب گێڕ. پیرت، پیر: مەبەست پیری مەیخانەیە.
(٦) سائیل: سواڵکەر.
(٧) عاریفی حەقیقەت: عارف: بەشێخێکی پێگەیشتوو دەڵێن. سالیک ڕێڕەو. طەریقەت: تەریقەت: ڕێ و شوێن و دابونەریتی صۆفیانە و دەروێشانە.
(٨) پیری موغان: پیری سەر گەورەی موغەکان.
(٩) قومری: باڵدارێکی خاکییە لە کۆتر پچووکترە جووت جووت بەیەکەوە دەژین.
(١٠) نائیل: بەمراد گەیشتوو.
(١١) ڕەقیب: بەدکار، ئەو کەسەی جاسووسی بەسەر دوو دڵداری عەشقەوە دەکا. ئاسکی ماڵی: مەبەست کچی جوان و تازە پێگەیشتووە.
(١٢) صائیل: هەڵمەت بەر. مەنصووصە دەفعی صائیل: واتە لە ئاینی ئیسلامدا گێڕانەوە و دەرکردنی هەڵمەت هێنەر بۆ سەر گەنج و خەزێنە دەقێکی چەسپێنراو و بنەڕەتییە لە قورئان و حەدیثدا هەیە.

## لە گۆشەی حوزنەدا...*

لە گۆشەی حوزنەدا ماوم، زەلیلی کونجی هیجرانم
دڵی خۆم زۆر بەخۆم سووتا لە چاوی پڕ لە گریانم(١)
ئەگەر حاڵم ئەپرسی -دوور لە چاوت- کوێرە بینایێم
بەڕەنگی پەرچەمت ئەمڕۆ سییەه ڕۆژ و پەرێشانم(٢)
هەتاکەی مەستی خوابی غەفڵەتی ئەی بەخت، ئیمدادێ
لە تەئثیری منیش یەکبارە شێواون ڕەفیقانم(٣)
قوصوورم گەر هەیە قوربان وەرە ئەمجارە بمبەخشە
هەچی کردوومە، کردوومە، پەشیمانم، پەشیمانم(٤)
بە نیمە نازەکەت ڕوحم، بەنیمە خەندە دڵ حازر
خەیاڵی خام نەکەی هەرگیز ئەمن هەر عەبدی جارانم(٥)

بەمیـثلی مووری بێ چارە لەبەرپێی هەر کەسا کەوتووم
هەتا ڕەنجیـدە خـاطر بێ لە من شـاهی (سلێـمـانم)[6]
مەڵێ (زێوەر) چییە، بێ جەوهەرە من تالیب بەئەو نابم
لە بۆ قـەتعی غـەمی قـەلبت وەکـو تیـغی خـوراسـانم

........................................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٥٢-١٥٣ی کەشکۆڵی (أ)دا نووسراوەتەوە هەروەها لە ل٢٥ی کەشکۆڵی (ب)یشدا هەیە، لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ١٢٧، لاپەڕە ٨٠ شدا بڵاوکراوەتەوە.

(١) کونجی هیجران (کەشکۆڵی أ) دەشتی هیجران سەرچاوەکانی تر.

(٢) سییەه ڕۆژ: ڕۆژی ڕەش.

(٣) خوابی غەفڵەتی: خەوی بێ ئاگایی.

(٤) هەچی: هەرچی.

(٥) خەیاڵی خام: خەیاڵی خاو. عەبد: کۆیلە.

(٦) موور: مێروولە. ڕەنجیدە: زویر، ڕەنجاو. خاطر: دڵ.

لە کۆکردنەوەی (موور) و (سولەیمان) و (لەبەرپێ داکەوتن) ئاماژەی بۆ ئەو چیرۆکەی قورئان کردووە کە لە سوورەتی (نمل)دا دەیگێڕێتەوە: کە کاتێ سولەیمان و لەشکرەکەی بەدۆڵێکدا دەڕۆیشتن لە شارە مێروویەک نزیک بوونەوە مێروولەیەک بەمێروولەکانی تری گوت (... یاأیها النمل ادخلو مساکنکم لایحطمنکم سلیمان وجنوده وهم لایشعرون) «سوورەتی نەمل ئایەتی ١٨». واتە ئەی کۆمەڵی مێروو هەریەکەتان بچێتەوە شوێنی خۆی با سلێمان و لەشکرەکەی پانتان نەکەنەوە و نەتان پروێنن.

## لا بوون لە پەیوەندی*

١٩٢٢م

قیـمـەتی باخی بەهەشتـە غـونچـەیی خـەندانی خۆم
حـەسـرەتی ئاوی حـەیاتە قـەترەیی گـریانی خـۆم[1]
تۆبەیێکم کـردووە وەک کـێـوی ئاسن مـەحکەمـە
تا لە دونیـادا بمێنم عـەشـقی چاومـەسـتـانی خـۆم
نیـعـمـەتی دنیـا سـەراسـەر با لە بۆ تۆ بێ ڕەقـیب[2]
بەسمە تەنها فیکری بیکر و جیلوەیی جانانی خۆم[3]
دەشـتی تەنهـایی چ خـۆشـە بۆ منی پڕ غـائیلە
چونکە تەنها غار ئەکەم هەم ئەسپ خۆم مەیدانی خۆم
تازە تەڵقـینم ئەکەی لادەم لە عەشقی گـوڵ ڕوخان[4]
تووخوا لێم لادە واعـیظ دینی خۆم ئیـمـانی خۆم[5]





من بەسـەد ئیـسـویچـرە و چین و خەتای ناگـۆڕمەوە[6]
ئەرخەوانی گردی سەیوان، ئاوی کانێسکانی خۆم[7]
بۆچی بوخـتـان کـەم کـە شـەیتـانە گـوناهم پێ ئەکـا
من چ شـەیتـانم نییـە هەر نەفسـمـە شـەیتـانی خۆم
بۆیە زۆر پێم خـۆشـە پیـریی و خـەمـیـدە قـامـەتی
چونکە دەسـتم هەر دەگـاتە گـۆشـەیی دامـانی خـۆم
سـەیلی عـیـصـیـانم ئەگـەر دیجلە و فـوراتە قـەترەیە
سـەددەیی ڕێگـەی نەجـاتە پاشـای گـەیلانی خـۆم

........................................................................

* ئەم شیعرە لە ل٣٢-٣٤ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.

(١) ئاوی حەیات: کانییەکە ئەڵێن هەر کەسێ لێی بخواتەوە نامرێ.

(٢) ڕەقیب: بەدکار، ئەوەی بەدکاریی لەنێوان یاران و دڵداران دەکات.

(٣) فیکری بیکر: بیری ورد و تازە پەی پێ بردووە.

(٤) گوڵ ڕوخ: بەکەسێ دەوترێ دەم و چاوی وەکو گوڵ سوور و نازک بێ.

(٥) واعیظ، واعظ: ئامۆژگاری کەر.

(٦) ئیسویچرە: سویسەرە. خەتا: ناوی کۆنی سەرووی وڵاتی چینە کە بەناوبانگە بەبۆنی خۆشی میسک.

(٧) نەجمەدین مەلا دەڵێ: (لەم نیوە شیعرەدا ئەرخەوانی گردی سەیوان و ئاوی کانی ئاسکان ئەبێ ورد بکرێتەوە. چونکە خۆمان ئەیزانین بەڵام پێویستە خاوەر شوناس موستەشریقێکیش بیزانێ.

ئەرخەوانی گردی سەیوان: گردی سەیوان گۆڕستانی شاری سلێمانییە، ئەرخەوان: درەختێکی بێ بەرە بەگردی سەیوانەوە بەزۆری ڕواندراوە لە بەهاردا گوڵێکی ئاڵ ئەکا زۆر جوانە. کانی ئاسکان گەڕەکێکی سلێمانییە ئاوێکی خۆشی هەیە بەڵام لە شیعرەکەدا «کانی سکان» ئەخوێنرێتەوە.

## لە هیجرا*

لە هیـجـرا ڕوو لەساقی و شـیـشـەیی صـەهبـا نەکـەم چ بکەم
وجـوودم گـەر بەفـەرشی مـەیکەدە و مـینا نەکـەم چ بکەم؟[1]
لە نـاو طۆفـــانـی ئەفکارا نـەهەنگی (لا الە) هەســـتێ
تەشەببوث گەر بەکەشتیی نووحی (إلا اللە) نەکەم چ بکەم؟[2]
مـەتاعی حـوسنی ئەو مـەحبـووبە نەقـدی داغ و سـەودایە
لە بازاڕی مـوحـەبـبـەتدا بەڕۆح سـەودا نەکـەم چ بکەم[3]
ئەوا مـــەحـــروومی خـــۆی کـــردم، دڵی بردم، دەری کـــردم
بە سـۆزی دڵ هەمـوو دەم ڕوو لە قـاپیی خـوا نەکـەم چ بکەم

له هەرلا ضەبطی ناکەم موددەعی تا تۆ ڕەئیسم بی
بە قانوونی مرووەت گەر ڕەجا ئیجرا نەکەم چ بکەم
بە ڕوتبەی وەصڵی ئەو ناگەم ئەگەر عومرم هەموو دانێم
لە دەست ئەو زاڵمە لەم کارە ئیستیغنا نەکەم چ بکەم(٤)
ئەڵێن: ئەوراقی زوڵمی تۆ تەواو نابێ بەتەحریرات
وەکو (زێوەر) بەتەقریر گەر ئەدای مەعنا نەکەم چ بکەم(٥)

........................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٥١-١٥٢ی کەشکۆڵی (أ) و هەروەها ل٢٥ی کەشکۆڵی (ب)دا نووسراوەتەوە. لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ١٢٧ ل ٨٦یش دا بڵاوکراوەتەوە.

(١) هیجر: دووری لە یار. ساقی: مەی گێڕ. شیشە: شووشە. صەبا: مەی. مەیکەدە،: مەیخانە. مینا: شووشە و پیاڵە.

(٢) نەهەنگی (لا اله): مەبەستی کوفر و خوانەناسییە. تەشەببوث: دەستەودامان.

(لا اله) بۆ خۆی نەفییەکی گشتییە ئەگەر بەتەنها بگوترێ (کوفرە) چونکە نەفی هەموو پەروەردگارێک دەکا. بەڵام وتنی (الا الله) نەفییە گشتییەکە خاص دەکا، بوون و وجوود بۆ پەروەردگارێکی خاوەن توانای حەق دەچەسپێنێ، کەوابوو (لا اله) بەتەنیا وەکو تۆفان و شەپۆلی دەریا و نەهەنگی لەناوبەر وایە پێویستی بەکەشتی ڕزگار بوون هەیە. جا لێرەدا شاعیر دەڵێ: ئەگەر لە نێو تۆفانی فکر و ئەندێشەدا نەهەنگی سامناکی خوا نەناسی و گومڕایی دەوری من بدا، ناعیلاجم دەستەودامێنی وتنی (الا الله) ببم ئیعتیراف بەبوونی خوایەکی عالم و زانا و خاڵی لە هەموو خەوش بکەم کە ئەم ئیعتیراف و دان پیانانە وەکو کەشتی نوح وایە ڕزگارم ئەکا لەو تۆفان و دەردی سەرییە. دەی کە وا نەکەم چی بکەم و چارم چییە؟!

(٣) (سەودا)ی یەکەم بەمانا عەشق و ئەوینە. (سەودا)ی دووەم بەمانا کڕین و فرۆشتنە، لە نێوان دوو وشەی (سەودا) و (سەودا) دا جیناسی چوون یەک هەیە.

(٤) ئیستیغنا (کەشکۆڵی) (أ) ئیستیعفا (بەیان) ئیستیغنا: واز لێهێنان.

(٥) گەر (کەشکۆڵی) (أ) ئەر (بەیان).

## بەم فیرقەتی تۆ..*

بەم فیرقەتی تۆ هەروەکو دێوانە دەناڵم
بەرقی غەمی تۆ ئاگری بەرداوەتە ماڵم
پەروانەم و پەروای سەری خۆم نییە بێ تۆ
دێوانەم و سەحرا بووەتە خانەو و ماڵم
پەنجەم وەکو تیشە لە فیراقت لە فەرق دا
فەرهادم و کوا ئەرمەنیی دیدە غەزاڵم؟(١)
خاڵی سیەهت کەوتە ئەسەر لەعلی بەدەخشان
بۆ نەیکەمە قوربانی لە بت فیکر و خەیاڵم(٢)
بۆ پەرچەمی پڕ چینی ئەتۆ ڕۆحە فیدای بێ
بۆ قیمەتی ماچێکە دەبەخشم سەر و ماڵم





هەرچەندە کە طوڕڕەی وەکو ڕێحانەی باغە
پابەندی ئەوێ نیم و ئەسیری خەت و خاڵم(٣)
هیجرانە لە یاران و ڕەفیقان و عەزیزان
مەعلوومە کە وەک قومریی بێ چارە دەناڵم(٤)
دوێنێ کە لە جانیب منەوە تووشی خەفەت بووی
یارەببی دەسی من بخەیە کۆتەی زاڵم(٥)
مەشغوولی خەیاڵی لەبی لەعلی نمەکینە
ساعات و دەقیقە، شەو و ڕۆژ و مەه و ساڵم(٦)
ڕەحمەت لە دڵا بێت و نیگاهێ بەسە بۆ من
گاهێ بەغەڵەط تۆ خەبەرێ بگرە لە حاڵم
(زێوەر) بەتەمای میهر و وەفای تۆیە ئەگەرچی
نەی دیوە بەجوز یاری جەفا پیشەو و زاڵم(٧)

........................................................

* ئەم شیعرە لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ١٢٧وەرگیراوە.

(١) تیشە: تەشوێ. فیراق: دووری. فەرق: ناوەڕاستی تۆقە سەر. ئەرمەنی: شیرینی ئەرمەن، دڵداری فەرهاد. دیدە غەزال: چاوی وەکو چاوی ئاسک جوان.

(٢) خاڵی سیەهت: خاڵی ڕەشت. لەعل: بەردێکی سووری گرانبەهایە لەکان دەردەهێنرێ. بەدەخشان: وڵاتێکە لە ڕۆژهەڵاتی باشووری ئێرانە بە کانی لەعل بەناوبانگە. لێرەدا لەعلی بەدەخشان: مەبەست لێوی ئاڵ و سوورە.

(٣) طوڕڕە: زولفی پێچ پێچ و لوول. پابەند: قاچ بەستراو.

(٤) قومری: باڵدارێکی خاکییە لە کۆتر پچووکترە.

(٥) کۆتە: کۆت و زنجیر.

(٦) لەب لێو. لەبی لەعلی. لێوی سوور وەکو لەعل. نمەکین: پاراو و بەتام و مەزەدار. مەه و ساڵم: مانگ و ساڵ.

(٧) میهر و وەفا: خۆشەویستی و ئەمەکداری، هەروەها (میهر) و (وەفا) ناوی دوو دڵداری ئەوینن وەکو مەجنون و لەیلا، شیرین و خەسرەو، شیرین و فەرهاد، وامیق و عەزرا، بەهرام و گوڵەندام، مەنیجە و بیژەن.

## چریکەی بولبولی دڵ*

چریکەی بولبولی دڵ، شۆڕشی ئەفغانی پڕ جۆشم
چ خۆشە! گەر بگاتە سەمعی یاری مەست و مەدهۆشم؟!
بە نەشئەی چاوەکەی مەستم، کەوا ئوفتادەیی خاکم(١)
وە گەر نە عالەم ئەیزانێ نە بەنگ کێشم نە مەی نۆشم
لە داغی لالەیی چیهرەی ئەریژێ دیدە سەیلی خوێن
لە حەسرەت سونبولی زوڵفی وەکو عەبدی سیاپۆشم(٢)

له هیجری خوسرەوی خووبان و شیرینی زەمان هەرگیز
نە کیسا و باربود ئەم شەو صەدای نایێتە بەر گۆشم(٣)
نەوەک هەر کوشتەی تەعنەی ڕەقیب و تیری ئەعداتم
ذەلیلی تالیعی خۆم و ئەسیری پەرچەمی تۆشم(٤)
مەڕەنجێ گەر دەهان بەستە و زوبان لاڵم لە خزمەتدا
لە گریە و ناڵە و شێوەن وەکو پەروانە خامۆشم(٥)
چ موحتاجە بە (زێوەر) ئەو کە ماه و شاهی خووبانە
فەریدی عالەمە، بۆیە بەجیلوەی قەددی مەدهۆشم(٦)

..........................................................

* ئەم شیعرە لە کەشکۆڵی (أ) ل٠١٥-١٥١دا نووسراوەتەوە لە گۆڤاری بەیان ژمارە ١٢٧ ل٨٠شدا بڵاو کراوەتەوە.
(١) ئوفتادە: کەوتوو.
(٢) لالە: گوڵی لالە. چیهرە: ڕوخسار. سەیل: لافاو. سونبولی زولفی: واتە زولفی کە وەکو سونبول وایە لە شێوە و شکل و بۆندا. عەبد: کۆیلە. سیا پۆش: ڕەش پۆش.
(٣) خەسرەوی خووبان: پاشای جوانان. لە کۆکردنەوەی (خەسرەو و شیرین)دا ئاماژەی کردووە بۆ چیرۆکی دڵداریی شیرین و خەسرەو. نەکیسا و بار بوو: دوو گۆرانیبێژی سەردەمی خوسرەوی پەروێز بوون، یان دوو ئامێری مۆسیقان.
(٤) تەعنە، طەعنە: تانە و لۆمە. ڕەقیب: بەدکارو ناحەزی نێوان دڵداران. ئەعدا: دوژمن. تالیع = طالیع: بەخت و شانس.
(٥) دەهان: دەم.
(٦) ئەو کە ماه و شاهی خووبانە: ئەو کە مانگ و پاشای جوانانە.

## ئەی دولبەری شیرین*

ئەی دولبەری شیرین سوخەنی غونچە دەهانم!
لەو وەصفی دەمی بەستەیەتە، بەستە زوبانم(١)
بێزارم و بێ زاریی شەوم نەبووە کە بڕوا
بێ طەلعەتی ئەو شەمسەمە تاریکە ژیانم(٢)
بۆ سەیری ڕوخی ئاتەشییەت! بوومە مەجووسی
لەم عەصرە منیش واریثی زەردەشتی زەمانم(٣)
چاوت کە «گەلاوێژ»ە «سووها» ڕەنگە گەلاوێژ
هەر دەربکەوێ لەرزە ئەخاتە دڵ و گیانم(٤)
تەصویری گوڵ و باخچە ئەکەن غەیری گوڵی ڕووت
حەیرانی غەڵەت کردنی ڕەسسامی جیهانم(٥)
ئەو ڕوویی فەرەح ئاوەرە وەک فەجری بەهارە
من لەو ڕووەوە هەرچی بڵێم ڕووتە بەیانم



دوورن لە هونەر هەرچی هەیە صاحێبی دینار
مەمنوونی پەلی پینەچیی و شانی سەپانم

..........................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٥٥-١٥٦ی کەشکۆڵی (أ)دا هەیە هەروەها لە ژمارە ١٣٧ی گۆڤاری (بەیان)یشدا بڵاو کراوەتەوە.
(١) دەهان: دەم. سوخەن: قسە و گفتوگۆ. بەستە: بەری دارێکە لە ڕەگەزی گوێز، شاعیران کردوویانە بەنموونەی دەمی پچکۆلە. شایانی باسە جیناسێکی جوانیش لە نێوان (بەستە) و (بەستە زوبان)دا هەیە.
(٢) بێزارم: ناڕەحەت و خەمناک. بێ زاریی: بێ گریان و ناڵە. لە نێوان دوو وشەی (بێزار) و (بێ زار)دا جیناسی تەوا هەیە. طەلعەت: دەرکەوتن. شەمس: خۆر.
(٣) ڕوخ: ڕوخسار: ڕوخی ئاتەشی: واتە ڕوخساری بەشۆق و بەتین و سوور وەک ئاگر.
واریثی زەرەشت: میراتگری زەردەست پێغەمبەر کە ئاگری بەشتێکی پیرۆز داناوە.
(٤) سوها: یەکێکە لە ئەستێرە نادیار و بێ شۆقەکانی کۆمەڵی حەوتەوانە (بنات النعش).
(٥) غەڵەت کردنی (کەشکۆڵی أ) - غەڵەط کاریی (بەیان).

## وا مەستی مەیی...*

وا مەستی مەیی غەمزەی خوونڕێزی نیگارم
تا ماوە جیهان باقییە مەستیی و خومارم
«وامیق» بەخەیاڵاتی سەری طوڕڕەیی «عەزرا»
وەک من نەبوو سەودازەدەیی پەرچەمی یارم(١)
حەسرەت زەدەیی حوسنی «ئەیاز»ی بەنیگاهێ
صەد «غەزنەوی» ناگاتە مەقامی دڵی زارم(٢)
گیرۆدەیی «نەمرود» میزاجێکە دڵی من
بێ بت شکەنی داخڵی ناو کوورەی نارم(٣)
غەم عەینی تەمی کۆهی (دەماوەند)ە لەسەر دڵ
ئەمما بەسوروشکم وەکو (ئەڵوەند)ە کەنارم(٤)
مەقصوودی دڵم وەصفی بینای (میهر)و(وەفا)یە
بێ (میهر) و (وەفا) زەحمەتە ئارام و قەرارم(٥)
وا تێ مەگە «زێوەر» کە بەبێ ڕووی تۆ شادە
بێ تۆ شەوە ڕۆژم، بەخودا ناڵەیە کارم
دوورڕی عەدەنە طەلعەتی نیکۆیی نیگارم
سەروی چەمەنە قامەتی دڵ جۆیی نیگارم(٦)
نەخشینە بەنووکی قەڵەمی صونعی ئیلاهی
دنیا ئەگرێ قووەتی بازووی نیگارم





فیکرم هەموو ڕەنگینە لە فەیضی دڵی خوێنین
ئەی من بەفیدای خەنجەری ئەبرۆی نیگارم
ئەستێرەی ڕوخساری دڵی عالەمی سووتان
بورهانی مونەجەجیم بوو مەگەر ڕووی نیگارم
بیستوومە بەدام و بەشکار ئاسک ئەگیرێ
ئینسان ئەگرێ دیدەی ئاهوویی نیگارم
دەعوای شەهادەت ئەکەم و، جەننەت ئەگەر بوو
تاری کەفەنم ڕوشتەی گێسوویی نیگارم
ئەو نیعمەتە پڕ لەذذەتە ڕۆژێ، کە ببینم
دەستی من ئەسەر گەردن و ئەستۆی نیگارم
بەدبەختییە ئازادی لە زەنجیری مەحەببەت
بەم ڕەنگەیە تا سیلسیلەی مووی نیگارم
(زێوەر) بەحەذەر بە ئەمە ئاشووبە پەیابوو
ئیمان ئەدڕێ قووەتی بازووی نیگارم

..........

* ئەم شیعرە لە ل٢٤ی گۆڤاری بەیانی ژمارە ١٣٧ وەرگیراوە. هەروەها لە ل٢٦ی کەشکۆڵی (ب)یشدا هەبوو. وا دیارە ئەوەی بەیان لەم وەرگیراوە.

(١) وامیق و عەزراء: دوو دڵداری بەناوبانگی کۆنن وەکو لەیل و مەجنوون، شیرین و خەسرەو، شیرین و فەرهاد. شاعیری بەناوبانگی ئیرانی (عونصوری) بۆ یەکەم جار داستانی دڵداری و ئەوێنی ئەم دوو قوڕ بەسەرەی نووسیوە لە دەوروبەری ساڵی ١٠٤٩ی زایینی فەصیحی گورگای کردوویە بەهۆنراوە.

(٢) ئەیاز، هەیاس: وەزیری سوڵتان مەحموودی غەزنەوی بووە زۆر عاقڵ و دانا و تێگەیشتوو بووە. غەزنەوی: سوڵتان مەحموودی غەزنەوی. دڵی زارم: دڵی ناڕەحەتم.

(٣) نەمروود: ئەو پاشایە بوو کە لەگەڵ حەزرەتی ئیبراهیمدا بوو بەکێشە و نیزاعیان دواییش بەمێشوولە مرد. لە شیعرەکەدا (زێوەر) ئیشارەی بۆ چیرۆکەکەی حەزرەتی ئیبراهیم کردووە، کە چۆن بتەکانی شکاند و دوایی تەورەکەی لەسەر شانی بتە گەورەکەیان دانا و، کە لێیان پرسی ئەرێ ئیبراهیم تۆ خواکانی ئێمەت شکاندووە؟ وتی ناوەڵڵا بتە گەورەکە وای لێ کردوون... دوایی مەنجەنیقیان بۆ داخست و خستیانە ناو ئاگرەوە بەڵام نەسووتا و بەسەلامەتی ڕزگاری بوو.

(٤) دەماوەند: بەرزترین لووتکەی کێوی ئەلبورزە نزیکی ٦٣٠٠م لە دەریاوە بەرزە.
ئەڵوەند: چەمێکی گەورەیە پێک دێ لە چەند ڕووبارێکی پچکۆلە کە هەڵدەقوڵێن لە کێوەکانی (ئەڵوەند کۆە). بەشێکی ئەم ئاوانە بەنێو ئێراندا دێ بەرەو ڕۆژهەڵات، هێندێکیشی بەرەو غەرب دێ لەگەڵ دیجلە تێکەڵاو دەبێ. بەڵام (زێوەر) لێرەدا دەبێ مەبەستی ڕووباری ئەڵوەندی لای خانەقین بێ.

(٥) (میهر) و (وەفا) لە نیوە دێری یەکەمدا بەمانا خۆشەویستی و وەفایە، لە نیوە دێری دووەمدا ناوی دوو دڵداری کۆنن.

(٦) لێرە بەم لاوە واتە نۆ دێرە شیعری کۆتایی قەصیدەکە لەگەڵ ئەو قەصیدەیەی کە بۆ بلەنەخشینی گوتووە یەکێکن تەنها جیاوازیی نێوانیان ئەوەیە ئەم لە جیاتی (برایم) وشەی (نیگارم)ی بەکارهێناوە.





**بلە نەخشین***

دوڕڕی عەدەنە طەلعەتی نیکۆیی برایم
سەروی چەمەنە قامەتی دڵ جۆیی برایم
نەخشینە بەنووکی قەڵەمی صونعی ئیلاهی
دنیا ئەگری قووەتی بازوویی برایم
فیکرم هەموو ڕەنگینە لە فەیضی دڵی خوێنین
ئەی من بەفیدای خەنجەری ئەبرۆیی برایم
ئەستێرەیی ڕوخساری دڵی عالەمی سووتان
بورهانی مونەجەجیم بوو مەگەر ڕوویی برایم**
بیستوومە بەدام و بەشکار ئاسک ئەگیرێ
ئینسان ئەگرێ دیدەیی ئاهوویی برایم
دەعوای شەهادەت ئەکەم جەننەت ئەگەر بوو
تاری کفنم ڕووشتەی گیسوویی برایم
ئەو نیعمەتە پڕ لەذذەتە ڕۆژێ کە ببینم
دەستی من ئەسەر گەردن و ئەستۆیی برایم
بەدبەختییە ئازادیی لە زنجیرەی مەحەببەت
بەم ڕەنگەیە تا سیلسیلەیی موویی برایم
(زێوەر) بەحەذەر بە ئەمە ئاشووبە پەیابوو
ئیمان ئەدزێ قووەتی بازوویی برایم

..........

ئەم شیعرە لە ل١٥٦-١٥٧ی کەشکۆڵی (أ)دا هەیە. وەکو دەڵێن بلە نەخشین لە بنەڕەتدا لە ناوچەی بادینانەوەماڵیان هاتووە بۆ سلێمانی، ئەم کوڕە کە پێ گەیشتووە زۆر گەنجێکی جوان خاس بووە لەبەر جوانی پێیان وتووە بلە نەخشین. بەزۆری ئیشی شاگرد نانەوایی بووە. ئەوەندە جوان بووە جێی سەرنجی هەموو کەسێک بووە کە دیویەتی بۆیە مامۆستا (زێوەر) ئەم شیعرەی بەسەردا هەڵداوە. مامۆستا (بێخود)یش کردوویە بەپێنج خشتەکی. ئەم بلە نەخشینە ساڵی ١٩٨٧ کۆچی دوایی کرد.

** مامۆستا نەجمەدین مەلا دەڵێ: ساڵێک ئەستێرە شوناسێکی خۆرئاوایی بڵاوی کردەوە کەوا لە دوای چەند مانگێک ئەستێرەیەکی کلکدار هەڵدێ خۆی لە زەوی ئەدا هەموو دنیا ئەسووتێنێ کەچی قسەکەی بەدرۆ دەرچوو. ئەمجار بەقسەی مامۆستا (زێوەر) مونەجیم بەئەستێرەی ڕوخساری برایمدا قسەکەی ڕاست دەرچوو.

## بەستراوی ڕاوی*

بەستــــراوی ڕاوی چاوی شــۆخــێکی نەوجــەوانم
گـیـراوی حـەلقـەی داوی صـەییـادی عـاشقـانم[1]
ذەلیلی لەیلی بێ مـەیل، مـەجنوونی کـۆهـ و دەشــتم
بێ یار و کـاروبارم، ڕەفـیــقی وەحــشــیــیـانم[2]
تکا، شکا، بەجــارێ شــەراب و شــیــشــەی دڵ
ئەسـراری مـەخـفـیـیـاتم کـەوتۆتە سـەر زوبانم[3]
مـەنوارە جـوست و جـۆی من، بنوارە گـفـتـوگـۆی من
شــیــرینە قـیـل و قـالم مـەدداحی دولبـەرانم[4]
لە داغی باغی ڕووی وەک عــــەندەلیب ئەنالم
تەزەروی سـەروی باڵای، بێ ئافـەتی خـەزانم[5]
من پەستی شەستی دەستی چاومەستی دیدە شەنگم
موحتـاجی باجی ماچی ڕوومـەت گـوڵی جینانم[6]
دڵ بۆتە «بۆتـە» بۆ تـۆ پڕ نار و پڕ حـــــەرارەت
سـووتاوە دڵ ئەمـێسـتـا خەریکی حیفظی جانم[7]
هەمــیــشــە حـیلەبازی، جـار جـارە دڵ نەوازی
گــاهێ لەســەر زەمــینم، گــاهێ لە ئاســمــانم
(زێوەر) خـوڵامی خـۆتە، ئەم جـەورە حـەیفـە خـووتە
مـەمنوونە گەر بفـەرمـووی: تۆ عـەبدی ئاسـتـانم[8]

.......................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٥٥ی کەشکۆڵی (أ)دا نووسراوەتەوە لە ژمارە ١٢٧ی گۆڤاری بەیانیشدا بڵاو کراوەتەوە. پیرەمێری نەمریش لە ڕۆژنامەی (ژین)ی ژمارە ٩٤٣ی ١٨ی شوباتی ١٩٤٨ی زایینی بڵاوی کردۆتەوە. ئەم پێشەکییە کورتەشی بۆ نووسیوە و دەڵێ: «ئەمڕۆ لە کۆنە کاغەزێکا کۆنە غەزەلێکی کۆنە شاعیرێکم دۆزییەوە با تازەکان بتوانن تەرزی پێ بشکێنن». بەڵام بەتەواوی دەقی شیعرەکە گۆڕاوە لەبەر ئەوە بەپێویستی دەزانم دەقی (ژین)ەکە لێرەدا جارێکی تر بنووسمەوە و بیخەمە پەراوێزەوە. ئەمەش دەقەکەی (ژین)ە:

بەســـراوی داوی چاوی شـــۆخـــێکی نەو جـــەوانم
گـــیـــراوی تاوی داوی ڕاوکـــەری عـــاشـــقـــانم
(١) ذەلیلی لەیلی بێ مـەیل، مـەجنوونی وێڵی دووجـەیل
بێ یار و کـار و بارم، هاوشـانی وەحـشـیـیـانم
(٢) تکا، شکا، بەجـارێ شـەراب و شـووشـەکـەی دڵ
دەرکـەوت ڕازی نیـهـانم، گـەیشـتـە سـەر زوبانم





(٣) لـە داخی بـاغ و ڕاغـی ڕووی بـولبـــــــوم ئـەناڵـم
لە دووریی ســـەروی باڵای منم کـــە پڕ فـــوغـــانم
(٤) مـەنوارە گـفـتـوگـۆی من، بنوارە جـوست و جـۆی من
شــیــرینە شــیــعــر و نەثرم، مـەدداحی دولبـەرانم
(٥) دڵ بـۆ تـۆ بـۆتـە «بـۆتـە» پـڕ ئـاگـــــــر و بـەتـاوە
وا دڵ لە دەست چوو ئەمجارە خەریکی پاسی گیانم
(٦) من پەستی شەست و مەستی چاومەست و عیشوە خەستم
مـوحـتـاجی باجی مـاچی ڕوومـەت گـوڵی جـینانم
(٧) ســـەدبارە حـــیلەبازی، جـــارجـــارە دڵ نەوازی
گـــاهێ لەســـەر زەمـــینم، گـــاهێ لە ئاســـمـــانم
(٨) «زێوەر» غـــوڵامی خـــۆتە، تۆ بێ وەفـــایی خـــووتە
جــارێک پێی بڵێ: وەرە، تۆی عــەبدی ئاســـتـــانم

شایانی باسە کە دەقی کەشکۆڵەکە واتە ئەوەی کە ئێمە بەبنەما و ئەصڵمان داناوە لەلایەن ویصالی، (سەید موحەممەدی قەرەداغی)یەوە کراوە بەپێنج خشتەکی و لە ل٢١٠-٢١٣ی دیوانی ویصالیدا چاپ کراوە.

(١) حەلقە: ئەڵقە. صەییاد: نێچیرەوان.
(٢) کۆهـ: کەژ و کێو. وەحشی ئەو گیانلەبەرانەی لە کێو دەژیێن.
(٣) شیشە: شووشە. ئەسرار کۆی (سیرڕ)ە واتە نهێنی. ئەسراری مەخفییانم: نهێنی دڵم.
(٤) جوست و جۆ: جم و جۆڵ. قیل و قال: گفتوگۆ. مەدداح: ستایشکەر.
(٥) عەندەلیب: بولبول.
تەزەرو: جۆرە چۆلەکەیەکە گۆشتی ئەخورێ، کلکێکی درێژی هەیە، پەڕ و پۆڵی جوانە، لە دارستان و کێڵگەدا ئەژیی هێلانە لە زەویدا دەکا بیست و چوار ڕۆژ بەسەر هێلکەکانییەوە هەڵدەنیشێ تا هەڵیان دێنێ، لە نێوان (داغی) و (باغی)دا جیناسی لاحیق هەیە.
(٦) شەست: لێرەدا مەبەست ئەموستیلەیەکە لە کاتی تیر ئەندازیدا کراوەتە پەنجە و ژێی کەوانی پێ گیراوە.
لەنێوان هەر چوار وشەی (پەستی و شەستی و دەستی و مەستی)دا جیناسی لاحیق هەیە، هەروەها لە نێوان (باجی) و (ماچی)دا جیناسی موزدەوەج هەیە.
(٧) بۆتە: فنجانێکی گڵی سوورکراوەیە زێڕی تێدا دەتوێنرێتەوە دەڵێن: (بۆتە) وشەیێکی کوردیی ڕەسەنە عەرەب وەریان گرتووە و کردوویانە بە (بودقە). لە نێوان هەردوو وشەی (بۆتە) و (بۆتە)دا جیناسی چوون یەک هەیە.
(٨) خوڵام، غولام: کۆیلە و خزمەتکار. جەور: ستەم. حەیفە: جێی داخە. عەبد: کۆیلە. ئاستان: بەردەرگا.
لە نێوان دوو وشەی (خۆتە) و (خووتە)دا بەشێوە نووسینی کۆن جیناسی چوون یەک هەیە. بەشێوەی نووسینی ئێستاش جیناسی (موحەڕڕەف)یان لە نێوان دایە.

## بەینێکە*

بەینێکە بەسـەرمـا کـە گـوزارت نیـیـە قـوربان
نەمـزانی وەفـا و شـەرت و قـەرارت نیـیـە قـوربان
چاو بازەکـــە،! پڕ نازەکـــە! غـــەممازەکـــەی خـــۆم
باعـیث بەچیـیـە مـەیلی شکارت نیـیە قـوربان[1]

بۆچی بەهەموو وەقت و زەمان ئێستە نەناڵم
وەک عەهدی قەدیم بۆس و کەنارت نییە قوربان[2]
غەمبار و خەفەتبار و دڵ ئازار و حەزینم
لەوساوە لەگەڵ من سەروکارت نییە قوربان
عاجز مەبە ئەم عالەمە گەر طالبی ڕووتن
لەم حوسنی خودا دادییە چارت نییە قوربان
بۆچ دەعوەی سوڵتانیی خووبان نەکەی ئیمڕۆ
بۆچ لەعلی لەب و چاوی خومارت نییە قوربان؟[3]
وەک بەچچەی ئاسک لە دڵی (زێوەر) ئەکەی ڕەم
ئەمما لە ڕەقیب مەیلی فیرارت نییە قوربان[4]

* ئەم شیعرە لە ل١٦٠-١٦١ی کەشکۆڵی (أ) و ل٣٠ی کەشکۆڵی (ب)دا نووسراوەتەوە. لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ١٢٧ ، ل٨٦یشدا چاپ کراوە.
(١)غەمماز: توانج گر. باعیث: هۆ. شکار: ڕاو.
(١) عەهدی قەدیم: ڕۆژگاری ڕابردوو. بۆس: ماچ. کەنار: لە باوەش گرتن.
(٣) سوڵتانی خووبان: پاشایەتی جوانان. لەعل: بەردێکی سووری گرانبەهایە. لەب: لێو. لەعلی لەب: مەبەستی لێوی ئاڵ و سوورە. خومار: مەست.
(٤) بەچچەی ئاسک کەشکۆڵی (أ) بەچچەی ئاهو و (بەیان). ڕەم: ڕاکردن و سڵ کردنەوەی ئاسک لە دەست ڕاوکەر. ڕەقیب: بەدکار و ناحەزی نێوان دوو دڵدار.

## چ شیرینە چایی...*

چ شیرینە چایی لە فەسڵی بەهاران
لەگەڵ یاری صادق لە گوێ جۆباران!؟
بە خەندەی نیگاری بەگریەی سەماوەر
زەمین وەک سەمابێ بە بەرق و بەباران
موغەننی بەپەردەی (عێراقی) بخوێنێ[1]
خوا نازی لێ گوم نەکا نازداران
ئەسیری مەحەببەت بی، ئازادی عالەم
نەناسی بەجوز جیلوەی گوڵ عوزاران
ئەگەر وایە بەزمت بەحەقـقەت بەهەشتە
فیدای بێ هەزار مەجلیسی بادە خۆران
ئەوا بوویتە سوڵتانی ئێران و تووران
چلۆن دێتەوە شەوقی جاران و یاران



بەسی بێ خەیاڵاتی بێ هوودە (زێوەر)
وەکو شێت مەگەر بگری ڕێی کۆهساران

* ئەم شیعرە لە ل١٦١-١٦٢ی کەشکۆڵی (أ) و ل٣٠ی کەشکۆڵی (ب) و ل١٦ی گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ١٤٢دا هەیە.
(١) عیراقی: جۆرە ئاوازێکی مۆسیقایە.

## پێم خۆشە*

پێم خۆشە تەماشای قەدت، ئەی سەروی خەرامان
جارێ بەکەرەم سا وەرە ڕابوورە بەلامان
ئەو نەختە خەیاڵاتە کەوا ماوە لە سەرما
بێ میهری ڕوخت ڕەفعە بەیەک دەفعە لەسەرمان[1]
ناڵێم صەنەمی، کوفرە، ئەما قیبلەی قەلبی
مەنظووری هەموو خەڵقی چ گەبر و چ موسوڵمان[2]
بەم غەمزە و ناز و نیگەهی چاوی خومارەت
تاڵانبەری زوههادی و غارەتگەری ئیمان[3]
جێ زەخمی موژەت مەرهەمی مەعدوومە لە دنیا
چارم نییە ئەڵبەت بەدووسەد هەروەکو لوقمان
(زێوەر) مەکە ئەمڕۆ بەنیشانی ستەمی خۆت
ئوممێدی بڕاوە لە دەوا و چاری حەکیمان

* ئەم شیعرە لە ل١٦٠ی کەشکۆڵی (أ)دا نووسراوەتەوە لە ژمارەی ١٢٧ی گۆڤاری (بەیان)یشدا بڵاوکراوەتەوە.
(١) میهر: خۆر. ڕوخ: ڕوخسار. ڕەفعە: لاچوە، هەڵگیراوە.
(٢) صەنەم: بت. قیبلە: ڕۆگە. قەلب: دڵ. مەنظوور: مەبەست و ئامانج. گەبر: گاور.
(٣) نیگەه: تیلەی چاو. خومار: مەست. زوههاد: دنیا نەویست، خۆ بۆ بەندەیی خوا ئامادەکردوو. نیوە دێری دووەمی ئەم شیعرە و نیوە دێری یەکەمی شیعری دوایی لە کەشکۆڵی (أ)دا نەبوون.

## ئەم دەستە کە لەم شارە*

ئەم دەستە کە لەم شارە هەموو نەوعە غەزالی
هەریەک بەجەماڵ یۆسفی با جاه و جەلالن[1]
غیلمان صیفەت سوندوس و ئیستەبرەق ئەپۆشن
سوورەت بەشەرن مەعنا هەموو حوور خیصالن[2]
هەریەککە بەدۆش کاکۆڵی ئەفشان و بڵاوە
هەر صوبحدەمێ مونتەظیری بادی شەماڵن[3]





ئەم شارە وەکو بەحر و لە نێویا کە موقیمن
بەعزێ سەدەفی گەوهەر و بەعزێ کە لەئالن
مەقبووڵی شەهەنشاهن و مەطبووعی سەلاطین
مەعلوومی عەوامە کە بەبێ شیبه و میثالن[٤]
صوورەتگەری چین بێتە ئەمێ صەنعەتی نابێ
هەریەک مەلەکێ خاریجی ئیدراک و خەیاڵن[٥]
غەممازن و پڕ نازن و مەحبووبی زەمانن
شەمس و قەمەرن، زوهرەی باهۆش و کەماڵن[٦]
شازادە و بەگزادە، هەموو ئەنجەبی خەڵقن
وەک خونچەی پەروەردەیی ئاوێکی زوڵاڵن
خۆت تووشی بەڵا قەت مەکە (زێوەر) کە ئەزانی
ئافاتی دڵ و دینن و مەنناعی ویصاڵن

---

* ئەم شیعرە لە ل١٥٨ی کەشکۆڵی (أ)دا نووسراوەتەوە. لە ژمارەی ١٢٧ی گۆڤاری (بەیان)یش بڵاو کراوەتەوە.

(١) لەم شارە: دەبێ مەبەستی شاری سلێمانی بێ. نەوعە غەزاڵ: جۆرە ئاسک. با جاه و جەلال: خاوەن ڕێز و شکۆ و پلە و پایە.

(٢) غیلمان: کۆی (غولام)ە مەبەست منداڵی جوان و تازە پێگەیشتووە. سوندوس و ئیستەبرەق: دوو جۆرە کاڵای پۆشاکی جوانن، حوور: حۆری بەهەشت. خیصاڵ: هەڵس و کەوت.

لە کۆکردنەوەی (غیلمان، سوندوس، ئیستەبرەق، حوور) تیل نیشانێک هەیە بۆ دوو ئایەتی سوورەتی (الانسان)ی قورئانی پیرۆز کە دەفەرمووێ: «ویطوف علیهم ولدان مخلدون اذا رأیتهم حسبتهم لؤلؤا منثورا عالیهم ثیاب سندس خضر واستبرق».

(٣) دۆش: شان و مل. ئەفشان: بڵاو. صوبحدەم: سەرلەبەیانی.

(٤) مەقبوول: پەسەندکراو. مەطبووعی سەلاطین: پەسندکراوی تەبیعەتی پاشایان. شیبه: وێنە. میثال: نموونە.

(٥) صوورەتگەری چین: وێنەگری ناوداری چین. مەلەک: فریشتە. ئیدراک: هەست.

(٦) غەمماز: توانج گر. شەمس: خۆر. قەمەر: مانگ. زوهرە: ئەستێرەی زوهرە یەکێکە لە ئەستێرە گەڕۆکەکان پێشی دەڵێن: زوهرەی ڕەققاص واتە: سەماکەر. باهۆش: خاوەن هۆش و فام.

## لە عەشقی دوختەری ڕەز*

لە عەشقی دوختەری ڕەز[١] هەر لە کێوان
بەجارێ بوومە شەیدای باخی مێوان
مەی وەک لالەی نوعمان حەڵاڵە
بەفتوای من بەیادی لەعلی لێوان



لە خەو هەستا بەزوڵفی ڕووی پۆشی
بەیانی کرد بەشەو عوششاقی شێوان
دڵی بێ چارە وەک کۆتر هەڵ ئەفڕێ
لە ترسی چنگی چاوبازی مەریوان
ڕەقیب بای دایەوە بۆ فیتنە بازی
خوا بیخاتە بەر بای دەستی دێوان

---

* ئەم شیعرە لە ل٢٤٦ی کەشکۆڵی (أ)دا هەبووە ئەمەشی لە سەرەتاوە نووسراوە: «نەظیرە لەسەر هەڵبەستێکی نالی کە ئەڵێ:

لە دوگمەی سینە دوێنی نوێژی شێوان
بەیانی دا سپیدەی باغی سێوان»

(١) دوختەری ڕەز: کچی مێو، مەی.

## موژەت*

موژەت ئوردووی جەنگیزخانە ئەمڕۆ
هەموو موڵکی دڵم وێرانە ئەمڕۆ
لەدەست ئەو پەرچەمی وەک ماری ضوحاک
هەموو طیفلی دڵێ بێ جانە ئەمڕۆ
مەگەر گۆیا هۆلاکۆیە دوو چاوت
لەگەڵ شەوقی کە پڕ فەرمانە ئەمڕۆ
عورووسە یاخۆ تەقیانووسە ئەبرۆت
عەدوویی صاحێبی ئیمانە ئەمڕۆ
موعەللیم دەرسی نازی ڕووتی پێ وت
کەوا چاوت لە ڕووت حەیرانە ئەمڕۆ
عەبەث واعیظ ئەکا مەنعم لە عەشقی
مەگەر دێوانەی دیوانە ئەمڕۆ
لە پەی کێوانە (زێوەر) هەر وەکو شێت
فوغانی واصیڵی کەیوانە ئەمڕۆ

---

* ئەم چوار دێرە شیعرە لە ل١٦٥ی کەشکۆڵی (أ)دا نووسراوەتەوە.





## دنیا*

دنیا کە لەبەر قافڵەی ئاهم تەمە ئەمڕۆ
شۆراوی سوروشکم بەمەسەل زەمزەمە ئەمڕۆ[(١)]
لێوت کە عەقیقە بووەتە ڕوکنی یەمانی
ماچی کە جەوازی نییە جێی پەنجەمە ئەمڕۆ[(٢)]
کۆبوونەوە حەجحاجی خەیاڵم لە مینای دڵ
شەیتانە ڕەقیب ڕەجمی لە لام ئەلزمە ئەمڕۆ[(٣)]
خاڵت حەجەرول ئەسوەدە، بەرناکەوێ ماچی
دەستم کە بگاتێ سەبەبی ڕوتبەمە ئەمڕۆ[(٤)]
جان و دڵی من بۆتە (صەفا و مەروە) لە بۆ تۆ
ڕاکەی لە دڵا جانە! کە جێی مەقدەمە ئەمڕۆ[(٥)]
شەو تا بەسەحەر موزدەلیفەی حوجرەیە جێگام
ئەمما عەرەفەی کۆیی ئەتۆ جێگەمە ئەمڕۆ[(٦)]
مەحفووظە لە بۆسە و لە دەسی عاشقی غەمبار
دوو ڕووکنیی شامیی و ئەڵێی پەرچەمە ئەمڕۆ[(٧)]
«لَبَّـيكَ و سَعْـدَيْك» ئەڵێم: لەحظە بەلەحظە
یەعنی لە حوزوورت قەدەمم مەحکەمە ئەمڕۆ[(٨)]
(زێوەر) وەکو حاجی لە طەوافایە هەمیشە
ئەم طەوفی ویداعی نییە لەو بێ غەمە ئەمڕۆ[(٩)]

.........................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٦٤ی کەشکۆڵی (أ) و ل٣٢ی کەشکۆڵی (ب)دا نووسراوەتەوە.
هەروەها لە ل٢٠ دەسەتنووسی شاعیریش هەیە. بەڵام دوو دێرە شیعری دووەم و هەشتەمی تێدانییە.
(١) قافڵە: کاروان. ئاهم: ئاخ و ئۆف و هەناسەی ساردم. سروشک: فرمێسک. زەمزەم: ئاوی زەمزەم.
(٢) بۆ ڕوونکردنەوەی مانای ئەم دێرە شیعرە دەبێ ئەوە بزانرێ کە «کەعبە» چوارگۆشەی هەیە هەر گۆشەیەکی بەڕوکنێک ناو ئەبرێ (ڕوکنی «حجر الأسود»، ڕوکنی شامی، ڕوکنی عیراقی، ڕوکنی یەمانی.) جا ڕوکنی عیراقی و شامی نە ماچ دەکرێن و نەئیشارەتیشیان بۆ دەکرێ، ڕوکنی (حجر الأسود) = بەردەڕەش سوننەتە ماچ بکرێ، ڕوکنی یەمانی ماچکردنی دروست نییە بەڵام کە گەیشتییە عاستی بەدەست ئیشارەی بۆ دەکا و حاجی دەست و پەنجەکەی خۆی ماچ دەکا کەواتە مانای ئەم دێرە شیعرە بەم شێوەیە کە دەڵێ:
لێوت کە ئاڵ و سوورە وەکو عەقیق وایە لێم بۆتە ڕوکنی یەمانی کەعبە لەوەدا کە ماچکردنی دروست نییە تەنیا بەپەنجە ئیشارەتی بۆ دەکرێ و دوایی پەنجەکە ماچ دەکرێ.
(٣) مینا: دەشتی مینا کە حاجی دوای ڕاوەستانی کێوی عەرەفە ماوەیەک لێی دەمێننەوە. ئەلزەمە = ألزم: واتە پێویستە.
(٤) ئاماژە بۆ ئەوە کە (بەردەڕەشە)ی کەعبە سوننەتە ماچ بکرێ جا لەبەر ئەوە قەرەباڵغی زۆر لەسەرە و ماچکردنی زۆر





بەزەحمەت بەردەکەوێ جا ئەگەر ماچکردنەکەی جێبەجێ نەبوو سوننەتە دەستی لێ بدرێ و دەستەکە ماچ بکرێ.
(٥) صەفا و مەروە: دوو شوێنی مەیلەو بەرزن لە بەینیاندا نزمایەک هەیە لە نزیک کەعبەوەن حاجی بەگورگەلۆقە حەوت جار لە صەفاوە بۆ مەروە و لە مەروەوە بۆ صەفا ڕادەکا هەر حەوت جار بەیەک صەفا و مەروە حیسابە.
(٦) موزدەلیفە: شوێنێکە لە خوار مەککەوە حاجی دوای کێوی عەرەفە پێش ئەوەی بچن بۆ شەیتان ڕەجم کردن ماوەیەک لێی دەمێننەوە. عەرەفە: مەبەستی کێوی عەرەفەیە.
(٧) دوو ڕوکنی شامی: مەبەستی ڕوکنی شامی و عیراقییە کە نە ماچ دەکرێن و نەدەستیشیان لێ دەدرێ.
(٨) لبیک: وتنی دوعای لبیک أللهم لبیک... هتد.
(٩) طەوفی ویداع: واتە طەوافی خوا حافیزی لە کەعبە کاتێ حاجی مەککە بەجێ دەهێڵن حەوت جار بەدەوری کەعبەدا دەسووڕێنەوە.

## نەو بەهاری باخی حوسنم*

نەو بەهاری باخی حوسنم! مات و غەمگینم، مەڕۆ
بۆ نەمای قەددی لەطیفت چاوپڕ ئەسرینم مەڕۆ
مەنبەعی عەیش و صەفای صاحیب دڵانی چاوەکەم
تەڵخە عەیشی ئێمە بێ تۆ، ڕۆحی شیرینم مەڕۆ
زیندەگانی، شادمانی، واسیتەی هەردوو ئەتۆی
مەمکوژە -قوربان- بەهیجرت قووەتی دینم! مەڕۆ
صەفحەیی دیدە بەخەتت و خاڵی تۆ ڕەنگین بووە
کۆڵەوارم سا مەکە ئەی -ئاسکی چینم!- مەڕۆ
من حەیاتی عارییەم تەسلیمی غەمزەی چاوتە
تاقەتی دووریم نەماوە - باعیثی ژینم! - مەڕۆ
نەشئەیی (زێوەر) بەپیاڵەی چاوی تۆوە باقییە
سا بەقصوودی ڕەقیبان -دیدە شاهینم!- مەڕۆ

.........................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٦٢-١٦٣ی کەشکۆڵی (أ) و ل٣١ی کەشکۆڵی (ب) وەرگیراوە لە گۆڤاری بەیانی ژمارە (١٤٢) ل١٦یشدا چاپ کراوە.

## گوڵبوونی قەدد*

گوڵبوونی قەد بولبولی طبع ئیختیاری کردووە[(١)]
دڵ دیسان مەیلی هەوای نەو بەهاری کردووە
ئاهوی صاحێب خەت و خاڵ هاتە مەیدانی دەروون
بازی دڵ بۆیە خەیاڵاتی شکاری کردووە
گەر ئەپرسی ڕۆژ ئەمەند بۆچ دێتە دەر ئاوا ئەبێ
شەوقی ڕوخساری نیگارە بێ قەراری کردووە

دوێنێ چوومە سەیری گوڵشەن شیبهی ڕووی تۆم دی گوڵێ
گوڵ کە پێی زانی: هەزار جار ئیفتیخاری کردووە
موژدەبێ بای وەعدە ئەنگووت، پێشڕەوی هات عەندەلیب
حەسرەتا هاو تەبعی یارم (دەی) فیراری کردووە[2]
مەکتەبی «روشدیە»ی سینەم تیایە کەسبی غەم[3]
ئەی دریغ! گوڵشەن لەجێی گوڵ بەرگی خاری کردووە
بەس دوعا کاری ڕەقیب بە(زێوەر)ا خۆی کەوتە غەم
ئەو بەشێکە ڕۆژی قیسمەت حەق دوچاری کردووە

........................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٨٢ی کەشکۆڵی (أ) و ل٤٣ی کەشکۆڵی (ب)دا هەیە لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ١٤٢، ل١٨دا چاپ کراوە.

(١) گوڵبوون، یا گوڵبن: بەدرەختی پچووکی گوڵدار دەڵێن، بەچەپکە گوڵیش دەگوترێ.

(٢) (دەی): مانگی یەکەمی زستانە.

(٣) مەکتەبی (روشدییە) ئاماژەی تێدایە بۆ قوتابخانەی ڕوشدییەی عەسکەری کە ئەو کاتە قوتابخانەیەکی میری بووە لە سلێمانی و شوێنی تریش هەبووە.

## مەیتەری عەقڵم*

مەیتەری عەقڵم کومەیتی نەفسی زنجیر کردووە[1]
وەرنە جووتەی نەحسی بۆ جەبهەی فەلەک گیر کردووە[2]
عومری من وا زۆر نییە ئێستە زەمانی عەیشمە
دەردی عەشقی نەوجەوانێ وا منی پیر کردووە
ڕەنگی سوورم بوو بەزەرد و قەلبی ساغم بوو بەداغ[3]
ساحیرێکە ظاهیر و پەنهانی تەغییر کردووە
قەت لە خۆم دا من گومان نابەم قەباحەت زەڕڕەیێ
موقتەضای تەبعییە ناحەق کە خۆی زویر کردووە
کافرێکە دەفعەیێ جوابی سەلامێکی نەبوو
سەد کەڕەت نامەم بەخوێنی دیدە تەحریر کردووە
کەس لەگەڵ (زێوەر) ڕەفاقەت ناگرێ ئەو ناعیلاج
خۆی بەوێڵداشی دەسیسە و مەکر و تەزویر کردووە

........................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٨٣ی کەشکۆڵی (أ) و ل٤٤ی کەشکۆڵی (ب)دا هەیە لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ١٢٧، ل٩١دا بڵاوکراوەتەوە.





(١) مەیتەر: خزمەتچی، ئەو کەسەی سەرپەرشتی وڵاخ دەکا هەڵدەستی بەئالیک و لەوەڕدانیان. کومەیت = کمیت: ئەسپێکە ڕەنگی لە بەینی ڕەش و سوور دابێ.

(٢)نەحس: شووم و نەگبەتی. جەبهە: شەڕ و جەنگ.

(٣) بوو بە زەرد و «کەشکۆڵی ب، بەیان» بۆبە زەرد و «کەشکۆڵی (أ)»

## خۆراک و خەو*

خۆراک و خەو بەبێ تۆ یەکسەر لە من حەرامە
هاودەم ناڵینی گەرمە، غەم هاوپشت و برامە
بام بولبول هیچ نەخوێنێ با غونچە خۆی نەنوێنێ
ئەفشان نەکا گوڵ بێنی، دنیام توونی حەمامە[1]
شەو کە ئەچمە ناو جێگا، ئەڵێی ئەمخەنە جێگا[2]
لێم تێکچوو جێ، و ڕێگا صوبحم تاریکی شامە[3]
وڵاتێکی بێ سەردار ئاگری تێ بەربێ یەک جار
بۆچی بڵێم، بەهار بێت دنیا کە بێ مەرامە
هەر خەم دەخۆم دەماودەم بێ گریانێکی سەردەم
بۆ ئەم هیجرانی تۆیە فرمێسکی ناتەمامە
دووریت سووروری لابرد، وەڵڵاهی نووری لابرد[4]
ڕوخساری پاکی، بێ شک، چرایی خاص و عامە

........................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٨٥ی کەشکۆڵی (أ) و ل٤٦ی کەشکۆڵی (ب)دا نووسراوەتەوە لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ١٤٢، ل ١٧-١٨دا بڵاوکراوەتەوە.

(١) ئەفشان: بڵاوکردنەوە. بێنی: بۆنی.

(٢) (جێگا)ی یەکەم واتە شوێنی نووستن (جێگا)ی دووەم واتە گۆڕ. ئەشگونجێ مەبەستی جێی (گا) بێ واتە تەویلە، گەوڕ، بەڵام ئەو کاتە دەبێ بە (جێی گا) بنووسرێ.

(٣) شام: ئێوارە.

(٤) سورور، سرور: کەیفخۆشی. وەڵڵاهی: (کەشکۆڵی أ) - نەوەڵڵا (سەرچاوەکانی تر).

## بێ ڕوویی تۆ*

بێ ڕوویی تۆ ئەی شاهی زەمین، ماهی زەمانە[1]
دەردی دڵەکەم خاریجی تەصویر و بەیانە[2]
مومکین نییە هەر دڵ کە کەمێ عەشقی تێدابێ
بۆ تیری موژەی تۆ نەبوو بێ ئەو بەنیشانە[3]

وەک خەنجەری جەللادە دوو ئەبرۆی هیلالیت(٤)
خـــون ڕێژ و دڵ ئازاری هەمـــوو پیـــر و جــەوانە
تیـری نیگەهت نیـعـمـەتە بۆ عـاشق ئەبارێ(٥)
ئەم گونجی غەمی من هەمە، گولزاری جینانە(٦)
ئاشــــووبی دڵی عـــالەمی، جـیلوە مـەنوێنە(٧)
بەم قەددی لەطیفەت کە ئەڵێی سەروی چەمانە
مـەیلت هەیە (زێوەر) کـە کـەمێ صـەبری بمێنێ
پەخشـانی مـەکە طوورڕەیی شـاهانە بەشـانە(٨)

---

* ئەم شـیـعـرە لە ل٢٨١ی کـەشکۆڵی مـەلا فـەتاحی کـاگـردەڵی نووسـراوەتەوە لە ل١٨٠-١٨١ی کـەشـکۆڵی (أ) و ل٤٢ی کەشکۆڵی (ب)شدا هەیە هەروەها لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمـارە ١٤٢، ل١٨شدا بڵاوکراوەتەوە. ئێمە دەقی کـەشکۆڵی کاگر دەڵیمان بەلاوە پەسندتر بوو کردمان بەبنچینە و ئاماژەی جیاوازییەکانی تریش لە پەراوێزدا دەکەین.

(١) شاهی زەمین زەمانە کەشکۆڵی کاگر دەڵی:
ماهی زەمین شاهی زەمانە کەشکۆڵی أ،ب، بەیان.

(٢) تەصویر «کاکر دڵی» تەقریر (کەشکۆڵی (أ،ب)، بەیان)

(٣) نەبووبی ئەو بەنیشانە (کاگر دڵی)، کە نەبووبی بەنیشانە (کەشکۆڵی أ.ب، بەیان)

(٤) هیلالیت «کاگر دەڵی» هیلالی (کەشکۆڵی (أ،ب)، بەیان)

(٥) نیگەهت «کاگر دەڵی» ستەمت (کەشکۆڵی (أ،ب)، بەیان)

(٦) گولزاری جینان: گولزاری بەهەشت.

(٧) جیلوە: ورشە و تیشک و ڕووناکی.

(٨) طوورڕەیی شاهانە: مۆری طوغرای شاهانە، مەبەستی زولفی پێچ پێچ و تێک چرژاوە کە وەکو مۆری طوغرا دەچێ.
واتە: ئەگەر دەتەوێ زێوەر کەمێک صەبر و ئارامی لە لا بمێنێ زولفی پێچ پێچ و لوولت کە لە مۆری طوغرا دەکا چیتر بە شانە دای مەهێنە و پەخشانی مەکە چونکە تا تۆ زولف بەشانە دابهێنی و تاڵ تاڵی کەی صەبر و ئارام لەلام کات بەکات سات بەسات کەم دەکا و نامێنێ.

## لە بەختی من*

لە بەخـتـی من سـتــەمکار و لەئیـــمــە
لەلای خـــەڵقی وەفـــادار و کــــەریمە
چ حـاجـەت من بڵـێم، سـەودا زەدەی تۆم
بە حـاڵی عـاشـقـانی خـۆی حـەکـیـمـە
نیـشـانگای تیـری ئاهم وەقـتی دووری
سەری کورسی و پێی عـەرشی عـەظیـمـە
لەگەڵ ئەو مەهـ جەبینەی من ڕەقیبم(١)
دەڵێی طاووس و شـەیتانی ڕەجیـمـە(٢)



چراغی شـــادمـــانی من هەمـــیــشــە
لە ئەطرافی شـیـمـالی غـەم مـوقـیـمـە
بەهەشت و کـەوثەری من وەصـڵی تۆیە
ئەمـا دووری لە تۆ ناری جـەحـیـمـە
چلۆن لادەم لە ڕێگای عـەشـقـبـازی؟
بە فـەتوای من (صـراط المسـتـقـیم)ە
لەگـەڵ (زێوەر) وەفـاداری لەطیـفـە
کـە چونکە جـان فـیـدایێکی قـەدیمە

---

* ئەم شیعرە لە ژمارە ١٢٧ی گۆڤاری بەیان وەرگیراوە.

(١) مەهـ جەبین: ئەوەی ڕوخساری وەک مانگ بێ. ڕەقیب: ئەوەی بەدکاریی لەنێوان دڵدارندا دەکا.

(٢) طاووس: ناوی شەیتان بووە پێش ئەوەی سەرپێچی بکا لە کڕنووش بردن.

## من لە سایەی حوسنی تۆ*

من لەسـایەی حـوسنی تۆ قـەلبـێکی پڕ شـادم هەیە
گـەرچی هەر سـاتێ لەلای تۆ ظوڵمی بێ دادم هەیە(١)
سواری ئەسپی کیبر و نازی، ناتگەمێ هەرچەند بڕۆم(٢)
ناعـیـلاجم وەک جـەرەس ئەفـغـان و فـەریادم هەیە
ماهی عەشقت موشکیل و، وەصڵت لەڕێی هاتو نەهات
بێ شکە جەولانی بێشکە و شـەوقی دامـادم هەیە(٣)
ئەمری حەربم بێتە سەر بەم ئەشکە سەددی ڕێت ئەکەم
تورکی مـوژگـانت هەیە، من چاوم ئیـمـدادم هەیە(٤)
چونکە قەت ناگەم بەکۆی تۆ وەک نەسیمی صوبحدەم
هەر سـەحـەر گـاهێ تەمـەنای نیـعـمـەتی بادم هەیە
ئەی خـــوا ڕەحـــمت ببێ واپێم ئەڵێ خـــەوفت ببێ
شـــیـــری ئەڵمـــاسی بڕۆ و چاوێکی جـەللادم هەیە
من وتم (زێوەر) بەخـەندەی لێـوی (شـیـرین) مـردووە
پێی وتم: مـــەجنوونە، وەک تۆ چەندە فـــەرهادم هەیە

---

* ئەم شیعرە لە کەشکۆڵی (أ)، ل١٨٠ و ل٤١-٤٢ی کەشکۆڵی (ب)دا هەیە لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ١٢٧، ل٨٦دا بڵاوکراوەتەوە.





(١) زولّم: جەور و ستەم. بێداد: زۆر و زەبەندە.
ظولّمی بێداد (کەشکۆڵی، أ) - ظولّم و بێداد (سەرچاوەکانی تر)
(٢) کیبر: لە خۆ ڕازی بوون.
(٣) داماد: دایک. لە نێوان (بێ شکە) و (بێشکە)دا جیناسی مورەککەب هەیە.
(٤) چاوم (کەشکۆڵی، أ) - چاوی (سەچاوەکانی تر)
تورکی: تورک لە ئەدەبیاتی کۆندا کینایەیە لە یاری شۆخ و شەنگ.

## قوربان!*

قوربان! لە تەمی ئاهی دڵی خەستە حەذەر کە(١)
عیسا نەفەسی، هەستە بەلای ئێمە گوزەر کە(٢)
ئەی چیهرە مەلەک حەیفە ڕەقیب بۆتە ئەنیست(٣)
لەو جەننەت و فیردەوسە ئەو ئیبلیسە بەدەرکە(٤)
وا جەژنە خەلایق هەموو پڕ زەوقن و شەوقن
بەو خەندەی شیرینە جیهان پڕ لە شەکەر کە
جەژنانەی من ماچی دەمی تۆیە کە بیدەی
طیفلی دڵی من غەرقی حەنای خوێنە، نەظەر کە(٥)
ڕەغمەن لە حەسوودانی من و دوژمنی بالآت(٦)
ئەم جەژنە وەرە! ئەم غەزەلە تازە لەبەر کە(٧)
ئەو دلبەرە، ڕەنگینە کە سەنگین دڵە دایم
ئەی نالەی ناری لە دڵی خەستە ئەثەرکە
دڵ کون کونە (زێوەر) بەخەدەنگی موژە دایم
لادە لە دڵی، ڕۆحی ڕەوانی بەسەپەرکە

........................................................

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١٧٥-١٦٧ی کەشکۆڵی (أ) و لاپەڕە ٣٨-٣٩ی کەشکۆڵی (ب)دا نووسراوەتەوە لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ١٢٧، لاپەڕە ٨٨دا چاپ کراوە.
(١) حەذەر کە: ترست بێ.
(٢) عیسا نەفەسی: واتە وەکو حەزرەتی عیسا دەم و دوعات کاریگەرە و نەفەست پاکە، مەشهوورە کە موعجیزەی حەزرەتی عیسا ئەوە بووە کە بەدوعا و پاڕانەوە لە خوا مردووی زیندوو کردۆتەوە و نەخۆشی چاک کردۆتەوە.
(٣) چیهرە: ڕوخسار. مەلەک: فریشتە. ڕەقیب: بەدکار. ئەنیس: هاونشین، هاودەم
(٤) جەننەت: بەهەشت. فیردەوس: ناوە بۆ ئەو بەهەشتەی کە حەزرەتی ئادەم تیابوو تا تووشی گوناهی خواردنی گەنم بوو. ئیبلیس: شەیتان.
(٥) حەنا: خەنە. نەظەرکە: واتە بڕوانە و سەیر بکە.
(٦) ڕەغمەن = رغماً: بەکوێرایی چاوی.





(٧) غەزەل: پارچە شیعر: یان جۆرە قوماشێکی گرانبەهایە واتە بەکوێرایی چاوی ناحەزانی من و دوژمنی بالآ بەرز و ڕێکوپێکەکەی خۆت وەرە ئەم چەژنە ئەم پارچە شیعرە کە لە وەصف و ثەنای بالآکەتدا دامناوە بیخوێنەوە و لەبەری بکە چونکە بەوە ناحەزانمان دەتەقن و تووشی هەزار دەرد و ناخۆشی دێن. یاخۆ (زێوەر) هاتووە پارچە شیعرەکەی شوبهاندووە بەقوماشی غەزەل، خوێندنەوەی غەزەلەکەش کە هەر لە پێداهەڵدانی بالآی یار دایە شوبهاندوویەتی بەوە کە یار قوماشی غەزەل بکاتە بەر.
مامۆستا (نالی)یش دەفەرموێ:

قوربان! وەرە با ئەم غەزەلە تازە لە بەرکەین
عیزز و شەرەفی (نالی)یە تەشریفی قەدی تۆ

## بەدوو زولفی*

بەدوو زولفی تەناف بازت ئەڵێن دوو بەچچە عەییارە(١)
بەدانەی خاڵەکەی سەر ڕوو ئەڵێن: هیندوویی گوڵزارە(٢)
بەچاوی مەست و خوون ڕێزت ئەڵێن یابازە یا شاهین(٣)
ئەڵێن: ئەو تیپی موژگانە سوپای ماچین و تاتارە
بەجیلوەی قەددی مەوزونت ئەڵێن وەک تاوسی باخی
لەبەر شیرینی نوتقت ئەڵێن لێوت شەکەربارە

........................................................

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١٧٩ی کەشکۆڵی (أ) و لاپەڕە ٤١ی کەشکۆڵی (ب)دا هەیە لە بەیانی ژمارە ١٢٧، لاپەڕە ٨٢شدا بڵاوکراوەتەوە.
(١) طەناف = تەناف بازت: وەک تەناف. بەچچە: بەچکەی پیری موغان، لە ئەدەبی کلاسیک کینایەیە لە یار.
(٢) هیندو: خەڵکی هیند، زۆر لە شاعیرانی کۆنمان خاڵی ڕەش و بسک و زولفی یاری خۆیانیان بەهیندو شوبهاندووە لەو ڕووەوە کە هیندو کافرن کافریش بەڕەنگی ڕەش کە نووری ئیمانی تێدا نییە ناسراوە.
(٣) باز و شاهین: دوو پەلەوەری ڕاو پێکردنن، شاعیران چاوی یاری خۆیانیان پێ شوبهاندوون لە توانایاندا بۆ ڕاو پێکردنی دڵی دڵداران.

## چۆن ڕەحمی ئەبێ؟*

چۆن ڕەحمی ئەبێ ئەو دڵە ڕەق هەر وەکو سەنگە؟
کەی نوتقی ئەبێ ئەو دەمە وەک غونچەی تەنگە
ئەو چاوە بەشەڕ عاشقە، من تالیبی سوڵحم
گەر سوڵحە وەگەر جەنگە دەسا فەرموو درەنگە
کاروانی سوروشکم کە لەگەڵ نالە ڕەوانە
عەیبی نییە تەزیینی ڕەهی قافڵە زەنگە
ئەو کافرە ئیسلامی هەموو خستە هیلاکەت
ڕەنگە کە بزانێ هەموو جێ دەشتی فەڕەنگە

ئەو نەشـئـە کـەوا سـاغـیـری چاوی بەدڵـی دا
ئوسـتـادی هەزار کـووپە مـەی و نێـرگـەلە بەنگە
لایق نیـیـە هەر مـوردە بلّێ زیندە بەعـەشـقم
دەریای مـەحـەببـەت بەخـوا بەحـری نەهەنگە
گەه جـادووە، گـەه ئاهووە، گـەه تاوسی مـەسـتـە
(زێوەر) چییـە ئەو شۆخە لەسەد هەیئەت و ڕەنگە

........................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٧٧ی کەشکۆڵی (أ)دا نووسراوەتەوە

## حەواسم*

حەواسم هەر وەکـو زوڵفت چلۆن شێـواوە، شـێـواوە(١)
دڵم وەک خاڵی ڕوخسارت چلۆن سووتاوە، سووتاوە(٢)
ئەگـەر تۆ سـەیری سەرچاوە و گـوڵسـتـانت هەوەس دێنێ
سوروشکم ڕەنگی گوڵزارە. وەرە سەرچاوە، سەرچاوە(٣)
لە بەختی من ڕەقیب یارەببی چەندە شووم و بەدبەختـە
بەرەو ڕوو هەم شـەرم ناکـا؛ ئەڵێ: بەولاوە، بەولاوە
بەمەحزی خاکساریی دەفعی کینەی ناکرێ هەرچەند(٤)
سـەرم وەک ئاسـمـان ئەرزی لەڕێی داناوە، داناوە(٥)
ئومێدی چیم بەدنیا بێ هەتاکەی مەستی غەفڵەت بم؟
زەمـانی تۆبەیە، تا شـیـشـەی پڕ بادە نەشکاوە(٦)
فـەلەک ئاش و زەمین بەرداش و ئینسـان دانەیە، یاخـۆ
ئەجەل باز و بەدەن «کەبک»ە سەدای هاڕاوە، هاڕاوە(٧)
ئەلا ئەی باغـەبان بۆ بۆنی گـوڵ سـەودازە دەم ئەمرۆ(٨)
کـە هەم بۆی یارە، وا (زێوەر) لەدەردا مـاوە، دامـاوە

........................................................

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١٧٨-١٧٩ی کەشکۆڵی (أ) و لاپەڕە ٤٠ی کەشکۆڵی (ب)دا نووسراوەتەوە لە گۆڤاری بەیانی ژمارە ١٢٧، لاپەڕە ٨٠ بڵاوکراوەتەوە.

(١) حەواسم: کۆی (حاسّە)یە ئامێری هەستکردن؛ ئامێری بیستن و دیتن و بۆنکردن و تامکردن و لێخشان.

(٢) تەشبیهەکە لەوەدایە خاڵ ڕەشە شتیش کە سووتا ڕەش دەبێ.

(٣) سوروشکم: فرمێسکم. واتە ئەگەر تۆ ئارەزووت لێیە سەرچاوە و گوڵزار ببینی وەرە سەیری کانیاوی فرمێسکم بکە هەمووی وەکو ڕەنگی گوڵ سوور و خوێنینە.

(٤) مەحز، مەحض: تایبەتی و خصوصی. خاکساری: خۆڵاوی ئەوەی لە ناو خۆڵا بتلێتەوە و خۆی خۆڵاوی بکا.





(٥) واتە هەرچەندە سەرم بەرزە و گەیشتۆتە کەشکەشانی فەلەک کەچی کردوومەتە گڵ و خۆڵی ژێر پێی یار و وەکو ئەرز کەوتوومەتە ژێر پێی.

(٦) شیشەی پڕ بادە: مەبەستی (دڵ)ە تەشبیهی دڵی خۆی کردووە بەشووشەی پڕ لە مەی، لێرەدا ئیستیعارەیەکی موصەڕڕەحە پێک هاتووە چونکە شکان بۆ شووشە دەبێ.

(٧)کەبک: کەو. هاڕاوە: دوو وشەیە (ها + ڕاو) (ها)ی دەنگدان و فرمان پێکردن لەگەڵ وشەی (ڕاو)، واتە ها! کوڕینە! یاڵڵا کاتی ڕاو و نێچیر گرتنە. بەهێنانی وشەی (هاڕاو) لەپاش (ئاش) و (بەرداش) و (دانە) هاڕاوی باراشیش دەگەیەنێ.

(٨) سەودازە: دووچار و نەخۆش.

## تکاندی ئابڕووی*

تـکـانـدی ئـابـڕووی چـەمـــــن بـەڕووی ئـابـدارەوە
شکاندی نرخی نەسـتـەرەن بەزوڵفی مـوشک بارەوە
چمە لە مەی لە نەی لە جام، ئەگەر بەلەنجە بێتە لام
بەڕووی تـابـدارەوە، بەچـاوی پڕ خـــومـــارەوە
عـەرەق نیـیـە لە عـالـەمـا، کـە لابەرێ لە دڵ غـەمـا
جگە لە قـەترە ئارەقێ لە ڕووت کـە دێتـە خـوارەوە
نیـشـاطی من جـەمـاڵی تۆ، بەراتی من ویسـاڵی تۆ
خـەیاڵی من لە خـاڵی تۆ بەعـیـشـوە لێم مـەشـارەوە
عـەزیزەکـەی حـەبیبی من، نیگارەکـەی طەبیبی من
کـە شـەق بەرێ ڕەقـیـبی من، وەرە بەسـەد ویقـارەوە
فـیـدای خـەدد و قـەددی تۆ چەمـەن بەفـەوجی گـوڵیـەوە
بە بولبـول و بەچڵـیـەوە، بەقـومـری و هوزارەوە
فەرەنگ ڕووی زەنگ موو، عەجەم سیاق و ڕووس خوو
ئەناسـرێ کـە کـوردە زوو بەپێـچی لار و خـوارەوە
نیساری زوڵفی عەنبەری هەموو وڵاتی «گوڵ عومەر»(١)
بەعـەرد و بەرد و دارەوە، بەئـاوی سـەرچنارەوە
ئەمن گـەیاندمـە (ئەنوەری) فنوونی شیـعر و شاعـیری
ئەتۆ گـەیانتـە (سـامـیری) بەچاوی سـیـحرکـارەوە

........................................................

* ئەم شـیـعـرە ناوازەی زێوەر لە ل١٧٣ی کـەشکۆڵی (أ) و ل٣٧ی کـەشکۆڵی (ب)دا نووسـراوەتەوە، سێ دێر شـیـعـری سەرەتاشی لە گۆڤاری گەلاوێژی ژمارە (١)ی ١٩٨٤ی ز ل٤٨ بڵاوکراوەتەوە.
تەواوی قەسیدەکەش لە ل٤٩١-٤٩٢ی کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی مامۆستا عەلائەدین سەججادی دا چاپ کراوە.

(١) گولْ عومەر، گولْ عونبەر، گولْ عەنبەر، ناوێکی دێرینی شاری خورماڵە کە بەهێندێ ڕای مێژوویی لەسەر شوێنەواری شاری شارەزوور بنیات نراوە.

## دەمێکە*

دەمێکە شاعیران هەموو بەشیعری ئابدارەوە
ئەسیری دەستی دولبەرن بەزوڵفی تابدارەوە
دەمێکە وەصفی مەی دەکەن، غەزەل بەمانا تەی دەکەن
بە جارێ مەدحی نەی دەکەن، کە دێتە بەزمی یارەوە
دەمێکە صەرفی عومر دەبێ، لە نەعتی ئاوی خۆشی گولْ
بە بولبولی چەمەن خوصووص بەسەروی جۆیبارەوە

........................................................................

* ئەم پارچە شیعرە لە ڕۆژنامەی (ژیان)ی ژمارە (٤١٤)ی ساڵی ١٩٣٥دا بڵاوکراوەتەوە جا نازانم ئایا ئەم سێ دێرە شیعرە لەگەڵ شیعرە ناوازەکەی تری (تکانی ئابڕووی چەمەن، بەڕووی ئابدارەوە) یەکێکن یان ئەمە سەربەخۆ بۆ خۆی پارچەیەکی ترە.

## تابی هیجرانم نەماوە*

تابی هیجرانم نەماوە، نووری چاوانم وەرە(١)
ساکینی بەیتول حەزەن بووم ماهی کەنعانم وەرە(٢)
وام لەنێو ظوڵماتی غەمدا هەر طەڕەف ڕێگام نییە
تارەمەق ماوە لە عومرم شەمسی تابانم وەرە(٣)
شەهسەواری مولْکی حوسنی، من پیادەی بەردەست
ئەسپی نازت وەرمەگێڕە، شاهی خووبانم وەرە(٤)
کەوکەبی بەختم غورووبی کرد و بێ کەس مامەوە
زوو بە دەرخە شەوقی ڕووت شەمعی شەبوستانم وەرە(٥)
من نەتریاکی و نە بەنگیم. مەستی نەشئەی چاوی تۆم(٦)
چاوەڕێی دەردی خومارم صوبحی ڕەخشانم وەرە(٧)

........................................................................

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١٦٨-١٦٩ی کەشکۆڵی (أ) و لاپەڕە٣٤ی کەشکۆڵی (ب)دا نووسراوەتەوە لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ١٤٢، لاپەڕە ١٧دا بڵاوکراوەتەوە.

(١) تاب: هێز و توانا. هیجران: دوورکەوتنەوە لە خۆشەویست.

(٢)بەیتول حەزەن = بيت الحزن: خانووی خەم و خەفەت و ئاماژەیە بۆ ماڵەکەی حەزرەتی یەعقووب پێغەمبەر کە یوسفی کوڕی لێ ون بوو ئیتر کەنەفت کەوت و کوێرایی داهات و دنیای لێ تاریک بوو. شاعیرانی ئەدەبی کلاسیکی ئەم خانووەی یەعقووبیان کردووە بەڕەمز بۆ خەم و ناخۆشی.





ماهی کەنعان: مانگی وڵاتی کەنعان، مەبەستی حەزرەتی (یوسف)ە کە براکانی خستیانە بیری کەنعانەوە دوایی کاروانێک دۆزییانەوە و بردیان لە میسر فرۆشتیان و پاشان حەزرەتی یوسف لە میسردا پلە و پایەی وەرگرت و براکانی هاتن بۆ لای و بەوان دا کراسەکەی بۆ باوکی ناردەوە و چاوەکانی چاک بوونەوە پاش ماوەیەک هەموویان هاتن بۆ لای یوسف بەیەکتری شادبوونەوە.

(٣) شەمسی تابان: خۆری تیشک دەرەوە و ڕووناکی بەخش.

(٤) شاهی خوبان: پاشای جوانان.

(٥) شەمعی شەبیستان: بەو چرایە دەڵێن کە لەسەر ئارامگا و مزگەوتەکاندا بەشەو هەڵدەگیرسێندرێ. یان بەو مۆمە دەگوترێ کە لە حەرەمسەرای شاهاندا یا لەسەر تەختی نووسینیان هەڵدەکرێ.

(٦) تریاک: تلیاک بەعەرەبی پێی دەگوترێ: (ترياق)

(٧) صوبحی ڕەخشان: بەیانی ڕووناک.

## تا زولفی لەسەر چیهرە*

تا زولفی لەسەر چیهرە پەریشانی صەبایە(١)
ئاشوفتەگیی و تیرەگیی بەختی سیایە(٢)
ڕووی و لەب و مووی هەمدەم و ئامیزشی یەک بوون(٣)
غونچەی چەمەن و بەردی یەمەن، موشکی خەتایە(٤)
شمشادی قەدی سەروی خەرامانە ڕەوانە
جێ گیری دڵی پادشەهـ و شاهـ و گەدایە
چاوی کە وەکو دیدەیی بازێکە شکاری
دڵ وەک کەوی بێ چارە گرفتاری بەڵایە
(زێوەر) نییە دۆستێ کە ڕەقیب تووشی بەڵا کا
مەعلوومە ثەوابی ئەمە وەک حەجج و غەزایە

........................................................................

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١٧٤ی کەشکۆڵی (أ) و لاپەڕە ٣٧ی کەشکۆڵی (ب)دا هەیە. لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ١٤٢، لاپەڕە ١٩دا چاپ کراوە.

(١) چیهرە: ڕوخسار. صەبا: بای صەبا، شنەبای بەیانی.

(٢) ئاشوفتە: تێکچوو، حاڵ شێواو. تیرگی: تاڵی و ناخۆشی.

(٣) لەب: لێو. ئامیزش: باوەش تێک وەرهێنان.

(٤) بەردی یەمەن: بەردێکی سووری بەقیمەتە، ئاقیقی پێ دەگوترێ. میشکی خەتا: میسکی وڵاتی خەتا. ئەڵێن جۆرە ئاسکێک هەیە لە وڵاتی تورکمانستان کە لە ئەنجامی هەڵاتن و ماندووبوونی زۆرەوە خوێن لە ناوکی دەتزێ و خوێنەکە ڕەش هەڵدەگەڕێ و وشک دەبێتەوە وەک لە ناو کیسەیەک دابێ بەناوکییەوە تەکە تەکی دێ و لەدواییدا لە غارداندا لێی دەکەوێت، ئەو خوێنە وشک هەڵاتووە عەترێکی زۆر بۆنخۆشی لێ پەیدا دەبێ. شایانی باسە کە شاعیر لەم دێرە شیعرەدا (لەف و نەشرێکی) بەلاغی بەکارهێناوە، چونکە لە نیوە دێری یەکەمدا (ڕوو لەب و مووی) هێناوە لە نیوە دێری دووەمیشا بەرامبەر ئەم سێ شتە (غونچەی چەمەن و بەردی یەمەن و موشکی خەتای) هێناوە ڕووی بەرامبەر غونچە،

لێوی بەرامبەر بەردی یەمەن، مووی بەرامبەر میشکی خەتا، کردوون.

شایانی باسە کە کاک (محەمەد عەلی قەرەداغی) کاتێ ئەم شیعرەی لە بەیان دا بڵاوکردۆتەوە لە جیاتی (بەردی یەمەن) کە بەردێکی سووری بەقیمەتە لە دەریای یەمەن دەردەهێنرێ. (بوردی یەمەنی) نووسیوە.

## دڵ*

دڵ کە غەیری شکەنی زوڵفی تۆ ئەفکاری نییە
تووشی سەودا بووە تا ڕۆژی ئەزەل چاری نییە[١]
زاهید! ئەر دیدەیی تەڕ ئەشکی هەمەڕەنگی نەبێ[٢]
لێی گەڕێن مەنعی مەکەن میحنەتی دڵداری نییە
نیشی زەخمی موژەیی دولبەری کەم دیوە مەگەر[٣]
هەر کەسێ تا بەسەحەر ناڵەو و هاواری نییە
هەر کەسێ فەیضی قەدەم بۆ سیی ئەتۆی بەرنەکەوێ
لە قیامی عەرەصاتا ئەحەدێ یاری نییە[٤]
بۆیە پەردەی لەسەر و ڕووی فڕێداوە نیگار
تا بڵێین خۆی چەمەنە حاجەتی دیواری نییە[٥]
تا لەمن دوورە هەوای کاکۆڵی موشکین، دڵەکەم[٦]
سەیری باغ و هەوەسی دیدەنی گوڵزاری نییە
(زێوەر)ی دەربەدەر ئەمڕۆ لە فیراقت نەفەسێ
غەیری غەم خواردن و گریانی حەزین کاری نییە

........................................................

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١٨٣-١٨٤ی کەشکۆڵی (أ) و لاپەڕە ٤٤ی کەشکۆڵی (ب)دا نووسراوەتەوە. لە ژمارە ١٢٧ی گۆڤاری (بەیان)یش بڵاوکراوەتەوە.

(١) شکەن: پێچ و لوول. ئەفکار: کۆی (فکر)ە بەمانا ئەندێشەیە. دەشگونجێ وشەکە (ئەفگار) بێ واتە: بریندار و دووچار. سەودا: عەشق، سەرەخولە، تووش هاتوو. (ئەزەل = أزل) ڕابووردوێکی کۆن کە سەرەتای نەبێ. وابزانم وشەکە (ئەبەد = أبد) بوایە جوانتر بوو.

(٢) زاهید! ئەر: بۆ وەزنی شیعر ئەم وشەیە دەبێ بە (زاهیدەر) بخوێنرێتەوە.

(٣) لە گۆڤاری (بەیان)دا ئەم نیوە دێرە شیعرە بەم شێوە بڵاوکراوەتەوە (نیش و زەخمی موژەیی دلبەری کەم دیوە ئەگەر).

(٤) فەیض: لێشاوی ڕەحمەت. قەدەم بۆسی: قاچ ماچکردن. قیامی عەرەصات: زیندووبوونەوە و هەستانی دەشتی مەحشەر.

(٥) فڕێداوە: هەموو سەرچاوەکانی جگە لە کەشکۆڵی (أ) کە لەوێدا نووسراوە: لاداوە. چەمەن: باخ و گوڵزار.

(٦) کاکۆڵی موشکین: زوڵفی بۆنخۆش و ڕەشی وەکو میشک.





## چاوەکەت بۆ من*

چاوەکەت بۆ من لە باتی نێرگسی شەهلا بەسە[١]
سەیری ڕوخسارت لە باتی لالەیی حەمرا بەسە[٢]
ڕۆیین و دانیشتن و هەستان و وەستانێکی تۆ
بۆ منی بێ دڵ لەجیاتی سینەمای بەغدا بەسە
ڕادیۆم ناوێ کە گوێ بگرم لە دەنگی ساز و نەی
لەو دەمی پڕ شەککەرەت جوێن دانی بێ مەعنا بەسە
چیم لە باسی لەشکری ئینگلیز و ئەڵمانی هەیە
لەشکری موژگانی تۆ بۆ حەملەو و دەعوا بەسە
بێمە وەصفی قامەتت فیکرم ئەوەندە بەرز ئەبێ
بانگ ئەکەن -تەییارەچی!- جەولانی بۆ باڵا بەسە[٣]
مەطلەعی شیعرم صەریحە من کەوا شیعەی (عەلی)م
حوببی ئالی ئەو لەباتی نیعمەتی دنیا بەسە
گەه عومەر!؟ گاهێ عەلی!! (زێوەر!) ثەباتێکت نییە
بەسیە دوو ڕەنگی و ڕیایی مەسرەفی بۆیا بەسە

........................................................

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١٦٦-١٦٧ی سۆزی نیشتمان چاپ کراوە. لە ڕۆژنامەی (ژین)ی ژمارە ٦٠٨ی ساڵی ١٩٤٠ی ز لەژێر ناوونیشانی (هەڵبەستی زێوەر) بڵاوکراوەتەوە هەروەها لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ١٤٢ی ساڵی ١٩٨٨ی ز لاپەڕە ١٧ جارێکی تر بڵاوکراوەتەوە.

(١) شەهلا: بەچاوێک دەڵێن کە ڕەشییەکەی مەیلەو شین بێ. لەم دێرەدا موعەممایێکی تێدایە بۆ ناوی ئیمامی عەلی لە موعەمماکەش بەم جۆرەیە (چاو = عین = ع بۆ من = لی) واتە (علی).

(٢) لالەی حەمرا: گوڵە لالەی سوور. پێویستە ئەوە بگوترێ کە (لالە) گوڵێکی جوان و قەشەنگە لە جێگای تەڕ و شێدار و قەراخ ئاودا دەڕوێ بەعەرەبی پێی دەڵێن: (شقائق النعمان) گەلێ جۆری هەیە هی وا هەیە سێ پەڕە، هەشە پێنج پەڕە. لە کەژ و کێویش دەبێ و لە باخچەی ماڵانیش دا دەیڕوێنن ئەوەی لە کێو دەڕوێ پەڕەکانی سوور و بنی پەڕەکانی لەککەیەکی ڕەشی پێوەیە. شاعیران گوڵە لالەیان کردووە بەڕەمز و میثالی کولم و ڕوخساری جوان.

(٣) جەولانی بۆ (کەشکۆڵ و بەیان) - سەرکەوتنی (ژین)

## دڵی من*

دڵی من دەرحەقی تۆ هێندە صافە
وەکو زاهید خەریکی ئیعتیکافە[١]
مەکە باوەڕ بەقەولی دوشمنانم
قسەی دوشمن هەموو لاف و گەزافە[٢]

دوو زولفت موو بەموو هاتوون بەیەکدا
لە بۆ ئەم گەردنە تەوق و تەنافە(٣)
لەگەڵ وەصڵم بەتۆ بوو ڕۆحم ئەڕوا
وەکو (نوون)ی (مثنی) لای ئیضافە(٤)
وەرە (زێوەر) نەصیحەت بگرە گوێ، خۆت
لە ئەم ڕێگایە لادە ڕێی خیلافە

.....................................................................

* ئەم شیعرە لە ل٩٢ی گۆڤاری بەیانی ژمارە ١٢٧ وەرگیراوە.
(١) ئیعتیکاف: ئەوەیە ماوەیەک لە مزگەوت بمێنییەوە بۆ خواپەرستی و عیبادەت نییەتی ئیعتیکاف (مانەوە) بێنی و بەرەو قیبلە دابنیشی.
(٢) لاف و گەزاف: درۆ و دەلەسە.
(٣) طەوق طەناف: مەبەستی ئەوەیە کە زولفەکانی برێکیان لە گەردنی ئالاون و بوون بەتۆق. برێکیشیان تەناف ئاسا بەلاشانیدا هاتوونە خوارێ.
(٤) (نوون)ی (مثنی) و ئیضافە: دوو زاراوەی عیلمی نەحوون واتە ئیسمێک ئەگەر تەثنیە بوو وەکو، (طالبان، طالبین) ئەگەر ئیزافە کرا و پاڵی درا بەئیسمێکی ترەوە وەکو (المدرسة) دەگوترێ: (طالبا المدرسة). پیتی (ن)ەکە لادەبرێ و نامێنێ.
شاعیریش دەڵێ ڕۆحم وەکو نوونی موثەننا وایە لەگەڵ گەییشتم بەتۆ وەصڵی تۆم بۆ هەڵکەوت ئیتر ڕۆحم نامێنی و گیانم دەردەچێ.

## تالبی ڕووتم*

تالیبی ڕووتم بەئەگریجەت پەرێشانم مەکە
من کە ئیسلامم حەواڵەی کافرستانم مەکە
کونجی عوزلەت ئیختیارم کردووە مەمهێننە دەر(١)
عاشقم دێوانە نیم سا بەردە بارانم مەکە
نەقشی بەست حوببت لە دڵما، ئاسمان نایباتە دەر
سا کەمێ مەیلی منت بێ دڵ پەرێشانم مەکە(٢)
دێمە بەردەرگانەکەت تەنها بەبێ یار و ڕەفیق
جار بەجار بمخوێنەوە داخڵ بەنیسیانم مەکە
چاوی مەستت شێخ و مەللا هەردوو حەیرانی ئەبن(٣)
وا بەغەمزە ئەقڵ و دینت برد لە ئیمانم مەکە
بیستوون کەی وەک دڵی من تیشەکاریی لێ کرا؟
بۆ تەحەممول وێنەی سامی نەریمانم مەکە(**)





طەبعی (میرریخ)ت هەیە بەو طەلعەتی وەک (زوهرە)یە(٤)
(موشتەری)ی تۆم طالیبم، مەهتووکی یارانم مەکە(٥)
(زێوەر)ە هەرجان فیدابێ، دڵ فیدابێ سەر فیدا
مەمخەرە دەرد و موصیبەت تووشی هیجرانم مەکە

.....................................................................

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١٧٤-١٧٥ی کەشکۆڵی (أ) و لاپەڕە ٣٨ی کەشکۆڵی (ب)دا نووسراوەتەوە. لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ١٢٧، لاپەڕە ٨٩ دا بڵاوکراوەتەوە.
(١) کونجی عوزلەت (کەشکۆڵی أ) گەنجی عوزلەت (سەرچاوەکانی تر).
(٢) سا کەمێ (کەشکۆڵی أ) تۆش کەمێ (سەرچاوەکانی تر).
(٣) شێخ و مەلا (کەشکۆڵی أ) لە سەرچاوەکانی تردا ئەم نیوە دێرە بەم جۆرەیە (چاوی مەستت شاە و سوڵطان هەردوو قوربانی دەبن).
** ئەم دێرە شیعرە تەنها لە (کەشکۆڵی أ)دا هەبوو.
(٤) مەرریخ ئەستێرەیەکی گەڕۆکە لە هەموو ئەستێرەکانی تر نزیکترە لە خۆرەوە. زوهرە: ئەستێرەیەکی گەڕۆکە موعەددەل (١٠٨) ملیۆن کیلۆمەتر لە خۆرەوە دوورە کاتی هەڵهاتن و دەرکەوتنی دەگۆڕێ وەختی وا هەیە سەر لە ئێوارە هەڵدێ کاتی واش هەیە دەمەو بەیان بەدەر دەکەوێ. لەبەر بەشۆقی و ورشەی لە کۆنا بەخوای جوانییان داناوە پێیان گوتوە (آلهة الجمال) برێکیش لە عەرەبەکان پێش هاتنی ئیسلام پەرستوویانە.
(٥) موشتەری: کڕیار، ئاماژەشی تێدا بۆ ئەستێرەی موشتەری کە ئەویش یەکێکە لە ئەستێرە گەڕۆکەکان.

## ساقی بەجیلوە هەستە*

ساقی بەجیلوە هەستە بۆم پرکە یەک قەڕابە
ئەم شەو بەیادی چاوت مەیلم لەسەر شەرابە
من نامەوێ (حیجاز) و (ڕاست) و (نەوا)ی عیراقی
(شۆر) و (قەتار) و (حەیران) بۆ من بڵێن ثەوابە(١)
ڕووی دلبەرێکی کوردی نادەم بە (میسر) و (طائیف)
یەک بەیتی وردی نالی نادەم بەسەد (عەتابە)(٢)
دڵ دەردەداری یارە، بیمارو بێ قەرارە
بەینێکە ئینتیظارە، ئەحواڵەکەی خەراپە(٣)
مەنعم مەکە لە ناڵین ئەی شۆخی دیدە شاهێن
بۆ چاوەکانی مەستت، جەرگم ئەڵێی کەبابە(٤)
مەوجوود نەبێ ئەمانە، یا ئەو برۆ کەمانە
(زێوەر) بەتیری مەحنەت دووچاری سەد عەزابە

.....................................................................

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١٧٠-١٧١ی کەشکۆڵی (أ)دا و لاپەڕە ٣٥ی کەشکۆڵی (ب) نووسراوەتەوە بەڵام بەجیاوازییەوە

ئێمه (کەشکۆڵی (أ))مان کرد بەبنچینه و له پەراوێزدا ئاماژه بۆ جیاوازییەکان دەکەین.

(١) حیجاز و ڕاست و نەوا: ناوی گۆرانی عەرەبین. شۆر و قەتار و حەیران: ناوی گۆرانی کوردین وشەی (ثەوابه) له کەشکۆڵی (أ) (سەوابه) نووسراوه، له کەشکۆڵی (ب)دا (ثەوابه) نووسراوه هەردووکیان گونجاون دەشگونجێ وشەکه (صەوابه) بێ. له کەشکۆڵی(ب)دا پێش ئەم دێره شیعره ئەم دێره شیعرەش هەیه:

مطریب دەسا بهێنه ئالاتی کۆن و تازه
قانوون و چاڵغیی و نەی عوود و دەف و ڕوبابه

(٣،٢) له کەشکۆڵی (ب)دا ئەم دوو دێره شیعره پاش و پێشن. خەراپه: به (خەرابه) دەخوێندرێتەوه لەبەر (قافیەکه).

(٤) ئەم دێره شیعره له کەشکۆڵی (ب)دا نەبوو. دیده شاهێن: ئەوەی چاوی وەک چاوی شاهێن بێ... شاهێن: پەلەوەرێکی ڕاو پێکردنه له شێوەی هەڵۆ، شاعیران چاوی یاری پێ دەشوبهێنن له هێز و توانای ڕاوکردنی دڵی دڵداراندا.

## ئەمڕۆ*

ئەمڕۆ بەدووسەد غوصصەوه دڵ خەسته دووچاره[١]
بۆ هەجری ئەتۆ دەردی دڵم بۆته شەراره[٢]
ساڵ ساڵ غەمی هیجرانی ئەتۆ زیاتر ئەبینم
ئەمساڵ دڵی من طالیبی ڕووی عوشرەتی پاره
بێ ڕەحمی و، بێ مەیلی و، ناپرسی له حاڵم
لافاوی سروشکم که دەڵێی سەیلی بەهاره[٣]
قوربان سەبەبی قەتلی منه صوحبەتی ئەغیار[٤]
بنواڕە دەروونم که وەکو کوورەی ناره
بۆ عاجز ئەبم هەمدەمی ئەغیار و ڕەقیبی[٥]
گوڵ ڕەنگیی و، گوڵ دیاره که هەم صوحبەتی خاره[٦]
چۆن سینەی من مەرکەزی دینار و درەم بێ
لەعلی لەبی تۆم بێ که بەهای چین و تەتاره؟[٧]
گەر عاجز و، گەر زویر و، ئەگەر خوڕڕەم و شادی[٨]
ببەخشه له ڕێی نەشئەی ئەو چاوه خوماره[٩]
دڵ بوو بەئەسیری شەهی ئیقلیمی نەزاکەت[١٠]
یاڕەببی بەتای پەرچەمی بیدەی له قەناره[١١]
گەر (زێوەر) ئەڵێن بۆچی نەکەوته سەری کێوان؟
دیوانه گەلێ طالیبی نێو کووچەی شاره[١٢]

........................................................

* ئەم شیعره له ژماره ١٢٧ی گۆڤاری بەیان وەرگیراوه.

(١) غوصصه: غەم و ناڕەحەتی. خەسته: نەخۆش و دەردەدار.





(٢) بۆ هەجری ئەتۆ: لەبەر دوورکەوتنەوەی تۆ. شەراره: پڕیشکه ئاگر.

(٣) ئەشک: فرمێسک. سەیل: لافاو.

(٤) صوحبەتی ئەغیار: هاوڕێیەتی بێگانه.

(٥) ڕەقیب: ناحەز و بەدکاری نێوان یاران و دڵداران.

(٦) خار: دڕک.

(٧) لەعل: بەردێکی سووری گرانبەهایه له کان دەردەهێنرێ، شاعیران لێوی یاریان پێ شوبهاندووه له ئاڵی و سووریدا. چین و تەتار: دوو وڵاتن.

(٨) خوڕڕەم: تازه و تێراو و کەیف خۆش.

(٩) نەشئه: حاڵەتێکی نیمچه بێ ئاگایی و نیمچه سەرخۆشییه.

(١٠) شەه: پاشا. ئیقلیم: وڵات.

(١١) بەتای پەرچەمی: بەتاڵی مووی زولفی.

(١٢) لەم دێره شیعرەدا جوانی بایس (حسن التعليل) هەیه.

## سەبەب*

سەبەب مەهجووری دیداری یاره[١]
دڵم پڕ خوێن و چاوم ئەشکباره[٢]
تەماشای عالەمم حەصره لەسەر ڕووی
به دڵدا بێ خەیاڵێ، ڕووی نیگاره
له حەسرەت ڕووی نیگارینی هەمیشه[٣]
دەروونم پڕ له ڕەنج و پڕ له ناره
نەسیمی گوڵشەنم بادی سەمومه[٤]
بڵێ: گوڵ، بێ گوڵی ڕووت عەینی خاره
مەزاقم دەردی هیجرانی ئەتۆی دی
ئیتر شەککەر لەکن من زەهری ماره
مەکەن لۆمەم ئەگەر صەحرا نەوەردم[٥]
مەکانی ئاهووان و جێ شکاره[٦]
بەهاری عوشرەتم زستانه بێ تۆ[٧]
بەبێ من تۆ خەزانت وەک بەهاره
نەوەک هەر من گرفتاری نیگارم[٨]
هەزارێکی وەکو من ئینتیظاره[٩]
عەزیزان! باعیثی هیجرانه (زێوەر)[١٠]
بەدایم سینه چاک و بێ قەراره[١١]

.........................................................................

* ئەم شیعرە لە ژمارە ١٢٧ی گۆڤاری بەیان وەرگیراوە.

(١) مەهجوور: دوورخراوە، واز لێهێنراو.

(٢) ئەشكبار: فرمێسكاوی.

(٣) نیگارین: وەک وێنە جوان.

(٤) گوڵشەن: باخ و گوڵزار. بادی سەمووم: بایێكی گەرم گڕاوی و ناهەموار و ژەهراوی.

(٥) صەحرانەوەرد: ئەوەی بەدەشت و بیاباندا دەگەڕێ و لەوێ دەژیا.

(٦) ئاهووان: كۆی (ئاهو)وە واتە ئاسک. شكار: ڕاو.

(٧) عوشرەت: ڕابواردن.

(٨) نیگار: كینایەیە بۆ ئافرەتێ وەكو وێنە جوان بێ.

(٩) هەزار: ژمارەیەكی ئاشكرایە. هەروەها بەعەرەبی ناوە بۆ بولبول.

(١٠) باعیثی هیجران: هۆی دووركەوتنەوە لە یار و دڵدار.

(١١) سینە چاک: سینە لەت كراو.

## هەموو دەم*

هەموو دەم ئێستە موشتاقم كە نایێ دولبەرم یادێ(١)
ئەما ئەو ڕەنگە سەد ساڵیش لە حاڵی من نەكا یادێ
هەتا شیرینی دەوران و موقیمی ڕوتبەیی نازی(٢)
بە ناڵە و شۆڕش و غەوغا هەموو كەس بۆتە فەرهادێ
تەحەییور ماوم -ئەی یاران!- لەفەننی نازو خودبازی(٣)
چلۆن فێربوو كە منداڵیشە، بێ تەعلیمی ئوستادێ!؟!
گەلێكم وت بەدڵ: دانیشە دنیا پڕ لە ئاشووبە
هەتاكو عاقیبەت گرتی كەمەندی زولفی صەییادێ(٤)
دڵم وەک بولبولی گوڵزاری كیشمیر و سەمەرقەندە(٥)
لەسەد ئاواز ئەخوێنێ بۆ گوڵێ گەر لێی بدا بادێ(٦)
بەوێنەی كۆهكەن ضایع بۆ ناڵە و شیوەن و شینم(٧)
كە ڕەحمێكی نەكرد ئەو كافرە جارێ بەفەرهادێ(٨)
مەڵێن (زێوەر) بەخۆڕایی ئەناڵێنێ و ئەكا شیوەن
گرفتارە، برینداره، بەتیغی چاوی جەللادێ

.........................................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٩٣ی كەشكۆڵی (ا) و ل٥٣ی كەشكۆڵی (ب)دا هەیە. لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ١٢٧، ل٨٠ بڵاو كراوەتەوە.

(١) نایێ (كەشكۆڵ) ناوی (بەیان)





(٢) ڕوتبەیی نازی (كەشكۆڵ)، ڕوتبەیی نازە (بەیان).

(٣) خودبازی: بەكەسێک دەگوترێ لەخۆوە یاری و سەما بكا.

(٤) زولفی صەییادی (كەشكۆڵ) داوی صەییادی بەیان واتە: گەلێكم بەدڵ گوت دانیشە، ئەوەندە سەرەڕۆ مەبە وازی نەهێنا و بەقسەی نەكردم تا یار -بەزولفی وەک كەمەندی- گرتی و تێكییەوە پێچا و تازە ڕزگاربوونی نابێ. چونكە نێچیرەوان كە نێچیری گرت تازە زەحمەتە بەرەڵای بكا.

(٥) كشمیر: وڵاتێكی زەراعی گرینگە كەوتۆتە نێوان شیمالی هیند و پاكستانی غەربییەوە. سەمەرقەند: شارێكە كەوتۆتە ناوەڕاستی كۆماری ئوزبەكستانەوە جەنگیزخان ڕووخاندی دوایی تەیموری لەنگ داگیری كرد و كردی بەپایتەختی خۆی قەبرەكەشی لەوێیە.

(٦) (لەسەد ئاواز ئەخوێنێ) دەبێ (بەسەد ئاوازە خوێنێ) بخوێندرێتەوە شایانی باسە لە كەشكۆڵی (ا)دا (سەر ئاواز) نووسراوە.

(٧) كۆهكەن: كێو هەڵكەن، مەبەستی فەرهادە.

(٨) بەفەرهادێ: لە كەشكۆڵی (ا)دا (بەفەریادێ) نووسراوە.

## گرتوومە لە عالەم صەنەمێ*

گرتوومە لە عالەم صەنەمێ، لالە عوزارێ
شیرین خەت و خاڵی چ عەجەب دیدە خومارێ!(١)
سەد دولبەری چینی بەفیدای نیمە نیگاهی(٢)
سەد حوور و پەری بێ بەفیدای عیشوەیی جارێ
باری غەمی دڵ سەهلە بەتای پەرچەمی لاچێ
بیكا بەكەمەندی دڵی میحنەت زەدە بارێ(٣)
كاكۆڵی سیا لازمە بۆ گەردنی زیوین
گەنجێ كە ببێ لازمە بۆ حارسی، مارێ(٤)
مومكین نییە بێ ڕەنجی عەدوو گەنجی ویصاڵت
وەصڵی گوڵ ئەگەر بێ نییە، بێ ئافەتی خارێ(٥)
ڕیشەی دڵی هەڵكەندووە ڕیشووی ڕەشی مشكی
گەر هۆشی بە ڕیشوەت نەدەمێ زەحمەتە چارێ
كامی دڵ ئەگەر بێتو ڕەوابێ لە لەبی ئەو(٦)
تا ڕۆژی قیامەت لە لەبم شەككەر ئەبارێ
سەر كۆهی خەفەت كەوتووە (زێوەر) بەتەماشا
لەو كۆهی غەم و میحنەتە ئەو نایەتە خوارێ(٧)

.........................................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٨٧-١٨٨ی كەشكۆڵی (ا) و ل٤٩ی كەشكۆڵی (ب)دا هەیە لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە١٢٧، ل٨١دا بڵاو كراوەتەوە.

(١) صەنەم: بت، هەیکەلی پەرستراو. لالەعوزار: گۆنا سوور وەک گوڵی لالە. دیدە خومار: چاو مەست.

(٢) نیم: نیوە. نیگاه: بەتیلەی چاو لەلاوە سەیرکردن.

(٣) میحنەت زەدە: خەم و خەفەتبار. بارێ: جارێک.

(٤) کاکۆڵی سیا: زولفی ڕەش.

شاعیر نیوە دێری دووەمی کردووە بە (حسن التعلیل) بۆ نیوە دێری یەکەم. ئەوەتا دەڵێ: بۆیە زولفی ڕەشی لە دەوری گەردنی زیوینی ئاڵاوە چونکە ئەو گەردنە گەنجی زێڕ و زیوە گەنج و خەزینەش پێویستی بەحەرەس و چاودێریکەر هەیە، کەوا بوو زولفی وەکو ڕەشمار بووەتە حەرەس و نایەڵێ کەس دەستی بۆ بەری یان لێی نزیک بێتەوە.

(٥) ویصال: گەیشتن بەمراد. خار: چقڵ و دڕک. ئەگەر بێ: ئەگەر ببێ لە نێوان (بێ) و (بێ) جیناسی تەواو هەیە. لێرەشدا نیوە دێری دووەم بووەتە (حسن التعلیل) بۆ نیوە دێری یەکەم.

(٦) کام: ئارەزوو.

(٧) کۆهـ: کێو، کەژ. نیوە دێری دووەمی ئەم تاکە شیعرە لە (بەیان)دا بەم جۆرەیە:

(پێی خۆشە ئەگەر لەم غەمە بیهێننە خوارێ).

## نیگارا!*

نیـگـارا! تـۆ لە هـەر جـــــێـگـە دیـاری
لە ڕووتا گـوڵ ئەکـێـشی شـەرمـەسـاری
بە چاو نێرگس، بەدەم غـونچە، بەڕوو گوڵ
هەمـیـشـە صـاحـێـبی حـوسنی بەهاری
لە پەندی ئەهلی دانش گـوێم گـرانە(١)
کـە مـەنعم کـا لـە زاریی یا لە زاری(٢)
لە وەسـفی نـازکـیـتـا دەسـتـە ئەژنۆن
هـەزارێکی وەکـــــو نـالـیی و نـاری(٣)
نەهاتیـــــە کـــە وەعـــدت دا نەهاتی
سپی بوو، کوێر بوو چاوی ئینتیظاری(٤)
قـەسـەم بەو خـاکی بەرپێی تۆیە قـوربان!
بەشم هەر زیللەتە و هەر خـاکـــساری
ئەگـەر تۆ بێـیـتـە لام سـەر وا لە ڕێتـا
ئەگـــەر من بێم ئەکـــەم هۆشم بەدیاری
ئـەزانی، بـۆچ عـــــەزیزی تـۆ لەلای مـن
کـــە پەروەردەی هەوای نـاو شـــاخ و داری
کـە نەتبێ عـەشـقی باد و ئاب و خـاکت
لە لام هەر ناری گـــەردانەی هەناری(٥)

.........................................................

* ئەم شیعرە لە لاپەڕە ١٨٩-١٩٠ی کەشکۆڵی (أ) و لاپەڕە ٥٠ی کەشکۆڵی (ب)دا نووسراوەتەوە لە گۆڤاری (بەیان)ی





ژمارە ١٤٢، لاپەڕە ١٩دا بڵاوکراوەتەوە.

(١) ئەهلی دانش: خاوەن عەقڵ و زانست.

(٢) زاریی: گریان و هاوار. زاری: دەم. لەنێوان (زاریی) و (زاری) جیناسی چون یەک هەیە.

(٣) هەزار: ژمارەیەکی ئاشکرایە یا بەمانا بولبولە هەردوو ماناکان بۆ ئێرە دەگونجێن. نالی: مەلا خدری شارەزووری شاعیری گەورەی کورد و مامۆستای شیعری کلاسیکی بەشێوەی کرمانجی خواروو.

ناری: مـەلا کـاکـە حـەمـەی بێـڵـو. لە کـۆکـردنەوەی (هەزار)ی بەمـانا بولبـول لەگـەڵ وشـەی (نـالی) کـە لە نـاڵینەوە هاتبێ تەناسوبێکی جوان هەیە.

(٤) (نەهاتی) یەکـەم بەمـانا بێ شـانس و ئیـقبـاڵی، (نەهاتی) دووەم بەمـانا پێـچـەوانەی هاتن و حـازربوونە. لە نێـوان (نەهاتی) و (نەهاتی) جیناسی موڕەککەب هەیە. چونکە (نەهاتی) دووەم پێکهاتووە لە (نە) ئامرازی نەفی+(هاتی).

(٥) هەر ناری: هەر ئاگری لە نێوان (هەرناری) و (هەناری)دا جۆرە جیناسێکی جوان هەیە.

## کەوتمە داوی*

کـەوتمە داوی نیگـارێ، مـەهـ جـەبینێ، دولبـەرێ
ئیـخـتـیـارم لا نیـیـە گـەر دین و ئیـمـانم بەرێ(١)
سونبولی تەڕ ڕائیحەی کەی نەوعی زولفەینت ئەبێ
نافـەیی ئاهوویی چین باجـەکە ئەیخـاتە دەرێ(٢)
هەر سەحەر گـاهان ئیفاقـەی بێ زەمـانی دەردەکەم
لەش برینداری بەتیـغی دولبەرێ، قەد عـەرعەرێ(٣)
پێم بڵێ: بۆ حەلقە حەلقە پەرچەمت کەوتۆتە مل؟
خـۆ بەقـانوون و نیظام زنجـیـر لە گـەردن ناکـرێ(٤)
ئارەقی سـەر ڕوومـەتت ئابی حـەیاتە، زەمزەمـە(٥)
هەر کـەسێ نۆشی بکا تا ڕۆژی مـەحـشـەر نامـرێ
سـینە کـوورە، دڵ کـەباب و، باوەشـینی ناڵـەیە
ئاوی وەصـڵـی ئەو نـەبێ ئەم ئاگـرە دانـامـرێ(٦)
بۆ بەخـۆڕایی ئەتـۆ (زێوەر) ئەڵێی من مـوخلیـصم
کوا ڕەفـیـقێ؟ کـوا شـەفـیـقێ؟ تا جـەوابت بۆ بەرێ

.........................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٩٢ی کەشکۆڵی (أ)دا هەیە.

(١) نیگار: وێنە، خۆشەویست. مەهـ جەبین: ڕوخسار وەک مانگ.

(٢) سونبول: جۆرە گوڵێکی بۆنخۆشە لە گوڵدانا دەنێژرێ بۆ نەورۆز ئامادە دەکرێ زەنگوڵ زەنگوڵ شۆڕ دەبێتەوە. نافە: مووی بۆنخۆشی بن ناوکی ئاسکە.

(٣) سەحەر گاهان: بەرەبەیان.

(٤) مامۆستا (زێوەر) ئەم دێرە شیعرەی لە دێرە شیعرەکەی وەفایی دەچێ کە دەڵێ:

پێم: بلێ وەجهی چییه زولفت موقیمی ڕوومەته
خۆ بەشەرعی موصطەفا جەننەت بەکافر نادرێ

(٥) ئابی حەیات: ئاوی ژین. دەڵێن کانیاوێکه له تاریکیدایه هەر کەسێ بیدۆزێتەوه و لێی بخواتەوه تا ڕۆژی قیامەت نامرێ.

(٦) ئەم شیعرەی (زێوەر) له دێره شیعرێکی ناری دەکا که دەڵێ:

ڕوومەت وەکو ئاتەش موژەت وەک شیشه ئەبرۆت قیمەکێش
میروەحەت زولف و کەبابت جەرگی پارەی (ناری)یه

## له غەیره خاڵییه*

له غەیره خاڵییه مەجلیس نیگاری مەه جەبین بابێ
سوراحی گەردەنێ، چاوپیاڵه، یاری نازەنین بابێ(١)
له زاهید دڵ بەئازارم له سەیری سۆفی بێزارم
لەنێو دەیری موغانا موغبەچەی بێ دەئب و دین بابێ(٢)
به ناسۆر کەوتووه، زەخمی دڵم بەو زوڵفه موشکینه(٣)
به خەندەی لێوی شەککەر باری مەرهەم بۆ برین بابێ
له ڕێگای دیدەوه موڵکی دڵی خستۆته ژێر حوکمی
ئەمیری بەحر و بەڕ، سەرداری خووبانی زەمین بابێ(٤)
خەزانی فیرقەتی هاتوو گوڵستان مایەوه بێ گوڵ
له سینەی بولبولی بێ خان و مان ناڵەی حەزین بابێ(٥)
به ئەشکێ ئاڵ و زەرد و سووری من ڕەنگینه کاشانه
عەجائیب مێرغوزارێکه غەزالەی دەشتی چین بابێ(٦)

........................................................

* ئەم شیعره له ل١٨٨-١٨٩ی کەشکۆڵی (أ) و ل٤٩-٥٠)ی کەشکۆڵی (ب)دا نووسراوەتەوه.

(١) مەه جەبین: ڕوخسار وەک مانگ.

(٢) زاهید: ئەو کەسەی که بەڕواڵەت خۆ واپیشان دەدا که دنیای ناوێ. دەیر: کلیسا. موغبەچە: بەچکه مەلای زەردەشتی، بریتییه له شاگردی مەیخانه.

(٣) زوڵفی موشکین: زوڵفی بۆنخۆش وەکو بۆنی میشکی خەتا و خوتەن.

(٤) خووبانی زەمین: جوانانی دنیا.

(٥)خەزان: پاییز. فیرقەت: جودابوونەوه. خان و مان: جێگەو ڕێگه، ماڵ و مەڵبەند.

(٦) ئەشک: فرمێسک. کاشانه: خانووبەره و بەردەرگا. غەزالەی دەشتی چین: ئاسکۆڵەی دەشتی چین.

## با نەچێته لای ڕەقیبان*

با نەچێته لای ڕەقیبان یار ئەنیسی خانه بێ
لازمه ئەو ئاسکه لەو لا نەبێ، لەولا نەبێ





دیده وەختێ تۆی لەلا حازر نەبێ وا حەز ئەکا
بۆ نەظەر لەعل و دوری یەکتانەبێ، یەک تا نەبێ
عاریفی حەق بین چ باکی زینەت و ئارایشه
وای ئەوێ ناو شار و ناو دێ وا نەبێ، دێوانه بێ
دۆستی و خزمی نەماوه بۆ ڕەفیقی خۆی فەلاح
حەز ئەکا بەو شەرته گەر بێ گا نەبێ بێگانه بێ
هەر کەسێ بۆ تەرکی دلبەر دێ نەسیحەتمان ئەکا
ئەم دوعایەی لێ ئەکەم: یاخوا نەبێ، یا (خوانه) بێ
شەمعی ڕووته بۆته باعیث (زێوەر) ئێستا دائیما
گەر له خاتریا کەمێ پەروا، نەبێ، پەروانه بێ

........................................................

* ئەم شیعره له ل١٩٧ی کەشکۆڵی (أ) و ل٥٦ی کەشکۆڵی (ب)دا هەیه له گۆڤاری بەیانی ژماره ١٢٧، ل٩١یشدا چاپ کراوه.

شایانی باسه که شاعیر له سەرلەبەری دێری دووەمی شیعری ئەم قەصیدەدا جیناسی جوان جوانی بەکارهێناوه کەچی سنعەته لەفظییەکه و وشەسازییەکه هیچ کارێکی سەلبی نەکردۆته سەر ڕەوانی و نازکی شیعرەکه.

## بەئێشی نێشی...*

بەئێشی نێشی تیرت دڵ لەته، کەی بێ دەوایێ بێ؟
بەسەر چین چینی زولفی تۆ سەحەر بادی صەبایێ بێ(١)
پیادەی دڵ له سەطحی ڕێگه تا پێچ و پەنای ناوێ
به (ڕوخ) ماتی مەکه خەوفت لەحوکم و ئەمری (شا) یێ بێ(٢)
بەدوو چاو و دوو ئەبرۆ و خەتت و خاڵی شەشدەری لێم گرت(٣)
له بنیا داشی دڵ گڕژاوه، سا ڕەببی گوشایێ بێ
بەجان و دڵ، سەروماڵ، دین و ئیمان هاتمه کۆیی تۆ
بەڕەسمی دوشمنی لاوه، خودا تووشی بەلایێ بێ
لەدڵما زەهری هیجرانت بەسەد پیاڵەی شەراب ناڕوا
چ نەفعی بۆ منه موطریب بەسەد ساز و نەوایێ بێ؟
لەبەختی من دوو ئەبرۆت هەروەکو شمشێری بوڕڕانه
به من چی بۆ ڕەقیبان گەر وەکو باڵی هومایێ بێ
دەڵێ (زێوەر): هەتا ماوم له وەصڵت نائومێد نابم
ئومێدم هەر هەیه جارێ که تەئثیری دوعایێ بێ

........................................................

* ئەم شیعره له ژماره ١٢٧ی گۆڤاری بەیان وەرگیراوه.

(١) بادی صەبایێ: شنە بایەکی بەیانی.
(٢) پیادە، سەطح، ڕوخ، مات. شا: ئامرازی شەترەنجن، دیارە زێوەر یاری شەترەنجیشی زانیوە.
(٣) شەشدەر: زاراوەییێکی یاری کردنە بریتییە لەوە یەکێک لە یاری کەرەکان بەردەمی پۆلەکانی بەرامبەرەکەی گرتبێ و نەهێڵێ زارەکەی هەڵدا، هەروەها کینایەشە لە سەر لێشێواوی.

## شوعاعی شەمس*

شوعاعی شەمس و شەوقی شەمع و لەمعەی بەدر ئەبێ ون بێ[١]
لە جێگایێ کە ڕوخساری نیگاری دولبەری من بێ
بەدوو ڕەشماری سەرشانی دەڵێی ضەحاکی سەففاکە[٢]
لەقەتلی کەس قوصوور ناکا ئەگەر ئینس و ئەگەر جین بێ
ئەوا مەردم بەسم سا تیرە باران کە بەموژگانت
لەسەرتا بۆ بەخۆڕایی هەموو ئەخلاقی (بەهمەن) بێ[٣]
لە ڕێگای عەشقی تۆدا تووشی زیندان بم لەلام خۆشە
چییە باطالیعی سستی منیش وەک بەختی (بێژەن) بێ[٤]
هەتا عیشقم لەسەردا بێت و هیجرانم لە ڕێ دا بێ
لە کوللی ساعەتێکا هەر دەبێ چاوم لە مەردن بێ
کە چاوی مەست و خوێنڕێژی بەغەمزە مەیلی عاشق کا
دەبێ پیاڵەی شەرابی لەعلی ڕوممانیی سەر و بن بێ[٥]
ئەگەر (زێوەر) لە حوببی تۆ سەعاتێ قەلبی خاڵی بێ
ئیلاهی! ئەو دڵەی دەردەم نیشانەی تیری دوشمن بێ

.................................................................

* ئەم شیعرە لە ژمارە ١٢٧ی گۆڤاری بەیان وەرگیراوە.
(١) (بەدر ئەبی) دەبێ بە (بەدرە بێ) بخوێنرێتەوە.
(٢) ضەحاک: زوحاک. سەففاک: خوێنڕێژ.
(٣) بەهمەن: ئەردەشیری کوڕی ئەسفەندیاری کوڕی گۆشتاسیبە یەکێکە لە ناودارەکانی کۆنی ئێرانی.
(٤) بێژەن: کوڕی گیوە، کوڕە پاشا و بەناوبانگی ئێرانییە. عاشق و شەیدای مەنیژەی کچی ئەفراسیاب بووە، لە هەل و فرسەتێکدا ئەفراسیاب شەو لە ماڵی خۆیدا گرتوویەتی و زیندانی کردووە.
(٥) شەرابی لەعلی ڕوممانی: واتە شەرابی ڕەنگ سووری شێوە کاڵی وەک ڕەنگێکی کە پێک هاتبێ لە تێکەڵکردنی ڕەنگی لەعل و ڕەنگی هەنار.

## بەهاری*

بنوارە نەو بەهار و هەوای تەراوەتی[١]
نووساندی پێکەوە لەبی غونچە حەلاوەتی[٢]





هێنایە شەوق و زەمزەمە طەیرانی سەر زەمین[٣]
سەرما بڕایەوە هەموو توندی و صەلابەتی
هەورە برووسکە بۆتە سەقا ئاورشێن ئەکا[٤]
تا، سەبزە زاری ئەرزی موجەللا بێ صەفوەتی[٥]
ئەم عەردە مردووە هەموو ڕۆحی کرایە بەر
گۆڕاوە سەر بەسەر هەموو دنیا قیافەتی
بادی صەبا بەجیلوە قەدی گوڵبونی لەران[٦]
گوڵ زاری کردەوە کە بکا شوکری نیعمەتی

.................................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٩٢–١٩٣ی کەشکۆڵی (أ)دا هەیە لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ١٤٢ش بڵاو کراوەتەوە.
(١) تەراوەتی = طەڕاوەتی: تەڕوبڕی و شێداری.
(٢) لەب: لێو. حەلاوەتی: شیرینی.
(٣) زەمزەمە: گۆرانی و هەراوهۆریا. طەیران: باڵندە و پەلەوەر.
(٤) برووسکە کەشکۆڵی (أ) تریشقە: گۆڤاری (بەیان). سەقا: ئاودێر.
(٥) سەبزە زار: سەوزایی، بەشوێنێک دەوترێ گژوگیا و سەوزایی زۆری لێ بێ. موجەللا: پاک و بێ تۆز و گەرد.
(٦) بادی صەبا: شنەبای بەیانی. گوڵبون: دارگوڵ. بەڕاستی (زێوەر) لەم دێرە شیعرەی کۆتاییدا تابلۆیەکی جوان و مانایەکی ناسکی خستۆتە نێو ئەم وشانەوە. چونکە وەکو ئاشکرایە غونچەی گوڵ کاتێ با لێی دەدا دەپشکوێ وە ئەمە شتێکی سروشتییە بەڵام (زێوەر) هۆی پشکووتنەکە دەباتەوە بۆ شتێکی تر و دەڵێ غونچەکە با لێی دەدا بۆیە دەپشکوێ چونکە دەم دەکاتەوە سوپاسی بای صەبا بکا.

## وەک قەدەح چاوم*

وەک قەدەح چاوم لەسەر دەست دائەنێم نانووم شەوێ
شەست پەڕی ڕووت تا لە ناو باخی زەمانا سەرکەوێ
ئەنجوومی ڕووی زەمین مەحون بەنووری طەلعەتت[١]
وەک ستارەی ئاسمان مەحون شەفەق گەر دەرکەوێ[٢]
موتتەصیل تا صوبحدەم غەرقی خەیاڵی ڕوویی تۆم
عاجزە، تۆراوە لێم، خۆ هەر نزیکم ناکەوێ[٣]
عاشقان هەریەک لە پێشتر خۆ بەقوربانت ئەکەن
ڕەبی قوربان تێ کەوێ نۆبەم کە هەر بەرناکەوێ
گەرچی دەرمانە نیگاهت بۆ برینی نێو دڵان
طەبعی ناسازە دڵی من ئەم دەوای پێ ناکەوێ
کافر و ئیسلام موقابیل بوون لە شاری حوسنی تۆ
باعیثی چی بێ کە ئیسلام دەفعەیێ سەر ناکەوێ![٤]

(زێوەر)ی دڵ پڕ موصیبەت بەندە بۆ خزمەتگوزار
مەیکوژە ئێجگارەکی عەبدی وەهات دەس ناکەوێ

........................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٩١ی کەشکۆڵی (أ)دا هەبوو.

(١) ئەنجووم = أنجم: کۆی نەجمە، واتە: ئەستێرەکان. طەلعەتت: ڕوخسارت.

(٢) ستارە: ئەستێرە. شەفەق: ڕووناکی پێش هەتاو کەوتنە.

(٣) صوبحدەم: دەمەوبەیانی.

(٤) مەبەستی بەکافر زولفەکانی یارە. چونکە زولف ڕەشە، شاعیران وشەی کافریان کردووە بەکینایە بۆی. هەروەها وشەی ئیسلامیشیان کردووە بەکینایە بۆ ڕوخسار.

جا لێرەدا شاعیر دەڵێ: زولفی ڕەش و ڕوخساری پرشنگدار لە شاری حوسن و جوانیت دا کۆبوونەوە و بەرامبەر یەک وەستاون بەڵام هەموو دەم زولفەکانت زاڵن و سەرکەوتوون تێ ناگەم بۆچی جارێک ڕوخسارت سەر ناکەوێ و زولفت لاناچێ؟!!!

(وەفایی)یش لەم بارەوە گوتوویەتی:

پێم بڵێ وەجهی چییە زولفت موقیمی ڕوومەتە؟
خۆ بە شەرعی موصطەفا جەننەت بەکافر نادرێ

## حەکیمی دەردی من*

حەکیمی دەردی من ئەو چاوەیە قەت دوختەرم ناوێ(١)
لە ڕێگای عەشقی تۆدا گوم ببم یەک ڕەهبەرم ناوێ
تەماشای زولفی ئاڵۆزاو و سەرمینایی گەردن کەم
لە صەحنی گوڵشەنا هیچ سەیری عوود و عەنبەرم ناوێ(٢)
سەعاتێ هەم نشینی تۆ ببم ئەقصای ئامالە(٣)
ئیتر حوور و قوصوور و لەحمی طەیر و کەوثەرم ناوێ
بە وەعظی واعیظ ئەمرۆ چونکە عالەم حاڵی گۆڕاوە(٤)
هەتا مشکیی عەلیخانی بوەستێ مێزەرم ناوێ(٥)
ئەگەر دوو سێوەی زیوینی لە باخی سینەدا دەرخا
هەتاکو ڕۆژی مردن شەرتە تەختی سەنجەرم ناوێ(٦)
ئەسیری حوسنی تۆم، ئازادی تەعنەی عالەمم بیللا
لە باتی خاکی بەر دەرگانەکەت سیم و زەڕم ناوێ
تەقەی دەف، حەلقەی دەروێش، ئەڵێی نانێکی بێ خوێیە
کە نووری مەعریفەت گوم کەم چراغی ئەختەرم ناوێ(٧)
لەڕێی طۆفانی زیللەتدا حەیاتی عارییەت مەرگە(٨)
لەگەڵ بێ حورمەتیدا بارەگاهی قەیسەرم ناوێ

........................................................

* ئەم شیعرە لەژێر عینوانی (زێوەر ئەڵێت)دا لە گۆڤاری گەلاوێژی ژمارە ٦ی ساڵی ٩ی ١٩٤٨ز بڵاو کراوەتەوە، لە





کەشکۆڵی (ب) ل٥٦-٥٧دا نووسراوەتەوە و (محەمەد عەلی قەرەداغ)یش لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ١٤٢ ل٢٠ جارێکی کە بڵاوی کردۆتەوە. لە ل١٩٨ی کەشکۆڵی (أ)یش نووسراوەتەوە.

(١) دوختەرم (گەلاوێژ) دوکتەرم (کەشکۆڵ و بەیان)

(٢) صەحنی گوڵشەن: مەبەستی ناو باغ و گوڵزارە.

(٣) ئەقصای ئامالە: ئەوپەڕی ئاواتە.

(٤) بەوەعضی واعیظ (گەلاوێژ) لە وەعظی واعیظ (کەشکۆڵ و بەیان).

(٥) مشکی و عەلیخانی: دوو جۆرە شەدەن. لە کەشکۆڵ و بەیاندا نووسراوە (مشکیی عەلی خانی...) واتە شەدەی عەلی خانی.

(٦) سەنجەر: دەبێ مەبەستی سەنجەری کوڕی عەبدوڵڵا جاولی بێ کە لە دیاربەکر لە ٦٥٣ک ١٢٥٥ز. لە دایک بووە، بووەتە یەکێک لە بڕوا پێکراوانی (ظاهر بیبرس) میسری، دوایی بووەتە والی و لێپرسراوی وڵاتی غەززە، ئەمیرێکی عادل و خێرخواز و زانست پەروەر بووە ساڵی ٧٤٥ک ١٣٤٥ز لە قاهیرە لە دنیا دەرچووە. النجوم الزاهرة بەرگی ١٠٩/١٠.

(٧) چراغی ئەختەر: چرای وەکو ئەستێرە ڕووناک.

(٨) حەیاتی عارییەت: واتە ژیانی بەئەمانەت و بەردەوام نەبوو.

## ئەو دولبەرە*

ئەو دولبەرە نەوڕەستە کە ڕەنگی بنوێنێ
ڕەنگە لە فەلەک جەمعی مەلائیک بنوێنێ(١)
تیغی خەمی ئەبرۆی ئەگەر بێتە بزووتن
زنجیری ئەمەل، ڕشتەی ئیمان ئەپسێنێ
هەر لەحزە بەشوعلە و ڕوخی گوڵ ئاتەشیی خۆی
لەم (بۆتە)ی سینە مسی قەلبم ئەتوێنێ(٢)
بونیادی خەیاڵم کە ئەشوبها بەدەماوەند
هەر لەحزە بەتیرێکی موژەی دای ئەڕووخێنێ(٣)
وا صوورەتی وا سیرەتی هەر عەینی کەمالە
جار جارە بەشەرمێکەوە عاشق ئەدوێنێ(٤)
خەرمانی وجوودی بەخوا دوورە لە ئافات
هەر کەس لە دڵا توخمی وەفای ئەو بڕوێنێ
ئیعجازی مەسیحا لە لەبی پڕ شەکەرایە
سەد موردە ئەکا زیندە و زیندە ئەمرێنێ(٥)
ڕوخت کە بەهای عیشوە و نازی ئەوە (زێوەر)
لەو کافرە خۆت لادە کە دینت ئەفڕێنێ

........................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٩٠-١٩١ی کەشکۆڵی (أ)دا هەبوو.

(١) (بنوێنێ)ی یەکەم واتە ڕای بنوێنێ بەدەری خا، (بنوێنێ)ی دووەم واتە خەوی لێ بخا بیان خەوێنێ. لە نێوان هەردوو وشەی (بنوێنێ)دا جیناسی تەواو هەیە.

(٢) لەحزە = لەحظە: کات. شوعلە: تیشک. گوڵ ئاتەشی: گوڵی وەک ئاگر سوور.

بۆتە: فنجانێکی گڵێنەی سوور کراوەیە زێڕی تێدا دەتوێننەوە، ئەم وشە کوردییەکی پەتییە عەرەب وەریان گرتووە و کردوویانە بە (بودقە).

(٣) بونیاد: بناغە.

دەماوەند: بەرزترین لووتکەی کێوی ئەلبورزە لە ئێران ٦٣٠٠ مەتر بەرزە، یەکەم کەس گەیشتۆتە لووتکەکەی لە ئەورووپایی (ئولیڤیە) بووە. دەماوەند: لووتکەی کێوی ئەلبورزە کە کەوتۆتە کەناری دەریای خەزەر، لەلای جنووبییەوە بڵندی شەش هەزار مەترە و بڵندترین چیاکانی ئێرانە (ن.م).

(٤) صوورەت: شێوە و سەروسەکوت. سیرەت: ژینامە و هەڵسوکەوتی ڕۆژانە.

(٥) ئیعجاز: موعجیزە، کردنی کارێکی نائاسایی لە عادەت بەدەر لەگەڵ داوای پێغەمبەریەتیدا. موردە: مردوو. ئاماژەیە بۆ چیرۆکی حەزرەتی عیسا کە بەدوعا و پاڕانەوە لە خوا مردووی زیندوو کردۆتەوە و مردوو زیندووکردنەوە یەکێک بووە لە موعجیزەکانی.

## چاوت شەهەنشەهێکە*

چاوت شەهەنشەهێکە، ئەبرۆت وەکو وەزیری
بۆ قەتلی عاشقانت موختاریی و ئەمیری
بەتیغی ناز و حوسنی جانم شکافتەیی بوو
جەرگم بووە نیشانەی هوجوومی دەستە تیری
دەستە و نەزەر ئەوەستن تابووری عاشقانت
موشتاقی حوکم و ئەمرن لە نوطقی وەک موشیری
ئەم دەردی عەشقە هەرگا ڕێگەی بەجێگەیێ برد
مردن نەبێ کە لای با! ناڕوا بەدەردی پیری
هەرگیز لە دەردی عەشقی (زێوەر)! نەکەی شکایەت
ئێستا تەقەڕڕوبت بوو بەواسیطەی ئەسیری

.................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٩٦-١٩٧ی کەشکۆڵی (أ) و ل٥٥ی کەشکۆڵی (ب)دا هەیە، لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ١٤٢، ل١٩دا بڵاو کراوەتەوە.

## یارێکی دڵ ئازار دەر*

یارێکی دڵ ئازاردەری شۆخێکی بەکینی
ئافاتی دڵی عالەم و ئاشووبی زەمینی
من تابی هوجوومی صەفی موژگانی ئەتۆم کوا؟
دایم بەکەمانی خەمی ئەبرۆ لە کەمینی[١]





تۆ هەر نەوەکو دوزدی مەتاعی خیرەدی و هۆش
سەرقافڵەی جەردەیی بارخانەی دینی[٢]
وێنەت ئەکەم و نایکەم و دەیڵێیم و دەناڵم
تۆ یا پەریی بێ پەڕی یا ئاهویی چینی[٣]
مەقصوودی و مەرغووبی و مەحبووبی قولووبی
شیرینی و ڕەنگینی و خەندە نمەکینی[٤]
هێند خەندەی ئابدار و لەطیفە بەتەراوەت
خەوفم هەیە بتوێتەوە لێوی شەکەرینی
شامی غەمی هیجر و ئەلەمم دێتە نیهایەت
گەر دەربکەوێ ڕووی شەفەق و صوبحی جەبینی[٥]
گەر (ڕافضی) و (شیمە)و گەر (گەبر) و (یەهوودە)
هەرچی هەیە وەڵڵاهی منم تابیعی دینی!!
موددێکە کە دووربووم و جەفا دیدەو و ڕەنجوور
نەت پرسی: کە کوا (زێوەر)و ئەشعاری مەتینی؟[٦]

.................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٩٤ی کەشکۆڵی (أ) و ل٥٣ی کەشکۆڵی (ب) نووسراوەتەوە لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە (١٢٧، ل٨٧)یشدا بڵاو کراوەتەوە.

(١) تاب: هێز و توانا، تین و تاقەت. خەم: چەمیو، لوول.

(٢) دوزد: دز. مەتاعی خیرەد: کاڵای عەقڵ.

(٣) ئاهوو: ئاسک. چین: وڵاتی چین کە بەئاسک ناوبانگی لەشیعردا زۆرە.

(٤) مەقصوود: مەبەست. مەرغووب: دڵگیر. مەحبووب: خۆشەویست. نمەکین: خوێ واوی، کینایە لە خۆشی و بەتامی.

(٥) شام: ئێوارە. غەمی هیجر و ئەلەم: خەفەتی دووری و ئازار. شەفەق: پاشماوەی ڕووناکی خۆر و سوورایەتی لە سەرەتای شەودا واتە ئەو سوراییيە دەبینرێ لە نێوان نوێژی شێوان و خەوتناندا لە ڕۆژئاوا. صوبحی جەبین: واتە ناو چاوانێک کە وەکو ڕووناکی بەیانی دنیا ڕووناک دەکاتەوە.

(٦) ئەشعاری مەتین: شیعری بەهێز و ڕەوان و ئەفسووناویی.

## بەقامەت*

بەقامەت سەروی بۆستانی بەطەلعەت ماهی تابانی
لە بەینی ماه ڕوویانا وەکو بەدری نومایانی[١]
لە پێشا مەدرەسە و، دیر و خەراباتم لە لایەک بوو
دوو میحرابی برۆت کێشامییە دینی موسڵمانی[٢]
لەحوزنا پیری کەنعانم، عەجەب صەبری جەمیلم بوو!
بەدڵ موشتاقی بۆی وەصڵم ئەلا ئەی یوسفی ثانی![٣]

بەدەفعی سیحری چاوانت یەدی بەیضام هەیە ئەمما
لە ئەشکی خۆمەدا غەرقم بەسەیری رووی تابانی[٤]
بەشەر مەیلی بەشەڕ زۆرە جەفات گەر کەم ئەبوو ئەم وت
لە بەینی عالەمی رۆحانیان مەئمووری رەحمانی[٥]
بەڵێ رۆژی بەعیدی تۆ بە، عیدی غەیر ئەشوبهێنم
حەنایی پەنجەی و بەرگم لە سایەی ئەشکی رومانی[٦]
چ حاجەت تیری موژگانی لە من دا صەرف ئەکا ناحەق
کە من بۆ خۆم گرفتارم بەتای زولفی پەرێشانی؟
کەلامی شەککەرین (زێوەر) وەکو ئیعجازێ ئەنوێنێ
قەمەر دوو کەرت ئەکا هەر گا کە مەیلی بێ بەئاسانی

.........................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٩٥ی کەشکۆڵی (أ) و (٥٤)ی کەشکۆڵی (ب)دا هەیە، لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە (١٢٧، ل٨٦)یشدا بڵاو کراوەتەوە.

(١) ماهی تابان: مانگی تیشک دەرەوە و ڕووناکی. ماه ڕوویان: ئەوانەی ڕوخساریان وەکو مانگ جوانە. بەدر: مانگی شەوی چوارە.

(٢) مەدرەسە: فێرگە و حوجرە. دەیر: کلیسا. خەرابات: وێرانە و کاول.

(٣) بۆی وەصڵم (کەشکۆڵی أ) کۆی وصڵم (سەرچاوەکانی تر).

پیری کەنعان: حەزرەتی یەعقووب پێغەمبەر باوکی حەزرەتی یوسف کە بەهۆی لێ ونبوونی یوسفەوە تووشی ئەو هەموو خەفەتە بوو تەنانەت لە تاوانا چاویشی کوێر بوو. صەبری جەمیل: ئەوەیە مرۆڤ کە تووشی بەڵا و موصیبەت بوو هاوار و فغان نەکا ئیشی خۆی حەواڵەی خوا بکا. ئاماژەشە بۆ قسەی یەعقووب کە لەو کاتەدا پێیان گوت کە کوڕە پچکۆڵەشی لە میسر گیراوە وتی:« قال بل سولت لكم أنفسكم أمراً فصبر جميل عسى الله أن يأتيني بهم جميعاً انه هو العليم الحكيم» «سورەتی یوسف ٨٣». بۆی وەصڵم: بۆنی بەیەک گەیشتن. ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە حەزرەتی یوسف لە میسرەوە کراسەکەی بۆ باوکی ناردەوە هەر لەگەڵ کاروانەکە لە شار دەرچوو یەعقووب وتی: «اني لأجد ريح يوسف لولا أن تفندّون» «یوسف ٩٤» واتە من بۆنی یوسف دەکەم ئەگەر پێم نەڵێن: شێت بووە و خەرەفاوە.

(٤) لەم دێرە شیعرەدا (زێوەر) ئیشارەتی کردووە بۆ سیحری جادووگەرانی فیرعەون و بۆ موعجیزەی حەزرەتی موسا کە دەستی لە باخەڵی خۆی دەردێنا وەکو چرا ڕووناکی دەدا وە بۆ خنکانی فیرعەون و کۆمەڵەکەی لە دەریادا.

(٥) لە نێوان (بەشەر) و (بە شەڕ)دا جیناسی تەرکیب هەیە.

(٦) بەعید: دوور. عید: جەژن. حەنا: خەنە. ئەشکی ڕوممانی: فرمێسکی ئاڵ وەک ڕەنگی هەنار. لە نێوان (بەعید) و (بە عید)دا جیناسی تەرکیب هەیە.

## مووچەم غەمە*

مووچەم غەمە ئەمساڵ لە جەزای خزمەتی جانی
مایەم دوڕی ئەشکە لە بەهای لەعلی لەبانی[١]



قومری صیفەتم نالە کونان شام و سەحەرگاه
تا دوورە لە من قامەتی وەک سەروی ڕەوانی[٢]
وا بەستەی یەک بوون و حەریفی شەو و ڕۆژن
زولفی لە ڕوخا، ڕوخ لە دڵا، دڵ لە میانی
کەس باعیثی قەتڵم نییە لەم عالەمە ئیللا
چاوی ڕەشی، تیری موژەی، ئەبرۆی کەمانی
ڕوخسار و دوو ئەبرۆی و لەبی غونچە میثالی
وەک شەمعی شەو و ماهی نەو و لەعلی یەمانی[٣]
باوەڕ بکە هەرچی کە بڵێم، شەرحی فیراقت
ڕەنگ زەرد و نەفەس ماندە وەکو شەمعی بەیانی[٤]
تەصدیقی غەمی (زێوەر)ی بێ چارە کە ناکەی
جارێ وەرە خۆت بگرە بەئەحوالی ئەزانی

.........................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٩٥-١٩٦ی کەشکۆڵی (أ) و ل٥٥ی کەشکۆڵی (ب)دا نووسراوەتەوە، لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ١٤٢، ل١٩-٢٠دا بڵاو کراوەتەوە.

(١) دوڕی ئەشک: فرمێسکی وەکو مرواری. لەعل: بەردێکی سووری گرانبەهایە. لێرە مەبەستی لێوی سوورە. لەعلی لەبان: لێوی سوور وەکو لەعل.

(٢) قومری: باڵدارێکی خاکییە لە کۆتر پچووکترە. نالە کونان: ناڵەکەران. شام: ئێوارە. سەحەر گاه: بەرەبەیان.

(٣) دوو ئەبرۆی و (کەشکۆڵی أ) - دو ئەبروو (گۆڤاری بەیان). شەمع: چرا. ماهی نەو: مانگی یەکشەوە، مانگی تازە. (زێوەر) لەم دێرە شیعرەدا (لەفف و نەشری مورەتتەب)ی بەکارهێناوە ئەوە لە نیوە دێری یەکەمدا سێ شتی ڕیز کردووە، (ڕوخسار، ئەبرۆ، لێو) لەنیوە دێری دووەمدا بەرامبەر (ڕوخسار) شەمعی داناوە لە بەرامبەر (ئەبرۆ) ماهی نەوی داناوە، لە بەرامبەر (لەب) لەعلی داناوە.

(٤) شەمعی بەیانی: چرای بەیانی. شەمعی بەیانی کە بەڕەنگ زەرد و زەعیف دێتە بەرچاو یا لەبەر ئەوەیە کە چراکە چونکە بەدرێژایی شەو سووتاوە دەمەو بەیان نەوتی تێدا نامێنێ و بەرەو کزی دەڕوا یا لەبەر ئەوەی شۆقی خۆر ڕووناکی چراکە ناهێڵێ و بەزەرد و زەعیف دێتە بەرچاو.





## ئەی کوردینە

گۆرانی لەسەر کێشی* (أنقرەنک داشنەباق)

ئەی کـــــوردینە ئەی مـــــەردینـە
با دەست لەناو دەست کـــەین هەمـــوو
بـۆ بـەرزیـــــەتـی خـــــاکـی وەتـەن
بۆ یەکیـەتی بچین هەمـوو کوردین هەمـوو
بێ کـــەس نیـــــــە دایـکی وەتەن
ئێــــمـــە فـــیـــــداکــــاری ئەوین
تا کـــــورد لە عــــالـەم دەرکـــــەوێ
بۆ یەکیـەتی بچین هەمـوو کوردین هەمـوو
ئەجـــدادمــــان شـــێــــری زەمـــان
حـورِ بـوون و سـەربەسـتی جـیـــهـان
باکـمـــان نیـیـــە ئێـــمـــەیش لەکـەس
بۆ یەکیـەتی بچین هەمـوو کوردین هەمـوو

..........................................................

* ئەم شیعرە لە ل١١٠ی سۆزی نیشمان وەرگیراوە لە پەراوێزدا نووسراوە کە (هەر نیوە شیعرێکی ئەم گۆرانییە دوو جار ئەوترێ).
هەروەها لە ژمارەی (١)ی گۆڤاری گەلاوێژی ساڵی (١٠)ی ١٩٤٩دا لەگەڵ ژینامە و لێکۆڵینەوەیەکدا بڵاو کراوەتەوە.

## گۆرانیی هیوا*

تا دەست لەمل هیوا نەکەم شەرتە نەنیشم قەت بەتاڵ(١)
بۆ لاوی تازەی قـەومی کـورد ببـمـە نموونەی بێ مـیـثـال
تا دەست لەمل هیوا نەکەم شەرتە نەنیشم قەت بەتاڵ
بۆتە شـیـعـار و کـردەوەم سـەربەسـتی و ئازادیی وەتەن
لەم ڕێـگـوزاریش بم زەبـوون، نـابـیـنم ئاثـاری مــــەلال
تا دەست لەمل هیوا نەکەم شەرتە نەنیشم قەت بەتاڵ
هەوڵ و کـۆشـشم لازمـە، بۆ خـزمـەتی هـاو مـیللەتم(٢)
ڕۆحێ لە ڕێگای مـیللەتا، نەبیـەخـشم ئەینێـمـە چاڵ
تا دەست لەمل هیـوا نەکـەم شەرتە نەنیشم قـەت بەتاڵ
بۆ لاوی تازەی قـەومی کـورد ببـمـە نموونەی بێ مـیـثـال

..........................................................

* ئەم شیعرە بەناوونیشانی سەرەوە لە ژمارە (٢)ی گەلاوێژی ساڵی (٥)ی ١٩٤٦ی ز بڵاوکراوەتەوە لە پێشەوەی نووسراوە:





«ئەم گۆرانییە هی زێوەرە و ڕەفیق چالاک بەمەقامێکی تایبەتی ئاوازی بۆ داناوە کە لەسەری ئەوترێ». لە کتێبی «سۆزی نیشتمان»دا ل١١٩ چاپ کراوە ئەم عینوانەشی بۆ دانراوە (گۆرانی لەسەر کێشی: هیابنا نحو الأمام). ئێمە دەقی گەلاوێژەکەمان بەلاوە وێچووتربوو، ئەومان چەسپاند.
(١) هیوا (گەلاوێژ) مەقسەد (سۆزی نیشتمان)
(٢) هەوڵ و کۆششم (گەلاوێژ) سەعی و تەلاشم (سۆزی نیشتمان)

## گۆرانیی لەسەر کێشی

(ئەی وەتەن ئەی ام مشفق شاد و خەندان أول بوگون)(١)

وا وەتەن خـەمـڵـیـوە وەک گـوڵ نەوبەهاری مـیللەتە
شـادمـانی قـەومی کـوردە وەخـتی لوتف و ڕەحـمـەتە
زەرڕەیێک خـاکی وەتەن نادەم بەقـەسـری قـەیسـەری
جـوملە ئەنهـاری وەکـو کـەوسـەر هەوای وەک جـەننەتە
میللەتی کورد مولکی سەربەستیشی خستە دەستی خۆی
جان نیـسـاری گەر نەکـا هەر کـەس، بەشی ئەو لەعنەتە

..........................................................

(١) سۆزی نیشتمان ل١١٣.

## گۆرانی

لەسەر کێشی: ببلادي اتباهی لیتني کنت فداها*

فـەخـرە بۆ ئێـمـە کـوردسـتـان
شاخ و دەشتی وەک گوڵستان
مـەعدەنە بۆ عـیلم و عـیرفـان
بێـشـەیە بۆ شـێـر و مـەردان
جـان نیـسـارین فـیـداکـارین
بەچە شێری وەتەنین
ئێـمـە شـوورای وەتەنمانین
قـەڵای وەتەن و دینمـانین
هەمـوو کـوردین یەک زمـانین
سـەنگەری ڕووی دوشـمنانین
جـان نیـسـارین فـیـداکـارین
بەچە شێری وەتەنین
مـیللەتی ساحـێب مـەتانەت

به سوباته و بەئیرادەت
له ڕێی وەتەندا شەهادەت
بۆ ئێمە فەخره و سەعادەت
جان نیسارین فیداکارین
بەچه شێری وەتەنین
چەنده ڕەنگینه ولاتم
خەزێنەی ڕزق و بەراتم
زیکرمه تاکو مەماتم
بەفیدای بێ سەد حەیاتم
جان نیسارین فیداکارین
بەچه شیری وەتەنین

........................................................................

* ئەم شیعره له ل١١٤-١١٥ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوه.

## گۆرانیی نیشتمانی*

ئەی وەتەن! چەند خۆشەویستی ڕۆحی شیرینی منی
مەزرەعەی توخمی نیشات و باعیسی ژینی منی
بێتو گەر من کۆهکەن بم وەصڵی شیرینم ببێ[1]
تیشەیێ نادەم لەبەردت تۆی کە شیرینی منی[2]
گەرچی ئەرزی، هێند بڵندی وەختە لای من بچیه عەرش[3]
واسیتەی سەربەستیی و ئیجرایی ئایینی منی
ئیفتیخاری میللەتی، تۆی مادەرێکی میهرەبان[4]
خوا هیلالیشی بەتۆ دا ماه و پەروینی منی[5]
نەو بەهاران بەو هەوای زۆر سافەوە وەک جەننەتی
فەسڵی زستانیش سەراسەر باخی نەسرینی منی
بۆچی نەقدی جیسم و جانی خۆم بەشاباشت نەکەم[6]
خاکی ڕاهی حوکمڕانی عیزز و تەمکینی منی[7]
ئارەزووی فیکری سیاحەت ناکەم ئیتر ئەی وەتەن!
تۆ لە جێگەی (قاهیرە) و (تاران) و (بەرلینی) منی

........................................................................

* مامۆستا زێوەر ئەم شیعرەی ساڵی ١٩٢٢ی ز گوتووه، له ژماره (٩)ی ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان) ساڵی (١) ١٩٢٢ی ز بڵاو کراوەتەوه. له گۆڤاری گەلاوێژ ژماره (٧)ی ساڵی (١٠)ی ١٩٤٩دا بڵاو کراوەتەوه. له ل١٤ی سۆزی نیشتمانیشدا چاپ کراوه.





(١) کۆهکەن: کێو هەڵکەن، ئاماژەشه بۆ فەرهاد.
(٢) تیشه: تەشوێ، پاچ.
(٣) واته ئەی وەتەن! هەرچەنده ئەرز و خاک و خۆڵی و له ژێر پێ دای بەڵام لای من ئەوەنده بەرز و خاوەن شان و شکۆی وەخته بگەیته عەرشی کردگار.
(٤) مادەر: دایک. میهرەبان: دڵ نەرم و بەبەزەیی.
(٥) ماه: مانگ. پەروین: کۆمەڵه ئەستێرەی کۆ.
(٦) واته: وەکو چۆن پاره دەبەخشرێتەوه و دەکرێ بەشاباش، ئەی بۆ منیش جیسم و بەدەن و ڕوحم نەکەم بەشاباشی تۆ؟
(٧) خاکی ڕاهیی: خاکی ڕێگەی.

## گۆرانیی وەتەنی من کوردستانه

لەسەر کێشی (طونه نەهری)*

وەتەنی من کوردستانه، یادگاری ئەجدادمانه
بەهەشتی ڕووی سەرزەمینه، خاکی پاکی کوردستانه
با هەموومان وەک برا بین ڕەفیقی دین و دنیا بین
با له وەحشەت تەوەللابین نۆبەتی عیلم و عیرفانه
کورد میللەتێکی ناسراوه، له مەعاریف بەجێ ماوه
ڕۆژی سەعی و تێکۆشینه، بۆ ئەو کەسەی کورد زمانه
کورد میللەتێکی قەدیمه، ساحێبی تەبعی سەلیمه
شاهیدی ئەم موددەعایه، (صلاح الدین)ی سوڵتانه

........................................................................

* ئەم سرووده له ل١١٨-١١٩ی سۆزی نیشتماند چاپ کراوه.

## گۆرانی کوردستان وەتەنمانه

لەسەر کێشی (شاشیردی گیر دوشمن ارسلان یاتاغنه)*

کوردستان وەتەنمانه جێگای شێری بابانه
جێگای ئابا و ئەجداد و هەم جێگانەی شێرانه
هەر بژی ئەم وەتەنەمان
بۆ وەتەن جانفیدا بین وا خۆشه تیا فەنا بین
له ڕێی ئەتۆ ئەی چاومان یەکه یەکه قوربانی تۆ بین
بەره بەره حەیرانی تۆ بین
شاخ و دەشتی کوردستان وەک جەننەت وەهایه
گشتی دەشتی وەک سەحرای ماچین و خەتایه
هەر بژی ئەم وڵاتەمان

هێلانەی حەیاتمان، ئاشیانەی سەعادەتمان
بانگ ئەکەین بۆ وەتەنمان یەکە یەکە قوربانی تۆ بین
دەستە دەستە حەیرانی تۆ بین
بەعیلم و مەعریفەت ئاوابێ سلێمانی
هەموو شاری کوردان سنە و سابلاخ و وانی
نوورانی و جوانی بێ وەتەن
وەتەنەکەی کوردان! جێگای شێر و مەردان
لە ڕێی ئەتۆ ئەی چاومان یەکە یەکە قوربانی تۆ بین
بەرە بەرە حەیرانی تۆ بین

.........................................................

* ئەم سرووده له ل١١١-١١٢ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوه.

## گۆرانیی بولبول بە نەغمە

لەسەر کێشی (قافقاسیا داغلری چیچکلر ئاچار)*
له شیعری (سمعت شعرا للعندلیب) وەرگیراوه

بولبول بەنەغمەی دڵکێش و خۆشی
گولزاری پڕ کرد دەنگ و خرۆشی
بانگی کرد خەڵقە سەربەست خوڵقاوم
لەم باخ و دەشتە ڕووناکە چاوم
بەشەوق و خۆشی لەم گوڵ بۆ ئەو گوڵ
بە هەوەس ئەچم لەم چڵ بۆ ئەو چڵ
لەناو درەختا ئەکەم هێلانە
سەرم سێبەرە و فەرشم گوڵانە
کە بای سەحەری ئەشنێتەوە
لقی گوڵەکان ئەلەرێتەوە
چەندم پێ خۆشە نەغمەی ئازادی
بۆ خۆم ئەخوێنم بەشەوق و شادی
ئەگەر حەز ئەکەن دڵشادم بکەن
لە بەندی قەفەز ئازادم بکەن
گەر لاتان خۆشە ئەمن بدوێنن
بەرەڵڵام بکەن وازم لێ بێنن!!

.........................................................

ئەم سرووده له ل١١٩-١٢٠ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوه.





## گۆرانیی بۆ قوتابیان*

لەسەر کێشی گۆرانییەکی فارسی (ماکه اطفال اين دبيستانيم)

ئێمە کە منداڵ و نەو جوانین
هەموو بەقوربانی کوردستانین
چونکە حوببی وەتەن لە ئیمانە
بە مەحەببەتە ساحێب ئیمانین
سا ئەی ڕەفیقان لە ڕێی وەتەندا
زۆر تێ نەکۆشین زۆر بێ ویجدانین
چونکە وەتەنمان کە وەک بەهەشتە
ئێمەیش لە ناویا وەکو غیلمانین
هەر بەهەواکەی کوردستان ئەژین
لەم باغەدا بولبولی خۆش خوانین

.........................................................

* ئەم شیعره له ل١٠٩-١١٠ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوه.

## گۆرانی لەسەر کێشی

تیشیتردی شووطنه یوللادی ئاننەم بنی*

ئەساسی ئەم مەدرەسەیە ئینشائەڵڵا مەسەڕڕەتە
بۆ ئەم وەتەنە وێرانە بۆ ئەم قەومە بەدبەختە
وەتەن موحتاجی ئێمەیە ئێمەیش موحتاجی علووم
حەیفە هەروا بێ سەمەر بێ ئەم باخ و ئەم جەننەتە
لە پەنای عیلم و مەعاریف ئێمە ئەکەین ڕەجایێ
وەک میللەتانی سەر زەمین سەربەرز بێ ئەم میللەتە
خار و خاشاکی کوردستان نایدەم بەموڵکی جیهان
ڕەببی دەرنەچێ لە دەستمان جێی سونبول و گوڵزاران
ئەی شاگردانی مەدرەسە، ڕاحەتی ئیتر بەسە
ڕۆژی غیرەت هەوەسە بێینە ڕیزی شاران

.........................................................

* سۆزی نیشتمان ل١١٨.

## گۆرانیی شاگرد*

زەمانی تیفلیی تێپەڕ بوو سەلامەت
لەجێی هات وەختی سەعیی زۆر بەقیمەت

بەڵێ حەوت ساڵەگیم ڕابوورد و ڕۆیی
گەیشتمە ڕیزی لاوانی بەهیممەت
لە ڕێگای خوێندنا وا تێدەکۆشم
کە بچمە مەرتەبەی ژوورووی زەعامەت
بەسەعیی من دڵی خۆشە موعەللیم
ئەپۆشم بەرگی ئەربابی کەرامەت
لە دەرسا هۆش و گۆش حازر ئەکەم بۆی
هەتاکو تێ بگەم دەرسم تەمامەت
کە جوابێکم بڵێم وەختێ دەپرسێ
ڕەزا بوونی (تەبەسسوم)یە عەلامەت!(١)

* ئەم هەڵبەستە سروود ئامێزە لە لاپەڕە ٨٨ی کتێبی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.
(١) تەبەسسوم: زەردەخەنە

## گۆرانی

لەسەر کێشی (روم ایلنیک داغلری وار)*

ئەی شاگردانی وەتەن ڕۆژی فەزڵ و هونەرە
لەم وەخت و لەم زەمانەدا دانیشتنمان زەرەرە
نەو نەمامی ناو وەتەنین زیندەگیمان بۆ چییە
بێ شەوقی عیلم و مەعاریف جوولانمان بێ سەمەرە
دەس لە مل یەکتری کەین باوەک برا بین هەموو
چاوی لە دەستی ئێمەیە ئەم دایکە قوڕ بەسەرە
مەکتەب شوورەی قەلامانە بۆ حیفزی دین و دنیا
ئینسان کە نەخوێندەوار بێ کەم قەدر و بێ جەوهەرە
کوردستانمان بۆ بێبەش بێ لە ئەنواری مەعریفەت
ئاووهەوای وەک بەهەشتە داروبەردی گەوهەرە

* ئەم سرووده لە ل١١٧ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.



## گۆرانی

لەسەر کێشی ئەرێ هۆشل*

سەرکەوە کوردە وەڵڵا سەرکەل گوڵزارە
ناو شیو و ناو دەشت بەخوا جێی مورومارە
بە غیرەت بە، نەوەی شێری، زۆر دلێری
بۆچی لەم عەسرە ڕۆڵە هەر تۆ ئەسیری
ئەگەر سەرکەوی بەخوا سەرکەل بەهارە
هەموو شاخانی وەڵڵا دنیات لێ دیارە
بە هیممەت بە، بەقیمەت بە، تۆ پڵنگی
بۆچی لەم دەورە کوردە هەر تۆ دڵ تەنگی
سەرکەوتن وەڵڵا ئەمڕۆ هەر بەخوێندنە
میللەتی جاهیل وەڵڵا چاری مردنە
بە غیرەت بە، نەوەی شێری، زۆر دلێری
بۆچی لەم عەسرە ڕۆڵە هەر تۆ ئەسیری

* ئەم هەڵبەستە لە ل١٢١ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.

## گۆرانی

لەسەر کێشی ئوردومز ایتدی یمین

(صلاح الدین) سوڵتان، (کەریم خان) شاهی ئێران
نادر شاهی حوکمڕان، هاتەوە یادی کوردان
ئازادییان داوا کرد، سەربەستییان پەیا کرد
ئۆردووی کوردمان ئینشا کرد
ئۆردووی خاکی کوردستان، هەر یەکە شێری مەیدان
پڵنگی دەشت و کێوان لە حیمایەی خودا دان
ئازادییان داوا کرد، سەربەستییان بەرپاکرد
ئۆردووی کوردمان ئینشا کرد
بۆداق بەگی شێر ئەفگەن، سەلیم بەگی ڕووبیتەن
دلێرانی سەف شکەن، هاتەوە یادی وەتەن





(١) عەدن و جنة المأوى: دووباغی بەهەشتن.

(٢) حەدیقەی غازی: لە شوێنی (باب الشرقي) ئێسا بووە.

(٣) ئەریکە: کورسی.

(٤) شانزە لیزە: مەبەستی شەقامی شانزیلێزێی شاری پاریسە.

(٥) ئیفشا: بڵاوکردنەوە

(٦) موعەتتەر = معطر = عەتراوی. مووعەنبەر، معنبر: بۆنی عەنبەری لێ بێ.

(٧) قومری: باڵدارێکی خاکییە لە کۆتر پچوکترە جووت جووت بەیەکەوە دەژین

(٨) جونەید: کوڕی محەممەدی کوڕی جونەیدی بەغدایییە، ساڵی لە دایکبوونی دیار نییە. صۆفی و خواناسێکی بەناوبانگ بووە لە بەغدا هاتۆتە دنیاوە هەر لەوێش ساڵی ٢٩٧ی کۆچی ٩١٠ ز. لە دنیا دەرچووە. حلیە الأولیاء ج١٠/٢٥٥.

سیرِڕی: مەبەستی (السري السقطي)یە ئەمیش کوڕی موغەلەسی سەقەطییە ساڵی لەدایکبوونی دیار نییە صۆفی و زانا و مامۆستایەکی پایە بەرزی بەغدای ئەو سەردەمە بووە خاڵی جونەیدی بەغدایی بووە. ساڵی ٢٥٣ی کۆچی ٨٦٧ی زایینی لە دنیا دەرچووە. (الطبقات الصوفیة) ل٤٨-٥٥.

بەهلوول: کوڕی عەمری صەیرەفییە، ساڵی لەدایکبوونی نەزانراوە لە شاری کوفە لەدایک بووە و پێ گەیشتووە. دانا و قسەزان بووە (هارون الرشید) هێناویەتی بۆ بەغدا و زۆر قسەکانی پێ خۆش بوون بەڵام دوایی تووشی وەسوەسە و فکرکردنەوە بوو. بەشێت و بێ عەقڵیان لە قەڵەم داوە. ساڵی ١٩٠ی کۆچی ٨٠٦ی زایینی لە دنیا دەرچووە.

بیشر: بیشری حافی کوڕی (الحارث)ی کوڕی عەلی کوڕی (عبدالرحمن)ی مرۆزییە، پیاوێکی خواناس و صۆفییەکی مەشهوور و حەدیث زانێکی بەناوبانگ بووە. لە بنەڕەتا خەڵکی (مەرو) بووە بەڵام لە بەغدا دانیشتووە هەر لەوێش لە دنیا دەرچووە. (روضات الجنان) (ج١/ ٩٠).

مەعرووفی کەرخی کوڕی فەیروزی کەرخییە، یەکێکە لەهەرە پیاوە بەناوبانگەکانی پیاوانی صۆفی و دوعاگۆی سەردەمی خۆی. ساڵی لەدایکبوونی نازانرێ ساڵی ٢٠٠ی کۆچی ٨١٥ی زایینی لە دنیا دەرچووە (طبقات الصوفیة) ل٨٣-٩٠.

## ستایشی بەرزنجە*

### پابەندی...

پابەندی بەنی کاڵەو و پڕ سیرمە کڵاشم(١)
پەروەردەیی چەنگ سووتەکە و ساوەر و ماشم(٢)
من چیمە لە فاسۆنی فەڕەنگ، چۆغەیی لیوی
تا شاڵی مەرەز یانە خوری بێ بەقوماشم
دانیشتنی سەرچاوەیی ئاوانی چیاکەم
نایدەم بەهەموو موڵکی جیهان گەرچی گەداشم
بۆ سەیری گوڵ و مێرگی نزاران لەبەهارا
چاوم وەکو نێرگس گەشە، مەفتوونی هەواشم
بۆ نیکوی بەدی عالەمی دنیا، لە کەنارم
بۆ دینی خەڵک بێ زەرەرم نیوە مەلاشم





داخم ئەوەیە هاو وەتەنم زۆری نەزانە
بەم دەردەوە ئەتلێمەوە، ئاو کەوتووە ئاشم
هەرچەندە لە شار دوور و لە(دێ)ش دەربەدەرێکم
پێم خۆشە کە کەوتوومە مەحەللی بەنی هاشم(٣)

..........................................................

* ئەم شیعرە لە ل٣٨-٣٩ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە، ئەمەشی لە پێشەوە نووسراوە: ساڵی ١٩٣٩ی ز کە مامۆستا زێوەر مودیری قوتابخانەی بەرزنجە بووە وتوویەتی.

(١) کاڵە: بریتییە لە پارچە چەرمێک قەراغەکانی کون دەکران و شریتی قایمی تێ هەڵدەکێشرا خەڵکی لە جیاتی کڵاش لە پێیان دەکرد.

(٢) چەن سووتەکە: چێشتێکە لە ترخێنەی وشک و ساوەر یا برنج دروست ئەکرێ.

(٣) بەنی هاشم: مەبەستی بەرزنجەیییەکانە. کە ئەو کاتە زێوەر لە گوندی بەرزنجە مودیری قوتابخانە بووە وەکو باسمان کرد. وردە ئیشارەتێکی ناسکیشی تێدایە بۆ سەخاوەت و نان بدەیی بەرزنجەیییەکان، ئیشارەتەکە لەمەوە هەڵدەستی کە وشەی (هاشم) لە مەعنادا بەو کەسە دەگوترێ کە خواردەمەنی بۆ میوان ئامادە بکا تێ گوشاو (تشریب) پێشکەش بەمیوان بکا.

## بۆ عەلی کەمال بەگ

### بەیانی حەقیقەت*

طەبیعەتم کە هەڵ ئەنگووتووە لە وەضعی زەمان
خەیاڵی شیعر و غەزەل لێم پەڕیوەتە سەربان
کە سەیری حاڵەتی میللەت ئەکەم پەرێشانە
منیش لە بەحری غەما ئەبمە ماسیی مەلەوان
کەسێکی وا نییە غەمخواری قەومی بێ کەس بێ
ئەگەرچی زۆر هەیە ئەربابی ثەروەت و سامان
کە خوێندمەوە غەزەتەی (ژین) عەلی کەمالم دی
کە (شا) بەیتی قەصیدەی سەخایە بۆ کوردان
دڵم گەشایەوە، طەبعم کرایەوە دەردەم
لە شوکری هیممەتی ئەو زاتە پڕ شەکر بوو زوبان
وتم: حاتەم بەمەڕێ یا بە وشترە پیرێ
سەخای ئەکرد کە ئەویش تایبەتی بوو بۆ میوان
سەخای حەتەم کە لە دەرماڵی خۆی بوو جەبری بوو
لە عەشرەتی (تەی)ەوە نەیگەیاندە ناو شەیبان

عەلی کەماله کە دوور و نزیکی گرتووتەوە
بەفەضڵ و جوود و کەرامەت، بەجورئەت و ویجدان
ئەمە کە نیعمەتی بێ (مەنن) و بێ (ئەذی) ئەڕێژێ
بەسەر ڕەفیق و فەقیر و هەژاری سەرگەردان
عەلی کەماله بەمەردی و بەهیممەت و بەکەماڵ
مەحەللی مەفخەرەته، ڕەببی هەر بژی بۆمان
قسەش لە(لوطفی)ئەکەم بێ دریغە لوطفی ئەویش[1]
بە خۆی و خزمەوە خزمەت ئەکەن نیهان و عەیان[2]

* زێوەر ئەم شیعرەی بۆ عەلی کەمال گوتووە کە دەوڵەمەندێکی خاوەن بەخشش و دڵ فراوان و خزمەت گوزاری کوردە و ئێستا له لەندەن دادەنیشێ. مزگەوتی عەلی کەمال له سلێمانی ئەو دروستی کردووە.
ئەم شیعرە لە (ژین)ی ژمارە ٦٩٦ی ساڵی ١٩٤٣دا بەناوونیشانی سەرەوە بڵاو کراوەتەوە.
(١) مەبەستی عەبدوڵلا لوطفی کوڕی حاجی فەتحوڵلا ئاغایە کە ئەمیش دەوڵەمەندێکی پیاوی شاری سلێمانی بووە زۆر یارمەتی فەقیر و هەژارانی داوە مزگەوتی عەبدوڵلا لوطفی کە لە گەڕەکی چوارباخە لەسەر ئەرکی ئەم دروست کراوە، لەگەڵ خەستەخانەی مناڵ بوون هەر لەو گەڕەکەدا.
(٢) نیهان و عەیان: نهێنی و ئاشکرا.

## شارێکی کوردستان (خانەقین)*

جەننەتە بێ شوبهە شاری خانەقین
ئاوی ئەڵوەندیشی وەک مائی مەعین
دیمەنی سەر پرد و سەیری ئاوەکەی
صۆفیی وشکیش ئەخاتە هەڵپەڕین
گەر لەسەر پرد هەر تەماشای ئاو بکەی
قەت خەفەت ناخۆی دڵت نابێ حەزین
وێنەی وا کەم لە دونیادا هەیە
باغی جوان ئاوی ڕەوان ئەهلی بەدین
ئەهلەکەی کورد و غەریب و دۆست و نەجیب
ڕوو گوشاد، دڵ شاد و ئازاد و ئەمین
سەیری ئەو شارە ئەکەن ئەهلی فەلەک
داغ و حەسرەتیانە وەک ئەو ئەهلە نین
گەر تەماشای کۆشک و خانوویان بکەی
وا ئەزانی لەندەنە یاخۆ پەکین



داری خورما داری لێمۆ و پرتەقاڵ
داری نارنج و کەباتی چین بەچین
زینەتی داوە بەشار و جادەکەی
ئاسمان حەسرەت کەشە بۆ سەرزەمین
قەیسەریی وەک کۆشکی قەیسەر عالییە
کاسبی ڕووخۆش و دەم پڕ پێکەنین
مەعهەدی دینییە ناو مزگەوتەکان
پڕ لە ئیسلامی حەقیقی دوور لە کین
هەر حەدیقەی بۆی بچی چاو ڕوون ئەکا
سەوزە و گوڵزارە زەرد و سوور و شین
قووەتی گیان، قووەی نووری نەظەر
مەظهەری ئاثاری (ربّ العالمین)
جادەکانی مونتەزەم ڕێک و ڕەوان
پڕ لە ئاینده و ڕەوەندی نازەنین
بانگ ئەکەن بۆ ئەهلی سەر عەردی مەلەک
ئەو بەهەشتە (فادخلوها خالدین)

* ئەم سروشت ئامێزە لە ژمارە ٦ی گۆڤاری گەلاوێژی ساڵی ٥ی ١٩٤٤ی ز لەگەڵ پێشەکییەکی کورت و پڕدا بڵاوبۆتەوە.

## بۆ ناجی بەگی هورمزی

ساڵی ١٩٣٨ی ز ناجی بەگ هورمزی قایمقامی مەرکەزی سلێمانی بوو، مامۆستا (زێوەر) ئەم شیعرەی خوارەوەی بۆ ئەو گوتووە*.

قال الوطن العاجز لي أين علاجي؟
قلت له: بشراک لقد جاءک ناجي[1]
ئەم جارە بەکوردی وتی: ئەو زاتە بڵندە
تەعریفی تەواوی بکە بۆم چۆنە مزاجی؟
پێم وت شەرەف و فەضڵی لەگەڵ عیلمی تەواوە
وەک لیرەی ئینگلیزە لە هەر جێگە ڕەواجی
فەیز و شەرەفی کەعبەت ئەبێ تۆ لە نەظەردا
ئەولادی ئەتۆ دەورەت ئەدەن هەروەکو حاجی





مـەجـمووعی لیـواکـە، هەڵ ئەکـا ڕایەتی ئیـقبـاڵ
ئەمـجـا لە پەنای مـەعـدەلـەتی حەزرەتی (ناجی)

* ئەم شیعرە لە ل٢٢٢ی کەشکۆڵی (أ)دا هەبوو.
(١) واتە: وڵاتی نەخۆش و پەرِاگەندە پێی گوتم نەخۆشم و بێ هێزم، کوا چارێکم بکە؟
وتم: مزگێنیت لێ وا ناجی بەگ بوو بەکاربەدەست و لێپرسراوت، چاری هەموو دەرد و ئازارێکت دەکا.

## چۆنیەتی ڕابوردووی شاری سلێمانی*

ئەوا مـەنعی لە جـەردە و دز کـرا شـاری سلێـمـانی
لەدەست (بارِەش) چ تەدبیرێ ئەکەن مەئمووری عوسمانی
بەهەر نەوعێ هەبوو سـەددێ کـرا بۆ بارِەش و تۆزی
لە تاو قـورِ چی ئەکەن؟ کـەر قووت ئەدا بازارِ و کـۆڵانی
بە شۆسە و وشکەسی، ئێمە ئەوا چاری قورِیشمان کرد
عـیلاجێ چۆن ئەکـەن؟ بۆ کـۆمـەڵی کـێـچی بەهارانی
بە تەنظیـفات و تەرتیـباتی خانەش کێچ ئەوا کـەم بوو
مـەحـەبـبـەت چۆن ئەخـرێتـە دڵی ئەصناف و شـێـخـانی

* ئەم شیعرە لە ل٤٥ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە. زێوەر لەم چەند دێرە شیعرەی سەرەوەدا بەسەر پێیەکەوە بارودۆخی ئاوەدانی و کۆمەڵایەتی شاری سلێمانیمان لە ئاخرو ئۆخری دەسەڵاتداری عوسمانییەکاندا بۆ دەردەخا.

## لە ستایشی باخ*

چ گـولـزار و چ باخـێکە؟ چ ڕەنگین و چ نەخـشـینە؟
بەهارستـانی کـیـشـمـیـر و نیگارسـتـانی مـاچینە(١)
گوڵی (شەست پەرِ)، گوڵی (جووری)، گوڵی (لاولاوی) خونکاری
یەکێ زەرد و یەکێ سـوور و یەکێ ئاڵ و یەکێ شـینە
بە ئەنواعی عـەجـائیب خـۆی نومـایان کـرد لەبەرچاوم
کـە صـەف صـەف گـوڵ لەسـەر گـوڵ چین لەسـەر چینە
مـەگـەر هیـجـرانی یاری دیوە ڕیحـانەی سـیـا پۆشـە(٢)
وەیاخۆ عەکسی ڕەنگی پەرچەمی مەفتووڵ و موشکینە(٣)
لەسەر یەک پێ گوڵی (سۆسەن) ئەڵێی خۆی ساقییێی باخە
بە جـیلوە ئینتـیظاری ئەمـری شـاهی پڕ لە تەمکینە(٤)
ئەوەند سولـتـان و شـاهەنشـاهی صـاحیب ڕاییحـەی تیـایە





عـەبیر بێزار ئەکەن لێرە وەکو من میسک و میسکینە(٥)
لەبەرگی گـوڵ تەمـاشـاکـە بەمـیـثلی سـوندوس ئەنوێنێ
بەڵێ غـیلمـانی فـیـردەوسـە گـوڵی بەم ڕەنگ و ئایینە(٦)
هەتا چاو بڕ ئەکـا لالە عـەباسی ئەصـفـەر و سـوورە
هەتا دیقـقـەت ئەکـەی لاولاوی وەک نیلۆفـەرِی شـینە
بە شـێوەی چاوی مـەخـمووری گـوڵی لاولاوەکـەی مـەستـە
بە ڕەنگی چیـهـرەیی زەردم گـوڵی شەست پەڕ چ شـیرینە(٧)
ئەڵێی شـوبـباکی ئەولادی حـوسـەینە ڕەنگی پەرژینی(٨)
کـەوا سـەرتا بەپا سـەوزە نموونەی دەشـتـەکـەی چینە
بلـێن بەو مـەهـ جـەبینەی لالە ڕوخـسـارە: ئەویش بابێ
هەتا خـەڵقی بلـێن: ئەم جـێگە جەمـعی مـاهـ و پەروینە(٩)
بلـێن: بەو زاهیـدی خـەڵوەت نشـینی غـافـڵی عـەشقـە
کـە بێ لەم جـێگە سـاکن بێ ئەگـەر ئەو تالیـبی دینە
دەخیـلـم ساقی ئەمڕۆ بێ مەیی وەک لێـوی خوت بێنە(١٠)
دڵت عـاجـز نەبێ جـێی عـوشـرەتە نەک عـوسـرەت و قـینە
دەخیل ئەی بادی شەبگیری لە هەرجێ تووشی بولبول بووی
بلێ: (زێوەر) بەتـەنهـا مـایەوە مـەشـغـووڵی ناڵـینە

* ئەم شیعرە لە ل١٨٤-١٨٥ی کەشکۆڵی (أ) و ل٤٥ی کەشکۆڵی (ب)دا هەیە لە گۆڤاری (بەیان)، ژمارە ٩٠-٩١دا بڵاو کراوەتەوە.
(١) کیـشمـیر: ناوچەیەکە نێـوان شیـمـالی هیند و پاکستـان، وڵاتێکی زەراعی و بەپیت و بەرەکەتە، بەهاری لە جوانیدا بەناوبانگە. ماچین: وڵاتی چین کە بەپەیکەرتاشی و وێنەگەری بەناوبانگە.
(٢) ڕەیحانەی (کەشکۆڵی أ) - ڕیحانی سەرچاوەکانی تر.
(٣) مەفتوول: پێچ پێچ و لوول. موشکینە: وەکو میسک بۆن خۆشە.
(٤) جیلوە: ورشە و تیشک.
(٥) عەبیر: بۆنێکی خۆشە لە چەند بۆن پێکهاتووە.
(٦) غـیلمان: کۆی (غلام)ە، ئەو کوڕە گەنجانەی خزمەتچی ئەهلی بەهەشتن. فـیردەوس: ئەو بەهەشتەی حەزرەتی ئادەم تیا بوو تا دەرکرا.
(٧) مەخموور: مەست. چیهرە: ڕوخسار
(٨) شوبباک: پەنجەرە، شیش بەند، چوارچێوەیەکی ئاسنی تان و پۆی کون کونە سەر بەرەڵڵایە بەسەر قەبری پیاو چاکانەوە دای دەمەزرێنن.
(٩) مەهـ جەبین: مانگ ڕوو. لالە ڕوخسار: ڕوومەت سوور. ماهـ: مانگ. پەروین: کۆمەڵە ئەستێرەی (کۆ).
(١٠) وەک لێوی (کەشکۆڵی أ) - وەک لەعلی (سەرچاوەکانی تر).

**ناخوونی جەوری فەلەک***

ناخـوونی جـەوری فـەلەک، دەسـتی جـەفـایی ڕۆژگـار
دایدرِی ناگــەهـ گــریبــانی هەمــوو ئەهلی ویقــار
خـەنجـەری خـوون ڕێزی دەوران جـەرگی ئیسـلامی بڕی
تیـغی دەسـتی مـووسـڵی بوو کـافـری کـرد شـەرمـەسـار
ڕۆژی طوغــیــانی وەلادەن کــەوتە یادی ئەهلی دین
واقـیـعـەی قـەتلی حوسـەین و فـاجیـعـەی ڕۆژی شومـار
غـەم وەکـو طۆفـانی نوح ئافـاقی یەک سـەر گـرتەبەر
کـەشـتـیی عـەدل و سـیـاسـەت کـوا تیـا بگرین قـەرار
خـوێنی ئالی (مـوصطەفـا) صـەحـرای گـوڵگوون کـردەوە
دا ڕووخا قـەصری مرووەت، گوم بوو مایەی ئیفـتیـخار
نەسلی کاک ئەحمەد شەهیدی دەستی مەلعوونان ئەبێ
مــاتی کـردم ئەم خــەمــە نەما قــەرار و ئیــخــتــیــار
کــەوتە صــەحــرای بێ هۆشی، لە عــالەم بێ خــەبەر
هاتە بەر دیـدەی خـــــەیاڵم ســــوورەتـێـکی نازدار
تێ فکریم خوێنین کەفەن، شیرین سوخەن، زار و زەعیف
پێی وتم زۆر عــاجـز و مــەحـزوونم و خــاتر فـوگــار
هەر کـــەسێ بۆ حــەزرەتی شـێخ مــەرثیــەی دانا بەدڵ
بۆچی من بێ بەش ئەکەن ئەی شاعیری شوهرەت شیعار
تۆ بەخـوێنی دڵ بنووسـە ئەحـمــەدە ناحـەق شــەهیــد
نامــراد و نەوجــەوان و نەوگــوڵی ئالی کــیــبــار
قـاتیلی جـەد کـووفـەیی بـوو، قـاتیلی من مـووسـڵی
قـــاتیلی ئەو بوو یەزید، هیی من یەزیدی نابەکــار
کووفـەیی وەک ئەهلی مەککە وان لە نیسـبـەت مووسڵا
ڕەببی وێران بێ بە بادی فــــیــــتنەو و تەزویری نار
مـیـللەتی وا تووشی زیللەت بێ لە دنیـا و ئاخـیـرەت
بوو بەدەشـتی کـەربەلا (باب السـرا) بۆ ئینتـیـحـار
مـەلعـەنەت کـار و شـەیاتین خەسـڵەت و ئیـبلیس خـوو
کـافـر و جـوو مـەشـرەبن، بێ مـەزهەبن هەم نابەکـار



عوومەریی وەک خوێنی عومەریان سەند لەئەولادی عەلی
دەک خەجاڵەت بن لە مەحشەردا لە خزمەت کردگار
من عــەلی ئەکــبــەر ڕەفــیــقم بێ چ باکم کــوشــتنە
ئیـرثە بۆ ئێـمــە شـەهادەت عـیــززەتێکە خـاکـســار
غـەم مـەخـۆن بۆم شـێخ هەتا تەنهـا نەبێ لەم غـوربەتە
من لە خـزمــەتیــا ئەبم خـزمـەت ئەکـەم لەیل و نەهار
زێوەرا خـۆم دای ئەنێم تەئریخی ڕاست و مـوعـتــەبەر
(غـیــر حق بو) سـاڵی قـەتلم بینووسـە بۆ یادگـار(١)

........................................................

* زێوەر ئەم شیعرەی بەهۆی شەهیدبوونی شێخ سەعید و شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ سەعیدی حەفیدەوە، کە لە مووسڵ ساڵی ١٣٢٦ی ک. شەهید کران وتووە، لە ل٢١٦-٢١٨ی کەشکۆڵی (١)دا هەبوو.

(١) (غیرحق بو) ١٣٢٦

***

ئەم (تقریض)ە بۆ خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا سەعید ئەفەندی کابان وتراوە بۆ دەستخۆشی لێ کردن بەبۆنەی لە چاپدان و دانانی یەکەم قەواعیدی زمانی کوردی*.

تەمـاشـا و دیقـەدم لێکرد ئەکـەم تەحسـینی ئەفکارت
مـوبارەک بێ لە مـیللەت ئەی ڕەفـیـقم تازە ئاثارت
حەقیقەت باغـەبانیت کرد لە صرف و نەحوی کوردیدا
هەمـوو ئەهلی هونەر تەقـدیر ئەکـەن ئاثاری نازدارت
لە تأریخی هەزار و سێ سەد و سی و هەشتی هیجریدا
مـەتاعی قـاعـیـدەی کـوردیت نیـشـان دا بۆ خـریدارت

........................................................

* ژین، ژمارە ١٣٨٩، پێنج شەممە ١٠/٤/١٩٥٨.

**بۆ خەمەتی میری ڕەوشەن ضەمیرەمە عەلی بەگ زادە حەسەن بەگ تەقدیم**

لە پاش عەرزی ئیحتیرام، غیاباً ئیخلاصی جەنابتانم بووە، چونکە مادە و شەوکەت و چیشمەتی ئەجدادی تۆم دیوە و، معنی ئاثاری خەیرییەی باپیرشت لە سەعدییە دیققەتم کـردووە. ئەوقـاف و مـزگـەوت و خـەیراتی دائیـمی مـەرحـوومی پاشا نومـایانە. زۆر خۆشحاڵم کە زانیومە لەو گوڵزارە گوڵی وجوودی ئێوە باقی و سەرداره. (بناءً علیه) لە ئەثەری خەرافات لابەری خۆم بۆ یادگار نوسخەیێکم تەقدیم کرد ئەزانم کە جەنابتان

تێگەیشتووی پێگەیشتوون و چەند شیعریشم کردە ڕەفیقی کەبایینی حەقیقەتم کردووە، بۆ ئێوە قەترە بەدەریایە وەکو لە ئاخری شیعرەکان گوتوومە لە صەد نەوەد و نۆی نوقصانە. ئەم ڕجای خوصووصییەم لە خزمەتدا ئەوەندەیە نە عەریضەکەم بەعەریضەی طەلەب بناسە و نە کتێبەکە لە ضیمنی هیچ مەطلەبێکا تەقدیم کراوە و بەئومێدی هیچ جائیزە و موکافات نە نێرراوە. ڕجا ئەکەم کە ئەویش هەر بەمەحەببەت و یادگاری قوبوولی بفەرموون. بێخود کە تەشریفی لە خدمەت دایە ئەزانێ و شارەزایە تا عومرم گەیشتووەتە ئەم وەقتە شیعر فرۆشیم نەکردووە و ئێوەش هەر وای بزانن بەگم.

موخلیستان

زێوەر ٩٤٦/١٢/١٠

### دوو حەسەن ئیبنی عەلی شوهرەتیان تاقانە

(هاشمی النسب) ئەووەل، ئەوی ئاخر جافە
جەددی ئەو دانەری ئەحکام و شەریعەت بوو هەموو
جەددی ئەم تابیعی ئایات و حەدیثی ئەو بوو
ئەو ئیمامی دووەمین بوو، بەشەرەف بوو بەمەقام
وا ئەمیش ناوی ئەوی گرتەوە، نەی کردووە حەرام
ناوی بەگزادەی جاف تاکو لە مەیدانا بێ
باسی ساسانی لەناو گۆشەی نیسیانا بێ
ئەم لە سامانییەکان کەم نییە طەبع و هونەری
فەخرە بۆ میللەتی، بۆ عەشرەتی سەعی و ثەمەری
نەوەد و نۆی کەمە ئەم مەدحە لە صەد بۆ ئێوە
جارێ بام هێندەبێ، هەر باسی جنۆکە و خێوە

لەلایەن محەممەدی مەلا کەریمەوە بەشێوەی نوێ نووسراوەتەوە زێوەر خۆی بەشێوەی کۆنی فارسی ئامێز نووسیویە دیارییەکەشی کە بۆی ناردووە، (چیرۆکی خێوی ناو مزگەوت و سۆفی کەریمی چەرچییە).

دەقی ئەو نووسراوەی خوالێخۆشبوو حەسەن بەگی عەلی مەحموود پاشای جاف کە لە کەشکۆڵی باپیریا نووسیویەتەوە، کە لەلایەن مامۆستا زێوەرەوە بۆی هاتووە.

### حەسەن فەهمی بەگ ئەڵێت:

جەنابی شاعیری مەشوور زێوەر ئەفەندی کە لام وایە تامی جەنابی بێخود ئەدا. ئەم شیعرانەی لە ڕووی لطفەوە لەگەڵ کاغەزێکی شیرینی و پڕ لە مەرحەمەتدا بۆ ناردبووم





زۆر سوپاسی لطف و مەرحەمەتی ئەم زاتە بەقیمەتە ئەکەم کە بەبێ ئەوەی قطعاً بەخزمەتی گەیشتبم وا بەمەرحەمەت منی یاد فەرموو بوو.

کتێبێکی ئەم زاتە تألیف کردووە موفادەکەی ئەمەتە: کە منداڵانتان بەباسی جنۆکە و دێو و غۆل ترس مەخەنە دڵیانەوە.

١٤/ کانون اول ٩٤٦ – حەسەن فەهمی جاف

### دوعای خالیسانەم*

بمێنێ موئەبەد خودایە ئیلاهی
بە شەوکەت بەحورمەت مەلیک نام و جاهی
لەسەر تەختی عالی نەبینم زەوالی
بلندبێ جەلالی ئیلاهی ئیلاهی
لە هەرچی بەلابێ بەدڵخۆشی لابێ
ببێتە گولستان ڕێی جاهی ڕاهی
عەدویی جاهی دووچاری جاهی بەلابێ
هەمیشە موزەفەر بمێنێ سپاهی
مەلیک خەسڵەت تۆی حەصاری هەموو کورد
حەقیقەت لە بۆ میللەت خۆت پەناهی
لە تەعجیزی میللەت و لەعصیانی یەک یەک
مەرەنجێ ببەخشە گوناهکار گوناهی
لە یەک ڕەنگ نەخولقاوە گوڵزاری عالەم
گوڵی زەرد و سوورە جەلایە گیاهی
عەدووت شەرمەزارە چ موسلیم و چ کافر
لە ڕووتا بەدەس تاکو نەکرێ کلاهی
حەقوقت نەپرسن ئەگەر ئەوروپایی
بسووتێ بینای مەحکەمەی صولحی لاهی
دەمێ بوو بەئومێدی ئەم ڕۆژە بووم من
ببینم بەکوردی ئەوامر و نەواهی
شوکور دیم ئەوی ویستم ئەمما تەواوی
ببینم لە بۆ کورد تەواوی ڕەفاهی

* ئومێدی ئیستیقلال ساڵی ١ ژمارە ١٨ لاپەڕە ٣، ١ی شەعبان ٣٤٢، ٦ی مارت ١٣٤٠.

سالّی ۱۹۲۰ی ز. کە شێخ مەحموود لە هیندستان دیل بووە مامۆستا زێوەر ئەم هەڵبەستەی خوارەوەی بۆ ناردووە*

چ بەدبەخت چ سەر سەختم لە دووریی تۆ کەوا ماوم
جەلای چۆن ماوە نازانم؟ لە دووریی چاوی تۆ چاوم
چ بێ ڕەنگم چ دڵ تەنگم؟ لەناو جەمعی خەلائیقدا
وەکو غونچەی نەپشکووتوو لە گوڵبون دوورو داماوم(۱)
چ خامۆشم؟ چ بێ هۆشم لە بادەی ساقی یی دەوران
لە مەجلیسدا لە مەحبەسدا بەوێنەی بەردی بن ئاوم



چ دەروێشێکی بێ پیرم چ عەبدێکی بەبێ میرم(۲)
وەکو کەللە دەفێکی بێ زریزە و خاوەن و خاوم
چ ساڵێکە؟ چ حاڵێکە تەرەققیم بۆتە مەعکووسی
غەمم سەد قاتە شادیم ماتە هەر شەو مانگی گیراوم
چ بێ عارم؟ چ غەددارم وەفام خستۆتە ژێر پێتان
وەها ثابیت قەدەم ماوم ئەڵێی سووتاوە هەنگاوم
لە کوێتە (زێوەر)، ئەم دەردە حەکیمی لوطفی مەولایە
پەرێشان دێم دەچم، دەبزووم وەکو صەیدێکی ناو داوم

..........................................................

* ئەم شیعرە لە ل۲۳۱-۲۳۲ی کەشکۆڵی (أ)دا هەبوو ئەو زانیارییەی سەرەوەشی لە پێشەوە نووسراوە، واتە ئەو کاتە شێخ مەحموود لە هیندستان بووە، کەچی نەجمەدین مەلا لەنیوە دێری شیعری کۆتایی لە وشەی (کوێتە) سەرنجی بۆ ئەوە چووە کە (کوێتە) مەبەستی کوێت بووبێ بۆیە لە پەراوێزی ل۲۳۲ی کەشکۆڵەکە نووسیویەتی «هەرچەندە ناوونیشانی ئەم هەڵبەستە ئەڵێ هەڵبەستەکە نێرراوە بۆ هیندوستان بەڵام بەوەدا کە ئەڵێ: (لە کوێتە زێوەر) ئەبێ شێخ مەحموود لە دیلی ڕزگاری بووبێ وە هاتبێتەوە ئەمارەتی کوێت» بەڵام وابزانم بۆچوونەکەی (نەجمەدین مەلا) لە شوێنی خۆی نییە و (لە کوێتە) مەبەستی ئەوە بێ تو هێشتا جارێ لە کوێتە و چت دیوە!!.

(۱) گوڵبون: درەختی گوڵ یان چەپکە گوڵ.

(۲) پیر: مەبەستی (شێخ)ە. عەبد: کۆیلە.

## مۆژدەبێ*

مـوژدەبێ یاران کە شاهی دیدە مەستان هاتەوە
ساقی یی بەزمی طەرەب بۆ مەی پەرستان هاتەوە(۱)
با، بەنەغمەی دڵ گوشا بولبول لەگەڵ قومری بلێین:(۲)
غونچەیی خۆش بۆی باغ و سەروی بۆستان هاتەوە(۳)
ساقی و موطریب، مەی و نەی بیننە جەولان و جۆش(٤)
شاهی صەدری مەجلیس و شەمعی شەبوستان هاتەوە(٥)
ئافتابی چاوی مەستی کەوتۆتە ژێر قەوسی برۆ(٦)
با گەدایان قوڕ بەسەربن فەسڵی زستان هاتەوە
دیدە عەبهەر، قەد سنەوبەر، ڕوو قەمەر، موو عەنبەرە(۷)
چەندە ڕەنگینە! بەهاری گوڵ بەدەستان هاتەوە
دیدە حەیران بوو لە نەظظارە و تەماشاکردنی
شاهی (ئەسکەندەر) لە ئاوی تاریکستان هاتەوە(۸)
(زێوەر) ئەمجا بەس بەیان کە شەکوەیی ئەحواڵی خۆت
وا موعینی بێ نەوا و بەخت سستان هاتەوە

..........................................................

* ئەم شیعرە لە ل۱۸۱-۱۸۲ کەشکۆڵی (أ) و ل٤۳ی کەشکۆڵی (ب)دا هەیە لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە ۱٤۲ ل۱۸دا





بڵاو کراوەتەوە.

نەجمەدین مەلا لە کەشکۆڵی (أ) دەڵێ: زێوەر ئەم شیعرەی بۆ خۆشەویستێکی کە لە ڕێگای دوورەوە هاتۆتەوە نووسیوە، (دیارە شێخ مەحمودی حەفید بووە.)

(١) بەزمی طەرەب: بەزمی خۆشی و ڕابواردن.

(٢) قومری: باڵدارێکی خاکییە لە کۆتر پچووکترە جووت جووت بەیەکەوە دەژین.

(٢) خۆش بۆ: بۆن خۆش.

(٤) ساقی: شەڕاب گێڕ. موطریب: گۆرانی بێژ.

(٥) صەدری مەجلیس: پێشەوا و پیاوماقووڵی مەجلیس. شەمعی شەبیستان: لە کوردەواری دەگوترێ (شەمعی شەبوستان).

(٦) ئافتاب: خۆر.

(٧) عەبهەر: نێرگس. عەنبەر: گیایەکی بۆن خۆشە، هەروەها عەنبەر بەمایەیەکی بۆن خۆشیش دەڵێن کە لە ناوسک یان ڕیخۆڵەی جۆرە ماسییەک دەری دەهێنن.

(٨) ئەسکەندەر: ئەسکەندەری مەکدۆنی کە لەلای هەولێر لەشکری دارای ئێرانی شکاند و وڵاتەکەی داگیر کرد. دەڵێن: ئەسکەندەر زۆر بەشوێن ئاوی حەیاتدا گەڕاوە و بەڵام نەیدۆزیوەتەوە، گوایە کانیاوی ئاوی حەیات لە تاریکیدایە تەنها خدری زیندە دۆزیویەتیەوە و لێی خواردۆتەوە بۆیە تا ڕۆژی قیامەت نامرێ.

## ڕۆژی جەژن*

ڕۆژی جەژن ئەطفالی وردە پوولی جەژنانەی ئەوێ
هەریەکە لای باب و مامی ڕوپییە یا ئانەی ئەوێ
دوختەری نەوڕستە بۆ زیادیی جوانی و زینەتی[1]
وسمە بۆ ئەگریجە، بۆ پرچی خەنە و شانەی ئەوێ
هەرزەکار و کوچە گەرد و خوێڕیانی ناو گەڕەک
هەندێ زوڕنا و هەڵپەڕین، هەندێکی مەیخانەی ئەوێ
تاجیرانی موعتەبەر بۆ خزمەتی میوانیان
نوقڵی بەمباو ڕاحە و و حەڵوای گەزۆی بانەی ئەوێ
شێخ (عصام الدین) و ئەمثالی لە دەروێش و مرید
شەککەر و گیسک و برنج و ڕۆنی شێخانەی ئەوێ
بۆ مەعاشی خۆی و ئەم خەڵکە ڕەئیسی ماڵیات
دەفتەری ئەعشاری تازە و قەیدی بزنانەی ئەوێ
سواری ئەسپی خۆی ئەبێ لای نوختەکان سووڕی ئەدا
(عەبدول ئاغای) ئاشناشم باجی بارانەی ئەوێ
بێینە سەر باسی ڕەئیسی داخیلیەی مەملەکەت
خەلعەتی خاصی مەلیک، ئینعامی شاهانەی ئەوێ





نەسلی پاکی شێری یەزدان شێری حەق زاتی مەلیک
حەزرەتی شێرانە و ئاثاری مەردانەی ئەوێ
(زێوەر)یش لەم ڕۆژەدا چون دوعا مەقبووڵ ئەبێ
هەر دەوامی ڕیفعەتی تاجی ملووکانەی ئەوێ
بەرقەرار و پایەدار و نامداری کەی خوا!!
تا فەلەک بۆ زیب و زینەت ئەم ستارانەی ئەوێ

.........................................................

* ئەم شیعرە لە ل٢٣٤-٢٣٥ی کەشکۆڵی (أ)دا هەیە، لە سەرەتای شیعرەکەشەوە نووسراوە (مامۆستا زێوەر ڕۆژێک لە پێش جەژندا ساڵی ١٩٢٣ی ز کە شێخ مەحموود حوکمدار بووە ئەم هەڵبەستەی وتووە و بۆی ناردووە).

(١) دوختەری نەوڕستە: کچی تازە پێگەیشتوو.

## نزا*

دەخیل ئەی نوور بەخش ئەی شێخ عیسا[1]
جگەر گۆشەی بەڕاستیت وا لە حەپسا
پەناهی عالەمێکی، نوور بەخشی[2]
تکای شێخی جیهان سوودی نەبەخشی
تکای تۆ با لە دەرگاهی خوا بێ
کە شێخ مەحموود بەئاسانی ڕەها بێ[3]

.........................................................

* ئەم سێ دێڕە شیعرە لە ل٢٤٧ی کەشکۆڵی (أ)دا هەبوو دیارە کاتێک گوتراوە کە شێخ مەحموودی نەمر لە حەپسخانە بووە.

(١) نوور بەخش: مەبەستی سەیید محەممەدی نوور بەخشە کە کوڕی بابا عەلی هەمەدانییە و برای شێخ عیسا و شێخ موسایە، وەکو لە مێژوودا نووسراوە گوایە سەیید محەممەد و شێخ عیسا و شێخ موسا لە حەج گەڕاونەوە، ویستوویانە بچنەوە بۆ هەمەدان، لە بەرزنجە شێخ عیسا و شێخ موسا ماونەتەوە و بەرزنجەیان ئاوەدان کردۆتەوە، بەڵام سەیید محەممەدی نوور بەخش ڕۆیشتۆتەوە بۆ هەمەدان، بناغەدانەری طەریقەی (نوور بەخشی)ش هەر ئەم بووە.

(٢) نوور بەخشی: وەکو طەریقەیێکی صۆفیگەری و خوا پەرستی بووە هەروەها نازناوی شیعریی شێخ مەحموودی نەمریش بووە.

(٣) ڕەهابێ: ڕزگاربێ.

## کێ شێخە*

لە بۆ جەرڕی مەنافیع لای هەموو پیر و جوان شێخە
لە بۆ دەفعی مەناهی گۆشەگیر و بێ زمان شێخە
لە بۆ تەفرەی خەلایق هەروەکو تەییارە سەییارە[1]
بەتەسبیح و بەتەهلیل و بەڕیش و تەیلەسان شێخە[2]

ئەگەر شێخت ئەوێ لادە لە ڕێگای خانەقا و تەکیە(٣)
ئەتۆ ئەقڵ و کەماڵت بێ، بێ بزانە: کێ بەشان شێخە
جونەید و شێخی سیڕ و (غەوثی بەغدا) شێخی میحرابن(٤)
عەیاز و خالید و تاریق، ئەمیر نەورۆزمان شێخە(٥)
مەڵێ: شێخ زۆر کەمن بێ دەستەڵاتن چونکە عەشرەت نین
ئەتۆ ئیعلانی خواردن کە لە ئەرز تا ئاسمان شێخە
یەکێکە سەد هەزار دێنێ، کەلامێکی چ مەقبووڵە؟!
لە ئەولادی عەلی تەنهایە شێخ مەحموودیان شێخە(٦)
چراغی مولکی کوردستانە نووری چاوی ئیسلامە
خوا حیفزی بکا بۆ حیفزی نام و خانەدان شێخە

.........................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٠٥-١٠٦ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.

(١) سەییارە = سیّارة: خۆشڕەو، خێراڕەو (مەبەستی ئەوەیە کە کۆڵکە شێخ بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵکی لێزان و کارامەیە).

(٢) تەیلەسان = طیلسان: بەرگێکی سەوزە هەندێ کەس لە شێخ و دوعاگۆ لەبەری دەکەن.

(٣) خانەقا: جێگای خواپەرستی پەیڕەوای تەریقەتی نەقشەبەندی. تەکییە: جێگای خواپەرستی پەیڕەوانی تەریقەتی قادرییە.

(٤) جونەید (ابو القاسم الخزاز) صۆفییەکی بەناوبانگی بەغداییە، دەڵێن: سێ جار چووە بۆ حەج بەبێ ئەوەی سواری وەڵاخ بێ، دامەزرێنەری ڕێبازی طەریقەتی جونەیدییە ساڵی ٩١٠ی زایینی لە دنیا دەرچووە.

سیڕ: مەبەستی سەڕِی سەقەطییە (سری بن المفلس) صۆفییەکی مەشهوورە ساڵی ٨٧٠ی زایینی لە بەغدا لە دنیا دەرچووە.

غەوث: مەبەست شێخ عەبدولقادری گەیلانییە ١٠٧٨-١١٦٥ زایینی.

(٦) مەبەستی شێخ مەحموودی نەمرە کە ئەو کاتە یەکە پیاوی کوردستان بووە ئاڵای شۆڕش و ئازادیخوازیی هەڵکردووە و دژی داگیرکەری ئینگلیزی جەنگاوە زیاد لەوەش شێخاتی و ڕێوشوێنی باوک و باپیرانی خۆشی بەجێ هێناوە.

## بۆ خزمەت شێخ مەحموود*

مەیلت هەیە ببینی ئەگەر خالیدی وەلید
هەستە بچۆرە زیارەتی مەحموودی شێخ سەعید
من ناگەمە حوزووری کە دامانی ماچ بکەم
توخوا وەکالەتم بکەن ئەی بەرق و ئەی بەرید
عەرزی بکەن کە بەندەی تازە و قەدیمی خۆت
زێوەر دوعای نەجات و حەیاتت ئەکا مەدید
بۆ دائیمی شەرافەت و مەجدت لە عالەما
ئەورادی مونحەصیر بووەتە ذیکری یا مەجید



ئازادەگی لە بەندەگی ناکا طەڵەب ئەبەد
تۆ خۆش بی بابمێنێ لەناو دائیرەی عەبید

.........................................................

* ئەم شیعرە لە ل٢٣٦ی کەشکۆڵی (أ)دا هەبوو هەروەها لە ل١٢ی دەستنووسی شاعیریش هەبوو هیچ جیاوازی لە نێوانیاندا بەرچاو ناکەوێ.



این مکتوب بجناب ملا فائق هدیه نمودم بیار کار [illegible]
[illegible] که راه مسلمانان
از [illegible]
[illegible] نکنند [illegible] حفید زاده ۳۱/۹/۱۰





### دیسان بۆ خزمەتی شێخ مەحموود*

له شوكری نیعمەتی تۆ و خالقم هەتا ماوم
هەرچی بڵێم و بنووسم بزانە خەڵەفاوم
(علیک الف سلام) یا وەلی نیعمەت
غوباری پاکی ڕەهی تۆیە سورمەیی چاوم
وەها مەزانە کە زۆر نانووسم عەریزەی حاڵ
لە حوببی ئەصڵی یو زاتی کە بوومە شێواوم
فیدایی لوطف و وەفا و دیانەتی ئێوەم
منیش ئەناسی کە ئیسلامی ضیدی ئیسلاوم(١)
مونافیقی و ڕیا و درۆم لەلا کوفرە
هەمیشە مات و پەرێشانی مانگی گیراوم

* ئەم شیعرە لە ل٢٣٦ی کەشکۆڵی (أ) وەرگیراوە.
(١) ئیسلاو: مەبەست قەومی سلافە کە بریتییە لە قەومی ڕووس و یۆغۆسلافیا.

### بۆ خزمەتی شێخ مەحموود

بەحەپسی یوسفی ثانی دڵی عالەم موکەددەر بوو
دڵی زیندان بەتالع بۆ بەدیداری مونەووەر بوو
لە تەشتی سینە و جامی سەرا سەد پەنجە ئەشکێنم
هەتاکو مژدەیەکم دێتە گوێ ئەو مانگە وابەر بوو

بۆ ڕۆژنامە و گۆڤارەکان

### ئەی خوێندەوارەکان*

ئەی خوێندەوارەکان و ئەدیبانی موحتەرەم
دایم بەهێزی خۆمەوە هەر شوکرتان ئەکەم
ئاثاری جوود و جەهد و جەوان مەردیی ئێوەیە
ساڵی یەکەم تەواو بووە و کەوتمە دووەم
تا ئێوە قەدر و حورمەتی منتان لەلا هەبێ
شەوقم ئەگاتە مەملەکەتی تورکیا و عەجەم
ئیمداد و لوطفی ئێوە ئەگەر ڕوو نەکاتە من
بێ شوبهە من ئەکەومە بوخار و غوبار و تەم





ئەوسا نە دەنگ و ڕەنگم ئەمێنێ نە شوهرەتم
نە خزمەتم، نە ڕەونەقی ئەفکاری موحتەشەم

* مامۆستا زێوەر ئەم کۆپلە شیعرەی بەناوی گۆڤاری گەلاوێژەوە وتووە. لەیەکەم لاپەڕەی گۆڤاری ناوبراو ژمارە ١-٢ی ساڵی ٢ کانوونی دووەم و شوباتی ١٩٤١ی ز دا بڵاو کراوەتەوە. لەسەرەتاوە لێی نووسراوە «بەناوی گەلاوێژەوە» لە کۆتایی کۆپلەکەشدا زێوەر نووسراوە.

### بۆ گۆڤاری گەلاوێژ*

گەلاوێژم ئەوێ وەک مانگی چواردە
کە شەوقی ڕوو بکاتە شاخ و هەردە
گەلاوێژم ئەوێ وەک مانگی تابان
کە ئاوازەی بگاتە غەرب و یابان
گەلاوێژم ئەوێ کانی ئەدەب بێ
لە بۆ ئەهلی ئەدەب مایەی طەرەب بێ
ببێتە فێنکی بەخشی دڵی گەرم
لەسەر ڕێگای حەقیقەتدا نەکا شەرم
گەلاوێژم ئەوێ هەروەک موحامی
بە قووەت بێ، بەقیمەت بێ کەلامی
گەلاوێژم ئەوێ بۆ میللەتی خۆی
وەها نەدوێ کە ببرێ نان لەگەڵ دۆی
لە بۆ پێشکەوتنی ئەهلی وڵاتی
زەرەر ناکا بکا صەرفی حەیاتی
ببێتە باخچەیێکی عیلم و ئەخلاق
بڵاوکا بۆنی خۆشی بۆ سەر ئافاق
ئەگەر وابێ ئەمینم من لە دوایی
ئەبێتە ڕەهبەری، تەوفیقی خوایی

* زێوەر ئەم شیعرەی بۆ گۆڤاری گەلاوێژ گوتووە.

### ئەمڕۆ*

ئەمڕۆ بەناوی میللەتی کوردی بەدڵ بەگیان
تەبریک ئەکەم (ژیانەوە)مان ناونرا (ژیان)

فەئلێکی خەیری میللەتە یەعنی کە قەومی کورد
صوبحی حەیاتی ڕەوشەنە پێشڕەویەتی ژیان
پەروەردەیی حیمایەی لوطفی حوکوومەتە
بۆیە بەسام و نامە وەکو شێرەکەی ژیان
فیکری موخالەفاتی وەطەن مەحو ئەکاتەوە
ئەهلی مەعاریفی بەقسەی خۆشی خۆی ژیان
یاڕەب! دەوامی خزمەتی ئەم ڕۆحی میللەتە
لای تو طەلەب ئەکەم بە سەعادەت بەبێ زیان

.......................................................................

* زێوەر ئەم شیعرەی بەهۆی گۆڕینی ناوی ڕۆژنامەی ژیانەوە بە ژیان وتووە. لە ل٤٧–٤٨ی سۆزی نیشتماندا بڵاو بۆتەوە.

## بۆ گۆڤاری ڕۆژی کورد

چەندە شیرین زبانی ڕۆژی کورد
شەکەر ئەفسانە دەهانی ڕۆژی کورد
مەظهەری تەقدیری ئەربابی دڵە
ئەهلی دەرکە مەدح خوانی ڕۆژی کورد
دوور لە هەور و صاعیقە و تۆز و غوبار
جورمی صافە ئاسمانی ڕۆژی کورد
خەم بووە بۆ جەلبی قەلبی عالەمێ
ئافەرین بۆ ئەبرووانی ڕۆژی کورد
گوڵشەنێکە پڕ لە نووری مەعریفەت
دەستی نەڕزێ باغەبانی ڕۆژی کورد
لەفظ و مەعنای مەعدەنی هەر حیکمەتە
ڕەببی باقی بێ بەیانی ڕۆژی کورد

گۆڤاری «ڕۆژی کورد»، ئەستەموڵ، ژمارە ٤، ٣٠ ئاغستۆس ١٣٢٩ ڕۆمی (١٩١٣).

## بۆ بانگی کوردستان*

(بانگی کوردستان) نیشانەی هوشیاریی میللەتە
بۆ ئەسەر خوانی مەعاریف تەذکەرەی سەر دەعوەتە(١)
دەورەی ئیقباڵە دەورەی بانگی کوردستانمان
بانگی صوبحی صادیقە، بەم دەنگە هەستین فرصەتە(٢)



سایەی باڵی هومایە بازی زەڕڕین شاپەڕە(٣)
چوونە ژێر سایەی نیشانەی بەختیاری و دەوڵەتە
باخچەییێکی پڕ گوڵە دەریاچەیی پڕ گەوهەرە
ڕەنگ و دەنگی فەیض ڕێژە نیعمەتی بێ میننەتە(٤)
بۆ تەڕەققی قەومی کورد و داد خواهیی حاڵییە(٥)
تەرجومانی حاڵی زاری میللەتی کەم قودرەتە
بانگی کوردستان لە خارا و حەریر لایق ترە(٦)
دەک موبارەک بێ بەبالای قەومی کورد ئەم خەلەتە(٧)
ئاسمانێکە سەراسەر مەطلەعی نەجمی وەفا(٨)
گوڵستانێکە سەراپا مەظهەری سەد ڕەحمەتە
ئەم جەریدە تازەیە جەردەی جەهالەت لا ئەبا
سێ زوبان، سێ تیری دەستە واسیطەی سەد نەصرەتە(٩)
ڕەببی بۆمان هەر بمێنێ خادیمی موڵک و وەطەن
ئەم لە بۆ پێشکەوتن ئەمڕۆ پشتیوان و قووەتە

.......................................................................

* زێوەر ئەم شیعرەی بەبۆنەی دەرچوونی ڕۆژنامەی «بانگی کوردستان»ەوە گوتووە و لە ٢ی ئەغستۆسی ساڵی ١٩٢٢ی ز لە ژمارە ١ی هەمان ڕۆژنامەدا بەعینوانی (موبارەک بادی) و بەناوی زێوەر بڵاو بۆتەوە.
لە ل٤٨–٤٩ی سۆزی نیشتیمانیشدا چاپ کراوە.
(١) خوانی مەعاریف: سفرە و خوانی زانستی.
(٢) بانگی صوبحی صادق: بانگی بەیانی کە لەگەڵ دەرکەوتنی صوبحی صادقدا وەختی دێ.
(٣) هوما: باڵندەییێکی ئەفسانەیە.
(٤) فەیض: بەرەکەت
(٥) داد خواهی: داواکردنی عەدالەت و دادپەروەری.
(٦) خاراو حەریر: دوو جۆر قوماشن.
(٧) خەلەت: خەلات و بەرگ و پۆشاک.
(٨) مەطلەعی: شوێنی هەڵاتنی ئەستێرە و مانگ و ڕۆژ.
نەجم: ئەستێرە
(٩) ئاماژەیە بۆ ئەوە کە ڕۆژنامەی «بانگی کوردستان» بەکوردی و فارسی و تورکی دەرئەچوو لەبەر ئەوە ئەڵێ: سێ زووبان سێ تیری دەستە.

## سەرگوزەشتە*

تەحصیل دیدەیێ صاحێب شەهادات(١)
لەگەڵ ڕەفیقی کەوتە بەیانات
تەعریفی حاڵ و ئەحواڵی ئەکرد
بۆ زۆر پێشکەوتن خەیاڵی ئەکرد
وتی: ئەی ڕەفیق! ئیشمان زۆر چاکە
سەیری جاددە کە ئێستا چەند پاکە
لە پێشکەوتنا بووینە ئەورووپا
نوقصانمان نییە ئیللا فابریقا(٢)
ئەنواعی یاری و قومار ئەزانین
سمێڵ ئەتاشین هەروەک ئەڵمانین
لە فەننی فتبۆڵ وەکو ئینگلیزین
لە بیلاردۆدا ئوستادی ڕیزین
شێخ و مەلا و صۆفیمان پەشمە
ئینسانی وشک قابیلی خەشمە
ئیتاڵیا چۆنە دەرحەقی پاپا
ئێمەیش هەروواینە دەرحەق عولەما
جاران بەسیڕڕی لە ناو جوولەکان
عەرەقمان ئەخوارد، لە ترسی ئەوان
ئێستا سەربەستین لە کووچە و بازاڕ
عەرەق و شەراب ئەکڕین بێ ئازار
مەعاشمان ببێ بەدووسەد دینار
فلسێکی نادەین قەت بەکەس و کار
ئیقتیصاد فێربوون فەننێکی باشە
با کەسێ نەڵێ: مەعاش بەلاشە
شەو لە سینەما و لەناو تیاترۆ
یا لە چاخانە و یاریی بیلاردۆ
سەد شکسپیر و هۆگۆمان هەیە(٣)



هەزار ڕەجاڵی (تۆکیۆ)مان هەیە
لە سایەی ڕادیۆ ئەحواڵی عالەم
لێمان گوم نییە نە زۆر و نە کەم
ئەوا تووتنیش بوو بەئینحیصار
ئەویش قازانجی فەقیر و هەژار
پەکیان ناکەوێ توجاڕی تووتن
کەتیرە و مازوو خوری و ڕۆن ئەکڕن
توخوا خۆش نییە لەلات ئەم دەورە
نە غەدر ماوە نە وەختی جەورە
ڕەفیقیش وتی: هەر ئەمە، ڕێت بێ
هیچ عاجز مەبە «باڕۆستەم شێت بێ»(٤)

.........................................................................

* ئەم شیعرە لە ل٥٦-٥٧ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە. لە (ژین)ی ژمارە ١٢٣٦ی ١٩٥٥/٢/١٠دا لە گۆشەی (شیعر و شاعیرەکانمان)دا بەعینوانی (سەرزەنشت) لەگەڵ کورتەییێک ژیانی شاعیر بڵاو کراوەتەوە بەڵام بەدەست لێدانێکی زۆرەوە. بەپێویستمان نەزانی بەراوردێ لە نێوانیان بکەین.

(١) تەحصیل دیدە: خوێندەوار.

(٢) فابربقا: کارگەیەکە کە بەزۆری شتی تیا دروست بکرێ.

(٣) شەکسپیر: ئەدیب و شاعیر و چیرۆکنووسێکی ئینگلیزی بەناوبانگە، ساڵی ١٥٦٤ی ز لەدایک بووە ساڵی ١٦١٦ لە دنیادا دەرچووە نووسراوەکانی بوونە ئەدەبی جیهانی بۆ زۆر زمان وەرگێڕراون.

هۆگۆ = «ڤیکتور هۆگۆ»: شاعیر و نووسەرێکی بەناوبانگی فەرەنسییە، ساڵی ١٨٠٢ی ز لە دایک بووە ساڵی ١٨٨٥ی ز لە دنیا دەرچووە یەکێکە لە شۆڕە سوارانی حەرەکەی ڕۆمانتیکی.

(٤) با ڕۆستەم شێت بێ: ئاماژەیە بۆ چیرۆکێک وەکو مامۆستا نەجمددین مەلا دەڵێ گوایە (جارێک زێوەر تەماشا ئەکا کۆمەڵێک منداڵ شوێن کابراییێک کەوتوون، کە کابراکە شێت ئەبێ ئەویش منداڵەکانی لێ دەرئەکا و دووریان ئەخاتەوە ئەمجا کابرای شێت دێتە بەردەم مامۆستا زێوەر سەرمەوقووڵاتێک ئەدا ئەڵێ: (با ڕۆستەم شێت بێ).

## چیرۆک*

پیاوێ بوو زۆر فەقیر بوو
سەرەڕای فەقیریی پیر بوو
خاوەنی ماڵ و منداڵ
نەیبوو نانێ لەناو ماڵ
بە ئارەقی ناو چەوان
بە قووەتی بازووان

له شاخ چیلکەی ئەهانی
بۆ نانی منداڵانی
چیلکەی ئەدا بەپارە
ئەیدا بەنان بێ چارە
هەموو ڕۆژێ بەیانیان
ئەچوو بۆ شاخ و کێوان
ئەوەندەی خۆی ئەیتوانی
چیلکەی ئەنا لە شانی
ڕۆژێ لەژێر کۆڵەدار
لە گیانی بوو بوو بێزار
لەشی پڕ بوو لە ئارەق
دوو چاوی بووبوو ئەبڵەق
داری دا بەسەر بەردا
بەردی دا بەسەر عەردا
کۆڵەکەی کەوتە عەردی
زاهیر بوو ئاوی سەردی
بانگی کرد یا عیزرائیل
تۆ وەرە لام بەتەعجیل
ڕۆحم ناوێ بەم حاڵە
چی بکەم لەم عومرە تاڵە
قسەی لەناو دەما بوو
عیزرائیل لێی پەیدا بوو
وتی: منت بۆ چییە
ئەم هاوارەت لە چییە
پیرە لە ترسی گیانی
جوابی قسەی نەزانی
لەپاش نەختێ مامەی پیر
وتی: هەر تۆی دەستگیر
لەژێر کۆڵی گرانام
لەناو ئاه و فوغانام



بۆیە هاواری تۆم کرد
فریام کەوی دەستوبرد
هەتا هەڵدەسمە سەرپێیان
لەنگەری بگرە قوربان
عیزرائیلی بەهەشتی
کۆڵی نایە سەرپشتی
ئەمجا پیرە بەیەک غار
کۆڵی فڕاندە ناو شار

.........................................................

* ئەم شیعرە چیرۆکییە کاتی خۆی لامارتین ١٧٩٠-١٨٦٩ز کە شاعیرێکی بەناوبانگی فەرەنسییە و مامۆستای قوتابخانەی ڕۆمانتیکی بووە بەفەرەنسی گوتوویەتی «موعەللیم ناجی» کردوویە بەتورکی. مامۆستا زێوەریش لە تورکییەوە وەری گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی لە ل٨٢-٨٣ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.

## چیرۆک - سێ هاوڕێی چاو برسی*

سێ ڕەفیق هەبوون برادەری گیانی
وەیس و ئەلیاس و نالە بۆکانی
هەرسێ بێ کار و ناتەواو و فەقیر
وەیس و نالە جوان و ئەلیاس پیر
نانی گاڵیان لە لا شەکرلەمە بوو
چای شیرینیان بەگوێز لەمە بوو
ڕووت و قووت و بێ نەواو و بێ جلوبەرگ
هەر سێ ئاواتە خوازی ساعەتی مەرگ
ڕۆژێ کۆبوونەوە بەپەنهانی
تا بکەن چاری دەردی بێ نانی
وەیس وتی: چاری ئەم خەم و دەردە
کە ببینە دز و سەگ و جەردە
وتیان پێی فیکرەکەت بەنانەلەتێ
دایکی دز سینگ ئەخوات و سینگ ئەکوتێ
لای نەصارا و جوولەکە و ئیسلام
پیاوی دز حورمەتی نییە و بەدنام
مامە پیرە وتی: لە ماڵەو ماڵ

دەوڵەتێکی بێ ئەزییەتە، سواڵ
وتیان عەیب و عارە سواڵکردن
سەد کەڕەت خۆشترە، لە سواڵ مردن
نالە هاتە زمان وتی: یاران
لازمە ڕوو بکەینە ڕێی شاران
ئێمە لەم شارە بام بکەین هیجرەت
حەرەکەت قەت نەبووە بێ بەرەکەت
فیکری نالە قبووڵ کرا دەردەم
کەوتنە ڕێگە سێ کەسی هاوخەم
پاش دوو ساعەت گەیشتنە هەوراز
شاخی زۆر سەختی پڕ لە ورچ و بەراز
پارچە هەورێ لە ئاسمان دەرکەوت
وتیان: بام بچینە ناو ئەشکەوت
هەورەکە زیادی کرد برووسکەی دا
لە پڕا قەترە قەترەیێک دای دا
زیادی کرد قەترە قەترەی باران
شەقە شەق کەوتە ناو گەڵای داران
کەوتنە گێژی میحنەت و سەرما
لە هەموو وشکی یا دانیان ما
بە هەزار دەرد چوونە دەم غارێ
سەیریان کرد لە ناویە ڕەش مارێ
ماریان دی گەڕانەوە پڕ خۆف
دەستیان کرد بەئاه و ئاخ و ئۆف
وتیان: ئەی خوای زەمین و زەمان
عالمی خۆت بەکاری ڕاز و نیهان
برسیەتی و بارش و هەوای سەرما
ئەژدەهایشمان ئەهێنییە سەر ڕێگا
یا ئیلاهی چییە قەباحەتمان
دەم بەدەم زیادە ئەکا موصیبەتمان
لەم موناجاتەدا بەدڵ گریان



لوطفی حەق کەوتە ظاهیری بۆیان
ئەژدەهاکە کشایەوە ناو کونی خۆی
لەو مەکانە کە بوو بەبێ دەنگ ڕۆی
چوونە ژوورێ ڕەفیقەکانی سەفەر
هەموو دڵ پڕ لە ئاگر و لەشی تەڕ
نیو سەعاتێ لە پاش وچان، هەستان
بۆ مڵ و مووش بەغاردا ئەگەڕان
سەیریان کرد لە تاریکیی ئەشکەوت
یەک هەمانە لە جێگە مار دەرکەوت
هەر بەغار چوونە سەر هەمانە ڕزیو
سەیریان کرد پڕە لە زێڕ و لە زیو
شوکری حەقیان بەجێ هێنا یەک یەک
وتیان یا ئیلاهی (حمداً لك)
مامە پیرە وتی: قسەی ناوێ
جارێ وەیس با بداتە شار تاوێ
دوور نەکەوتووینەوە تەواویی لە شار
نان و پێخۆر لەوێوە بینێ بەغار
وەیسە زوو کەوتە ڕێ دراوی برد
بە دڵی خۆش نیازی شاری کرد
جار بەجار ڕای ئەکرد و جارێ ڕەوت
هۆشی دابووە هەمانەکەی ئەشکەوت
وتی: بۆچی هەمانەیێک ئاڵتوون
بیدەمە دوو ڕەفیقی خوار و زەبوون
زەهریان بۆ ئەنێمە ناو پێخۆر
هەردوو بمرن بەبێ هەراو شەڕ و شۆڕ
خۆم بەجارێ ئەبم بەخاوەن ماڵ
خاوەنی کۆشک و باخ و جاه و جەلال
ڕۆیی تەرتیبی زەهر و نانی کرد
ڕووی لە یارانی ناتەوانی کرد
بێینە سەر باسی نالە و ئەلیاس

کەوتنە بەحری غائیلە و وەسواس
نووری ئیمانیان لە دڵ لابرد
قەصدی قەتلی ڕەفیقی خۆیان کرد
نالە هاتە زمان وتی ئەی یار
ئەم هەموو زێڕە بۆ چ بکەین بەنیشار
ئەم هەمانە بکەین بەدوو تەقسیم
وەیسی سەگباب بچێتە ناری جەحیم
پیرە پێی خۆش بوو فیکرەکەی نالە
زۆر بەچاک هاتە قەلبی ئەم فالە
ئەم قسانە تەواو نەبوو وەیسی
هاتەوە ماندوو و مردوو و زک برسی
نان و پێخۆرەکەی لە شان لابرد
وەکو سەگ نالە حەملەی بۆ برد
دای بەئەرزا سواری سینگی بوو
مامە پیرەیش بە یاریدەدانی چوو
وەیسی ماندوو هیلاک و بێ قووەت
کەوتە ژێر چنگی دوو سەگی پێ پەت
هەر بەدوو سێ دەقیقە خنکانیان
زوو فرۆشتیان بەپارە ئیمانیان
نالە نەیهێشت کە پیرە بگرێ وچان
زوو بەزوو مامە پیرەشی خنکان
کە لەمانە نەجاتی بوو نالە
وتی بۆ من زەمانی ئیقبالە
نانی خۆم با بخۆم بەکەیف و صەفا
وا نەجات بوو لە فەقر و ڕەنج و جەفا
قۆڵی هەڵکرد و نانەکەی هێنا
ڕووبەڕووی خۆی هەمانەکەی دانا
تاکو توانی لە نان و گۆشتی خوارد
ئارەزووکەی چووە سەر ئاوی سارد
هاتە سەرپێ کەوا بچێ بۆ ئاو



بە لەپا کەوتە سەر هەمانە دڕاو
زەهرەکە کاری کردە ناو جەرگی
تیژڕەویی دا بەهاتنی مەرگی
نالە زوو بوو بەفاسقی مەحرووم
کەوتە شوێن دوو ڕەفیقەکەی مەشئووم
ئەمەیە ئاخریی طەمەعکاریی
لە طەمەع لادە گەر تۆ هۆشیاریی

..........................................................

* ئەم چیرۆکە شیعرییە لە ل٧٤-٨٠ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.

## چیرۆکی کۆمەڵایەتی*

دیم لە خەودا شەوێ خەوێکی خراپ
کە نە قورئان ئەزانم و نە کیتاب
چوومە خزمەت مەلایەکی عەصەبی(١)
وتم ئەی واریثی عولوومی نەبی
ئەمەوێ فێری خوێندن و خەت بم
لە شەطی عیلمدا وەکو «بەط» بم(٢)
وتی فێربوون -بەگەورەیی- بەپلاو
پاروو بۆ لووت ئەبەی وە یا بۆ چاو
ئەحمەقی، تۆ نەزانی، نایزانی
چۆن ئەبی تۆ بە(بەط) بەئاسانی
وتم ئەی نووری دیدەیی ئیسلام!
کاشیفی حیکمەتی حەڵاڵ و حەرام(٣)
نائومێدم مەکە حەق و ئوجرەت
نەقدی گیانم ئەهێنمە خزمەت
لەم قسە ئەندەکێ سەری لەرزان(٤)
وتی لێم لادە جاهیلی زۆرزان!
ئەتەوێ پێت بڵێم- ئەگەر - قورئان
ئەمەوێ مانگی ئوجرەتی دە قڕان
کەوشەکەیشم دڕاوە پینەی ئەوێ

بێنە چاکی بکە نەگاتە شەوێ
کەوشەکانی مەلام لەسەر سەر نا
چوومە لای پینەدۆز بەشەوق و غینا
سەیری وەستام کە کرد چ کاری نەبوو
ظاهیرەن تاقەت و قەراری نەبوو
وتم ئەی مامە پیری صەنعەتکار
چاوەڕێی لوطفی تۆم لە ناو بازاڕ
جووتێ کەوشم هەیە مەحەللی ئەسەف[5]
پینەی لازمە لەگەڵ ناو کەف
وتی: برسیمە ناتەوانم من
ئەمە دوو ڕۆژە دوور لە نانم من
ڕاکە لای نانەوای کولێرە فرۆش
بێنە نیو حۆقە نانی زۆر بۆن خۆش
کەوشەکەت چاک ئەکەم بەسەرچاوان
تۆ بڕۆ نانێ بێنە بۆم بەدەوان[6]
چوومە لای نانەوا سەلامم کرد
بۆ کولێرە ئیفای مەرامم کرد[7]
وتی باوکم فرۆشتەنیم نییە نان
بێنە ئارد بۆت بکەم بەنانی جوان
چوومە بەردەم دوکانی یەک عەللاف
وتم ئەی حاجی توونی بەیت و طەواف
هۆقەیێ ئاردی گەندومم بدەرێ
نرخەکەی چەندە پارە بێنمە دەرێ
وتی: ئاردم نییە ئەوی ماوە
موشتەریی پارەکەی هەموو داوە
لای فەلاح بێنە گەندومێکی تەمیز
بۆت ئەکەم زوو بەئارد و نانی عەزیز
چوومە لای فەلاحی خاوەن جووت
مەخزەنی ڕیزق و مەعدەنێکی قووت
وتم: ئەی خۆشەویستی گیانلەبەران



یەک (مەن)م لازمە گەنم بۆ نان
وتی: نەماوە دانە گەندومی پار
زوو بەزوو ڕاکە، بۆم هەتا بازاڕ
بۆم بچۆرە دوکانی ئاسنگەر
پێی بڵێ مامەکەی هونەر پەروەر
داسەکانی فەلاحەکەم بدەرێ
چەند سەپانێکی گرتووە بەکرێ
داسەکانم بگاتە دەست ئەمڕۆ
بەرکوتت بۆ ئەکەم لەبەر دڵی تۆ[8]
چوومە خزمەت جەنابی ئاسنگەر
دیم کزومات و عاجز و موضطەر[9]
باسی داسی فەلاحەکەم لا کرد
لە وەراما ئەویش قسەی وا کرد:
من چلۆن کار بکەم بەلەرز و تا
تاوێ سەرمامە تاوێکیش گەرما
کەس نییە تاکو لای پزیشک ڕاکا
بۆم بهێنێ حەبێکی لەرز و تا
ناعیلاج چوومە لای پزیشکی وڵات
وتم ئەی عاقڵی بەمەعلوومات
بمدەرێ یەک دوو حەببی سڵفاتە
خەستەخانە مەکانی خێراتە
وتی: تاڕێک ئەخەم دەواییێکی باش
ڕاکە بۆم بانگ کە خەلفەیێکی دارتاش
شووشەکەی تێک شکاوە پەنجەرەکەم
تێکی دا «با» کتێب و دەفتەرەکەم
زوو بەگورجی گەیشتمە بازاڕ
چوومە بەردەم دوکانی یەک نەجار
چۆڵ بوو دوکان لە خەلفە و وەستا
وتیان: ئێستە زۆر نییە هەستا
چووەتە لای خەیات و جل ئەبڕێ

بووک ئەهێنێ تەدارەکی ئەکرێ
ناعیلاج بووم لەبەر دوکان وەستام
سەیری خەڵکم ئەکرد وەکو سەرسام
پڕ بوو مەیدان لە لادێی و شاری
هەموو ئاڵاونە یەک بەهۆشیاریی
غەڵبە غەڵب و هەرا هەرای مەردوم
خەوە شیرینەکەی لە دەس کردم
ڕاپەڕیم سەیری خۆم و ماڵم کرد
لەم خەوە دیقەت و خەیاڵم کرد
وتم: ئەم خەڵکە وەحشیی و مەدەنی
ئیحتیاجن بەیەک فەقیر و غەنی
وەکو زنجیرن و تێک ئاڵاون
قاچن و دەستن و سەر و چاون
دەوڵەمەند حەیفە ڕوو نەکاتە فەقیر
بۆ فەقیر نەنگە تەرکی ئەمری ئەمیر
دەوڵەمەند حەیفە کیبر و فیزی بێ
بۆ فەقیر بوخل و ناتەمیزی بێ
تیغی دەستی یەکن غەنیی و فەقیر
شێلراون هەموو بەچەشنی هەویر
جووتیار و شوان و شاه و گەدا
هەموو موحتاجی یەکترن بەخودا

........................................................

* ئەم شیعرە چیرۆک ئامێزە لە ل٦٨-٧٣ی کتێبی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.
(١) مەلایەکی عەصەبی: مەلایەکی تووڕە و لەسەر.
(٢) بەط: مراوی.
(٣) کاشیف = کاشف: بەدەرخەر و بەیان کەر.
(٤) ئەندەکێ: کەمەکی، بڕێ، تۆزێ.
(٥) مەحەللی ئەسەف: شوێنی بەزەیی پێداهاتنەوە.
(٦) بەدەوان: بەگورجو گۆڵی.
(٧) ئیفای مەرام: گەیاندنی مەبەست.
(٨) بەرکوت: بەرکۆڵ.
(٩) موضطەر = مضطر: بێچارە و زەلیل.






## چیرۆکی خێوی ناو مزگەوت و صۆفی کەریمی چەرچی

سەرەتا

ئاشکرایە تەربیەی ژنانمان بۆ منداڵ پەروەردەکردنیان زۆر نوقسانە بەهۆی نەخوێندەواری و هەندێ چیرۆکی هیچوپووچی ڕابوردوو کە بۆمان ماونەتەوە، بۆیێ لە پێشەوە کە منداڵ شیرە خۆرەیە لای لایەکەی بە (گورگانە شەوێ، گورگانە شەوێ) ڕائەبووری، ئینجا کە منداڵەکە نەختێ هۆشی پەیاکرد بەدێو و خێو و جنۆکە و شەوە و شەولەبان خەوی لێ ئەخا، بێگومان ئەم ترس و بیمە لە دڵا ئەمێنێتەوە، گەورەش بێ ناوێرێ هەندێ ئیش بکا چونکە ترس غەریزەیەکی فطریە و لەناوبردنی پێویستترە لە پەروەردەکردنی، وە ئەم لەناوبردنەش ئەبێ لە بێشکە و کۆشی دایک و باوەشی باوکەوە دەس پێ بکا تاکو ئەکەوێتە ساحەی ئیشکردن بەسەربەخۆیی.

ئەفسەرێکی ئەوروپایی ئەگێڕێتەوە ئەڵێ منداڵ بووم لەگەڵ باوکما چووم بۆ دەشت، سەیری دیمەنی گوڵ و گیا و شاخ و ئاومان ئەکرد من لەبەر باوکمەوە ڕام ئەکرد دوور ئەکەوتمەوە ئەهاتمەوە بۆ لای.

جارێکیان ڕام کرد گەیشتمە سەر چاڵ و شیوێک کتوپڕ سەگێ لێم دەرپەڕی، بەترس و گریانەوە ڕام کرد بۆ لای باوکم ئەویش لە باوەشی گرتم دڵخۆشی دامەوە تاکو ترسم بەسەرچوو، ئێستاکە ئەفسەرم لە بۆمبای تەیارە و گوللەی تۆپ و پەلاماردانی دەبابە ترسم نییە بەڵام کە تووشی چاڵ و شیوێک ئەبم ترسی سەگەکەم دێتەوە بیر ترسم لێ ئەنیشێ.

ئینجا ئەبێ هەموو دایک و باوکێک باسی جنۆکە و دێو و خێو بەبەیتی خلە بزانن چونکە هەرچەندە جننی هەن وەکو لە قورئانا ناوبراون، بەڵام گەلێ لە عولەمای ئیسلام ئینکاری چاوپێکەوتنی جنۆکەیان کردووە کەوابوو بۆ ئەوەی هەوڵ بدەن بۆ پێگەیاندنی منداڵەکانیان بەئازایی، ئەم نامیلکەیەم پێشکەش کردن... هیوامە بەتاڵییەک لە کتێبخانەی کوردستان پڕ بکاتەوە.

دانەر ١٩٤٦/١٢/٢

سەد جار بسم الله لە باتی یەک جار
بەبێ ناوی خوا ڕێک ناکەوێ کار
سەد هەزا ڕەحمەت لەسەر پێغەمبەر
کە ئەو چاکترە لە هەموو بەشەر
ڕەحمەت لە ئەصل و لە منداڵانی
لە پاشا، لە بۆ گشت ڕەفیقانی
ڕەفیقەکانی هەموو ئازا بوون
منداڵانیشیان گورج و وریا بوون
ئێمە کە بەناو هەموو ئیسلامین
ئەبێ بەغیرەت هەروەک ئەوان بین

## کوڕە مەترسە

کوڕە مەترسە کچێ مەلەرزە
جێی ئادەمیزاد گەردوونی بەرزە
ئەگەر توو هەتە تەجروبە و ئیمان
هەموو گیانداریّ ئەترسێ لێمان
خوا ئەم ئینسانەی بۆیە دروست کرد
کە هۆشی ببێ و لێکدانەوەی ورد
دروستی نەکرد کە شێتی بکا
دووچاری دەرد و ئەزیەتی بکا
کوڕم مەترسە کچم مەلەرزە
ئینسان شەریفە دەرەجەی بەرزە
باسی جنۆکە و غولی بیابان
قسەی ژنانە هی پیاوی نەزان
دایکت نەفامە عەقڵی نوقسانە
جنۆکە کوانی لە جێ و مەکانە
کە بسم اللەی کرد لەبەر جنۆکە
بزانە دایکت زۆر ترسنۆکە
جننی نابینرێن جسمێکی پاکن
وەک مەلائیکەی نیشتووی ئەفلاکن
ئەو کەسەی بڵێ دیومە جنۆکە
درۆزنێکی زۆر ترسنۆکە
بە خەیاڵ شتی هاتۆتە بەرچاو
ئەڵێ جنۆکەی لێ بوو کانی ئاو
واللە وباللە هیچی نەدیوە
نە لەو کانییە، نە لەو ناو شیوە
هەتا ئەغلەبی عالیمی زۆر چاک
ئەڵێن نەی دیوە سەیدی لەولاک
شتێ کە حەتا (نەبی) نەی بینی
چۆن بۆ ئێمە ئەو خۆی ئەنوێنی



جبریل خەبەر ئەدا بەڕەسول
کە قورئان لەلای کێشە مەقبول
بابیشی بینی ئەو پێغەمبەرە
ئیشی لە عەقڵی بەشەر بەدەرە
کوڕم مەترسە کچم مەلەرزە
خۆت نەفام مەکە بەقسەی هەرزە
(مێردەزمە) کوا ببێ بەبزن
قسەی ژنانە و پیاوی درۆزن
قاچی لە عەردە و سەری لە هەوا
(غۆلی بیابان) لە کوێ بووە کوا؟
ئەمانە هەموو منالّ ترسێنن
مەلای دوعا نووس بۆمان ئەخوێنن
شێخی شێت چاکەر، مەلای دوعا نووس
ڕیایی ئەکەن بۆ پوول و فلووس
شێتی عیللەتە وەک گرانەتا
تۆ باوەڕ مەکە بەقسەی مەلا
ئەڵێت پێی ناوە لە منداڵیان
دەستیان لێ وەشاند لەسەر کانیان
جن دەستی کوانی تا بیوەشێنی
جسمێکی نییە کە بیپوشێنی
وەک مەلائیکەن بێ گۆشت و ئێسقان
بەدەنیان نییە بەڕەنگی ئینسان
جنۆکەی قژن، قژن مل باریک
نە لەکانییە، نە ژووری تاریک
ڕۆڵە مەترسە هیچ لە جنۆکە
هەموو هەڵبەستی زۆر ترسنۆکە
ئەگەر باسیان کرد هی مێردەزمە
تۆ پێ بکەنە بیکە بەگەمە
جنۆکە چۆن خۆی ئەکا بەمار
یا بەپشیلە یا خێوی ناو غار

ئەوا بوو بەمار خۆی کوتا بۆ لات
ئەی سوورەتەکەی خۆی چی بەسەر هات
جننی ناگۆڕێن، گۆڕین مەحاڵە
هەرکەسێ وای گوت قسەی بەتاڵە
هیچ دەست وەشێن نین جنۆکەی فەقیر
هەموو عەبدی خوان بەزکر و تەکبیر
ئەوەی کافرە دەستەی شەیتانە
ئەوەی ئیسلامە دۆستی خۆمانە
کورم مەترسە کچێ ئازابە
لە سەرگوزەشتی کۆن تەوەلا بە
خێوی ناو هۆدە غۆلی بیابان
هێندە درۆیە ناکرێ بەیان
درۆ لەو زلتر باسی شەوەیە
منداڵ خنکێنە ئیشی ئەوەیە
منداڵ نازکە؛ کە هاتە دنیا
بە لووت ئەتوانی هەناسە بدا
شتێ کە بەری هەناسەی بگری
شین ئەبێتەوە ئەتاسێ و ئەمری
ژنانیش ئەڵێن ئەی شەوە گرتی
مامانیش ئەڵێ دیم خرتە خرتی
هەموو بەجارێ ئەبنە درۆزن
بەخوا نەشەوە خۆی لێی دا نەجن
بێ چرا بڕۆ مەترسە بۆ ژوور
ئەمما بێ ڕەفیق مەڕۆ بۆ ڕێی دوور
کتێب گرەکان مەلای زبان لووس
ژن تەفرە دەرن بۆ جەڕی فلووس
کوڕە مەترسە لەو فاڵگرانە
کتێبی بخە ناو ئەدەبخانە
ئیشی سبەینێ هەر خوا ئەیزانێ
مەیکرە ڕمل جەفر بەنانێ



دینەکەی ئێمە بێ غەل و غەشە
ئەوەی لێی لادا بەخوا ڕووڕەشە
خێڵی جنۆکە ناچن بۆ کوێستان
یا بۆ گەرمیان لە وەختی زستان
کە سەرما و گەرما نەزانن چییە
ئەم هاتوچوونەی بڵێ بۆ چییە
ڕۆڵە مەترسە لەم قسەو باسە
قسەی کەسێکی بێ مێشک و کاسە
کە کەسێ وتی ئەم ڕۆژە شوومە
بزانە ئەوە قسەی مالومە
چونکە موسڵمان عەقیدەی پاکە
شەمە و یەک شەمەی هەموو لا چاکە
چاکی و خراپی راجع بەخۆتە
بەناحەق لە دەست شەممەر و ڕووتە
قەل ئەقیرێنێ بۆ پێت ناخۆشە
منداڵ ئەپژمێ بۆ ئیشت بۆشە
تووشی ڕێوی بی بۆچ کارت چاکە
ئەگەر کەروێشکە بۆچی هیلاکە
گەرمات تووش بێ سەفەرت باشە
وا دڵت خۆشە ئەڵێی یولداشە
ئەمانە قسەی پیاوی نەفامە
باوەڕ بەمانە شەرعەن حەرامە
ڕۆڵە سڵ مەکە لەم قسانە
هەموو بە بەیتی خلەی بزانە

## سەر گوزەشتەی خێوی ناو مزگەوت

مزگەوتێ ئەبێ دوور لە ئاوایی
عیبادەتخانەی ذاتی خودایی
خەڵقی دێ بۆ نوێژ ئەچوونە ئەوێ
ڕایان ئەبوارد تا نیوەی شەوێ

له تەنیشت مزگەوت دوو هۆدە هەبوو
غەریبە و میوان بۆ خەوتیی ئەچوو
یەکێکیان ئاوا یەکێکیان وێران
پڕ لە سیسرک و قالۆنچە و ماران
کەس نەی ئەوێرا بەشەو تیا بنوێ
ئەیان گوت خێوی هەیە بەشەوێ
چونکە یەک دوو کەس، تیایا مردبوو
بەخێودار هودە، ناوی سەند بوو
شوهرەتی خێوی ئەو ژوورەی مزگەوت
کەوتە دنیاوە هەیبەتی سەرکەوت
پیاوێکیش ئەبێ فەقیر و کەساس
بێ کەوش و کەڵاش بێ کەوا و کراس
لەبەر فەقیری بێزار بوو لە خۆی
خوا نانی بڕی پێغەمبەریش دۆی
بیستبووی ناوی ئەو ژوورە پیسە
وتی: چیمە لەم ڕیس و گوریسە
من کە بێ ئاو بم منداڵم بێ نان
ئەچمە ئەو ژوورە تەسلیم ئەکەم گیان
سەری ڕێگای کرد تا هاتە مزگەوت
شەو چووە هۆدە بۆ خۆی تیایا خەوت
لە نیوە شەوا شتێکی دی هات
چووە گۆشەیەک لێی ڕاکشا مات
کابرا کتوپڕ بەدەستە و خەنجەر
لای دەرگاکەی گرت کە نەچێتەدەر
بوو بەنۆبەچی ئەو شەوە نەنوست
بزانە چۆنە خێوی بەد سروشت
کە ڕۆژ بووەوە، دنیا ڕۆشن بوو
لێک ئاشکرایی دۆست و دوژمن بوو
پیاوە سەیری کرد سەگێکی بێ فەر
لێی ڕاکشاوە لات و لەڕ و گەڕ



وتی ئەوانەی شەو لێرە نوستوون
هەموو لە ترسی سەگەگەڕ مردوون
وایان زانیوە کە ئەوە خێوە
لە ترسا گیانیان چووە لە جێوە
ڕۆڵە واهیمە ئینسان ئەکوژێ
وەکو گیانلەبەر خوێنی ئەمژێ
مەیخەرە دڵت واهیمە و خەیاڵ
واهیمە گەورەش ئەکا بەمنداڵ
ڕۆڵە مەترسە لە خێو و لە دێو
نە لە ئاوایین نە لە شاخ و کێو
بدەرە قسەی پێشینان سەرنج
دێو لە کوێ بووە لە کوێیە درنج
تاریخی عەجەم قسەی جوولەکە
دێو و درنجیان کرد بەتۆڵەکە
ئەڵێن دێو هەموو وان لە کێوی قاف
پێی باوەڕ ئەکا نەفامی دڵصاف
کێوی قاف ئەڵێن بەدەوری ئەرزا
ئیحاتەی داوە دێو لە جێی بەرزا
هەرچی مناڵی ئێستا بخوێنێ
درۆی وا زل! زل هیچ ناسەلمێنێ
خوێندەوارەکانی دەوری پێشوو
زوو تابع ئەبوون بەوتاری جوو
ئەیان خستە ناو کتێبی خۆیان
قسەی جوولەکە و ئیران تۆران
ئێستا کەوا هۆش کراوەتەوە
کەس دەرگای درۆی زل ناکاتەوە

## ڕۆڵە بخوێنە

ڕۆڵە مەترسە کوڕم بخوێنە
لەناو عالەما زوو خۆت بنوێنە
ئەگەر کەڵوڕی، ئەگەر بڵباسی
کە خوێندەوار بووی ڕێی خۆت ئەناسی
بەڵام ئایینی ئابائوو ئەجداد
تۆ مەیدە بەباد وەک ڕەنجی فەرهاد
ئایینی ئەوان بگرە بخوێنە
بە خوێندن کارت ڕەونەق ستێنە
عادەت و کردەی باو و باپیرت
غەیبەتی مەکە حەڵاڵ کە شیرت
هەر دینێکیان بوو بگرە ئەو دینە
ئەمە ڕەوشتی قەومی دووربینە
میللەتی ژاپۆن کە زۆر پێشکەوتوون
لەسایەی عیلم و مەعریفەت دابوون
لەگەڵ ئەم حاڵەش کەوا زۆر بەرزە
شوێن عاداتی کۆن لەلایان فەرزە
دین و ئایینێ کەوا بوویانە
تێکیان نەداوە هەر لەم زەمانە
پادشای خۆیان لەلایان خوایە
هەندێ ڕووی لە بت، هەندێ لە گایە
بەشی زۆر کەریان کە گاپەرستن
دائم خەریکی کاری دروستن
خیرافاتی سەد هەزارساڵەیان
هەر ماوەتەوە لای پیر و جەوان
ئەتۆش بەخوێندن هیچ مەغروور مەبە
لە دینی باو و باپیر دوور مەبە
عیلمت بخوێنە دینیش ڕاگرە
دین بەکردەوەی چاکت لە ڕێی نیفاقت



دینە ئەمر ئەکا بەئیتفاقت
دینە مەنع ئەکا لە ڕێی نیفاقت
دینە ئەمرەکا لە شەڕی دوژمن
ببە بەقەڵغان بۆ پاسی وەتەن
دینە ئەمرەکا بەیاریدەدان
لەگەڵ یەکتری وەختی لێ قەومان
گاور و جوولەکە و هیندی و ژاپۆنیا
لەسەر ئایینی ئەون لە دنیا
تۆش موسڵمانی ئایینی ئیسلام
فەرامۆش مەکە ئیتر وەلسەلام

## سەرگوزەشتەی خوشک و برایەکی ئازا

کوڕم بۆت ئەکەم حیکایەتی خۆش
تۆش گوێی لێ بگرە و وریابە و بەهۆش
زەمانی پێشوو لە بەینی دوو کێو
دێیەک کرابوو وەک بارەگای دێو
دە پازدە خانوو خەڵقی تێدا بوو
ئیشی گەورەیان ڕاوی دەعبا بوو
بە چەک ئەیان کوشت حەیوانی کێوی
بە تەڵە دانان دەڵەک و ڕێوی
بە پارەی پێستی ئەم حەیوانانە
ڕایان ئەبوارد هەموو شاهانە
مام سەلیم ناوێ ماڵی لەوێ بوو
لە پاش کوێخاکە گەورەی ناو دێ بوو
تەنیا کوڕێک و کچێکی هەبوو
لەو وڵاتەیا وێنەیان نەبوو
کوڕ ناوی سەردار کچیش گوڵبەهار
کوڕ بێچووە شێرێ کچ گوڵی بەهار
کچی کوێخای دێش ناوی خونچە بوو
نازک و نازدار خاوەن لەنجە بوو

هەموو ڕۆژ بۆ لای گوڵبەهار ئەچوو
تەنیا گوڵبەهار دەستە خوشکی بوو
غونچە و گوڵبەهار بەڕۆژ و بەشەو
لای یەکتری بوون غەیری وەختی خەو
لەم هاتوچۆیەی خونچە و گوڵبەهار
سەودای کەوتەسەر بێ چارە سەردار
بەداوی زولفی خونچە وا گیرا
نەدەهات هیچی تری بەبیرا
تیری مۆژگانی بریناری کرد
بە غەم و غەمزە گرفتاری کرد
لە حاڵی سەردار خونچە بێ خەبەر
نەیزانی گرێی خستۆتە جگەر
خونچە وەک پەیکان چەقیبووە دڵی
نە دەنیشتەوە گریان لە کوڵی
ئاخیری خونچەیش بەعیشقی سەردار
بوو بەقومری شەیدایی سەردار

**باسی سۆفی کەریمی چەرچی**

صۆفی کەریم ناو ئەهلی گەرمیان
بۆ پێستە کڕین ئەچوو بۆ کوێستان
هەموو ساڵ ئەچووە دێیەکەی ناو کێوان
لەماڵی سەلیم ئەبوو بەمیوان
شتی گەرمیانی ئەبرد بە دیاری
خۆی خۆشەویست کرد خۆی کرد دیاری
پیستەی ئەکڕی هەرزان و گران
هی ڕێوی و دەڵەک هی بزن و بەران
لە پاش چەند ڕۆژێ ئەگەڕایەوە
بۆ وڵاتی خۆی ئەکشایەوە
چەند ساڵ بەم نەوعە هاتوچۆی ئەکرد
بنای دۆستی بۆ ئاسمان ئەبرد



بوون بەئاشنا سەلیم و صۆفی
صۆفی لەو ناوە هیچ نەما خۆفی
هەروەکو برا وابوون لەگەڵ یەک
کاریان ڕێک ئەخست هەردوو بەکۆمەک

**صۆفی کەریم خوازبێنی گوڵ بەهار ئەکا**

ڕۆژێ بەجووتە سەلیم و کەریم
هەردوو نیشتبوون بێ غائلە و بیم
ڕووی کردە سەلیم صۆفی بەخۆشی
وتی ئەی ڕەفیق تۆ ساحێب هۆشی
تێکەڵی و خۆشی دیاربوو مەحەبەت
من وام پێ خۆشە هەتا قیامەت
لەگەڵ یەکتری ببین بەخزم
بەرز بینەوە لە جێگای نزم
کچێکم هەیە زۆر جوان و نازدار
لە دڵی خۆما داومە بەسەردار
بۆ کوڕەکەی من ئەگەر گوڵبەهار
ئەتۆش بیبەخشی زۆر جوان ئەبێ کار
مام سەلیم وتی ئەی یاری هەمدەم
فکرەکەت جوانە پەسندی ئەکەم
بەشەرتێ سەردار لێم نەکا گلە
من ڕەزامەندم بەم معامەلە
لەوکاتە سەردار هاتە ژوورەوە
دانیشت لەلایان بەسوورەوە
لەلای سەرداریش ئیش ئاشکرابوو
سەردار لە وەزعی خۆی هیچ تێک نەچوو
وتی مەمنوونم بەئیشی وا باش
خزمایەتیمان بێ لەمەو پاش
سەلیم و کەریم ببن بەبابم
هەروەک شازادەی عالی جەنابم





گەر ئەتانەوێ ئیش چاک ڕێکخرێ
من وام پێ خۆشە بەم ڕەنگە بکرێ
گوڵبەهار بەشی مامە کەریم بێ
سەرداریش جارێ بەشی سەلیم بێ
یەعنی ئێستاکە من ژن ناهێنم
شووشەی ئازادی خۆم ناشکێنم
ئەمما من ڕەزام خوشکم گوڵبەهار
لە ڕێی صۆفیا بکرێ نثار
لەسەر ئەم قەولە هەرسێ ڕازی بوون
با خسۆس سەردار دڵشاد و مەمنوون
چونکە بەدوای خونچە گیرابوو
بەبۆنی خونچە مەست و شەیدا بوو
گوڵبەهاری کرد بەفیدای خۆی
تا دڵی نەشکێ خونچەی عەتر بۆی

### گواستنەوەی گوڵ بەهار

مودەی سێ چوار مانگ ڕۆیی هاوین هات
صۆفی کەوتە خۆی بۆ تدارەکات
هەرچی پێویستە بۆ ئەسپابی بووک
چوو هەمووی کڕی لە بەغدا و کەرکووک
لەگەڵ چەند سوارێ لە خزمی خۆیان
بەرەو کوێستان بوون لە ناو گەرمیان
ڕۆیشتن هەتا ماڵی مام سەلیم
دابەزین لەوێ بەقەدر و تەعزیم
حورمەتیان گیرا بەمیوانداری
کچیان مارە کرد بەئەمری باری
ئەمجا بەجارێ ڕووەو گەرمیان
خستیانە ڕێگا بووک و بەربووکیان
بەشادی و خۆشی نزیک بوون لەماڵ
زاواش لەولاوە هات بۆ ئیستیقبال





بووکیان گەیاندە ناو دیو ئاوایی
دەهۆڵ و زوڕنا حازر بۆ شایی
سە شەو و سە ڕۆژ هەر هەڵپەڕین بوو
بەرگی ژن و پیاو سوور و ڕەنگین بوو
لە پاش سە ڕۆژە شایی بڕاوە
خەڵکی و دێ و ئەتراف کەوتە بڵاوە
گوڵ بەهار لە ماڵ کەوتە ئیش کردن
بوو بەئاغاژن بۆ کردە و بردن
مودەتی سە ساڵ لە گەرمیان بوو
دوور لە باوک و قەوم و خۆیشان بوو
بوو بەخاوەن کوڕ خوا کوڕی دایێ
هەر ئەی وت بۆچی کاکیشم نایێ
زۆر ئارەزووی بوو ئیزن وەرگرێ
باوەخوون بکرێ کوڕیشی بەرێ
نەشەو خەوی بوو نە ڕۆژ ئارام
هەر ئەیوت لە کوێن باوک و برام

### باوەخوون کردنی گوڵ بەهار

لەلای مێردەکەی لەلای خەزووری
گوڵبەهار ئەی کرد شەکوا لە دووری
دووری لە باوک و برا و کەسوکار
گرێی خستە دڵ هیچ نەی بوو قەرار
ڕۆژێ خەزووری وتی کچی خۆم
تۆ خۆت نایزانی من خەمت ئەخۆم
ئێستا هاوینە وادەی خەرمانان
دەستمان ڕایی بێ لە کار و فرمان
شەرتە ئارەزووت بەجێ بهێنم
بە مەخسودی تۆ ئیش ڕاپەڕێنم
ئیتر گوڵبەهار بەوەعدەی خەزوور
هیوای پەیدا کرد بۆ دڵی ڕەنجوور

که هاوین نەما خەرمان هەڵگیرا
بۆ تۆوی تازە جووتیش بەسترا
شنەی بای پایز دنیای فێنک کرد
گوڵاڵە سوورەی سەری دەرهاورد
گەڵای زەرد و سوور لەناو ڕەزانا
زەینەتی بەخشی بەسەر خەزانا
پەڵێ پایزیش هەروەک بەهارە
شاخ و دەشت و باخ هەمووی گوڵزارە
بە وەعدەی خەزوور گوڵبەهار دیسان
ماڵ و مێردەکەی خۆی کرد هەراسان
لە پایزیش ڕۆیی مانگێکی تەواو
شەوێ دانیشتن کۆمەڵی ژن و پیاو
مێردەکەی وتی لەبەر مەڕ و جووت
لەبەر تێکۆشین بۆ ئیدارە و قووت
لەگەڵ گوڵ بەهار بچم بۆ سەفەر
چوونی من بابە زەرەرە و خەتەر
ڕەنجبەرەکەمان یەکجار بەکارە
خانە زەمانە، تەواو هۆشیارە
با هەر ئەو بچێ چونکە ئەمینە
بۆ سەرما و سەختی ڕێگای بەتینە
باوکیش ڕەزا بوو بەقسەی کوڕی
هاتە جواب و قسەکەی بڕی
وتی زۆر باشە بۆ ئەم سەفەرە
چونکە مەحرەمە ئیشی ڕەنجبەرە

**کەوتنە ڕێگای گوڵ بەهار و ڕەنجبەر**

بارانی پەڵە لە هەر لا باری
گوڵبەهار ئینجا ڕێک خرا کاری
توێ شووی ڕێگای کرد کولێرە بەڕۆن
قەراری وا دا کە بەیان بڕۆن





خۆی و ڕەنجبەری و کوڕی نازداری
سەری ڕێیان گرت بەهۆشیاری
ڕەنجبەریش کە کوڕی ئەگەر تەکول
جارجار گۆرانی جارجار بۆڵەبۆڵ
هیچ مەحرەم نەبوو ئەو حەرامزادە
بۆ خیانەتی دائم ئامادە
سەگی نائەمین دڵ پیس و مەلعوون
بەسوورەت ئینسان بەسیرەت مەیموون
دێ بەدێ هاتن بەسواری و بەپیان
هەتا کوێستان خۆی دەرخست بۆیان
شەوێ مانەوە لە یەک ئاوایی
ئەو شەوە گۆڕرا هەوای دنیایی
بەفر و بای سەخت شاخانی پڕ کرد
بوو بەیەک پارچە دەشت و تپە و گرد
سێ ڕۆژ مانەوە لە ترسی سەرما
ڕۆژی چوارەمین کەوتنە ڕێگا
ئەو ڕۆژەش ڕۆیین بەدڵ و بەگیان
سێ چوار سەعاتی مابوو مەنزلیان
هەواکەی گۆڕی هەورێکی هێنا
با، بوو هاودەمی بەفری دەهێنا
سەعاتێ ڕۆیین بەفر هەر باری
کەسیرە کەوتن، کەوتنە زاری
گوڵبەهار وتی ئەشکەوتێ بەردێ
ئەمن شارەزام بابچین بۆ ئەوێ
ڕەنجبەری مەلعوون منداڵی هەڵگرت
گوڵبەهار ڕێگای ناو ئەشکەوتی گرت
بە هەر حاڵێ بوو گەیشتنە ناو غار
دەسو پێی تەزی و لەشیان پڕ ئازار
کوڕیش لە باوەش دایکی نوستبوو
یا ماری ئەجەل لەشی گەستبوو

ڕەنجبەر برسی بوو وتی ئەی خانم
کولێرە و خورما لە کوێیە گیانم
گوڵبەهار نان و خورمای بۆ دانا
وتی تۆ بیخۆ هەتا توانا
دەسی بەخواردن کرد ئەو بێ دینە
دەمی لێ بادا هەروەک ماکینە
کە ورگی پڕ بوو لە خواردەمەنی
سەری دەروونی کرد بەعەلەنی
وتی ئەی خانم ئەمن ڕسوای تۆم
لەو ساتەی دیومیت شێت و شەیدای تۆم
ئەگەرم تەسلیمم ئەبی لێرانە
گیانی شیرینم بۆ تۆ قوربانە
گوڵ بەهار وتی توو ویژدانت بی
یادی نیعمەت و ئاو و نانت بی
بە نان و نیعمەت گەورە کراوی
سەگ مەبە و سپڵە ئەگەر تۆ پیاوی
وتی ئەمانە هیچیان نازانم
ئەتکەم بەفیدای تیغی دەبانم
خۆت و کوڕەکەت یەک یەک ئەکوژم
لە پاش کوشتنتان خوێنتان ئەمژم
بە ئاگری عیشق تۆ منت سووتاند
بۆ جێیەکی وا تالع تۆی گەیاند
ئینجا گوڵبەهار زۆر پاڕایەوە
ئەو هەر بەتوندی جوابی دایەوە
پەردەی بێ شەرمی بەجارێ دڕاند
پەلاماری دا کوڕەکەی فڕاند
خەنجەری کێشا زوو سەری بڕی
سەری بۆ هاوێشت خەنجەری سڕی
وتی لە پاش ئەم نۆبەتی تۆیە
وەقتی تەسلیمە نەک هی ڕۆڕۆیە



خانم بەدڵی پڕ لە ئێشەوە
بە عەقڵ و تەدبیر هاتە پێشەوە
وتی عەزیزم تۆ بێ ئارامی
من زوو زانیومە کە تۆ شەیدامی
منیش لە دڵدا بوومە بریانت
هەزار مێرد ئەکەم هەر بەقوربانت
با کوڕیش نەبێ من هەر تۆم ئەوێ
دەستت لەملان و لە ئەستۆم ئەوێ
بۆ هەر کوێ ئەچی منیش بەچاوان
شەرتە نەچمەوە بۆماڵی باوان
بەقسەی میچکە میچکەی ژنانە
لەکەڵ داییەزاند ئەو سەگ شەیتانە
هاتەوە سەر خۆی مەلعوونی غەدار
بەخەندە وتی بەخوا گوڵ بەهار
ئەگەر ئینکاریت هەر بکردایە
تۆشم شەق ئەکرد هەر لەم جێگایە
چووە پێشەوە بۆ لای گوڵ بەهار
بەشێوەی عاشق بەڕەنگی دڵدار
گوڵ بەهار دەستی خستە ناو دەستی
دەسبازی ئەکرد بەڵام بەسستی
وەهای خەڵەتان هیچ نەیما خەبەر
گوڵ بەهار لە پڕ فڕاندی خەنجەر
مەردانە کێشای خەنجەر لە کاڵان
دای لەسەر دڵی کوشتی بێ ئامان
لە شاخ و لە دەشت دەنگی ئافەرین
بەرز ئەبووەوە تا چەرخی بەرین
ئەنجا بەتەنیا و لەو غارە دابوو
لەگەڵ جەنازەی کەوتووی دوو مردوو
ترسی دڕندە غائیلەی دەروون
خەوی لێ زڕان تا ڕۆژ ئەبێ ڕوون

## گرەوکردنی کوێخا لەگەڵ سەردار

هەموو شەو بۆ نوێژ ئەهلی جەماعەت
کۆ ئەبوونەوە بۆ ذکر و تاعەت
لە پاش نوێژکردن بە درشت و ورد
لە گوێ کوورەکە خەیاڵیان ئەکرد
قسەی ڕابردوو ئەگێڕایەوە
مەردی و نامەردی ئەبێژرایەوە
یەکێکیان هەستا چووە دەرەوە
گورج هاتە ژوورێ هاتە بەرەوە
وتی شەوی وا نەبووە لە دنیا
بەفر ئەبارێ لەگەڵ کزەی با
ئەمشەو شەوی کوڕی ئازایە
شەوی دڕندە و ورچی سارایە
ئەمشەو با هەموو لێرە دانیشین
شەوچەرە بخۆین سیغار بکێشین
لەم خەبەردانە کوێخاش بۆی هەستا
چووە دەرەوە لە هەیوان وەستا
لە پاش زەمانێ هاتەوە ناویان
وتی کوڕینە ئەی هەرزەکاران
هەر کەس لە ئێوە ئازایە بەشەو
بێ لەگەڵ منا بکا یەک گرەو
ئەمشەو بگاتە ئەشکەوتی بەردێ
لەوێ نیشانەی گەیشتنی دانێ
شەرتە ئەو کوڕە بکەم بەزاوام
بۆ جل و بەرگیش هیچ نەبێ دەعوام
لەناو کۆمەڵێ کوڕ و هەرزەکار
چاپوک ڕاپەڕی شێرانە سەردار
وتی شاهێدبن خوێنم لەسەر خۆم
بۆ ئەم گرەوە شەرتە من ئەڕۆم



مام سەلیم وتی ڕۆڵە دانیشە
جەرگم لەت مەکە ئەتوو بەم ئیشە
وتی بابەگیان عەرد و عاسمان
گەر لەیەک بدەن ئەڕۆم ئەلئان
ڕووی کردە ماڵێ کالەی داپێچا
خۆی پێچایەوە چەکی لە خۆی دا
بەعەشقی خونچە دنیای بەهار بوو
لەبەر چاوی هەر لالەزار بوو
وتی سەر لەڕێی جانانا دانان
یەکجار بەجێیە زۆر سەهل و ئاسان
هەرچەند شەوی سەخت بەفروسەرما بوو
بەشەوی زفاف قەرار درابوو
ئەم دڕندە بوو؛ بۆ ورچ و بەراز
لە داوێنیەوە ڕووی کردە هەوراز
مەردانە بەناو بەفردا سەرکەوت
دوو سەد هەنگاوی مابوو بۆ ئەشکەوت
گوڵ بەهار فەرقی بەتەقەی پا کرد
خەنجەری هەڵگرت خۆی مهەییا کرد
سەری ڕەنجبەری بڕی دەسبەجێ
وتی دڕندە پێوە خەریک بێ
لە ئەشکەوتەوە فڕێی دایە خوار
نەختێ ڕاوەستا لەو جێی سەردار
کە ڕوانی سەری بڕاوی تازە
بۆی فڕێ درا هات لەو هەورازە
هیچ گوێی نەدایە هەر تەکانی دا
نەترسی هەبوو نەوچانی دا
گوڵبەهار کە دی هەر دێ بەزشتی
دەستی ڕەنجبەری بڕی هاویشتی
سەرداریش ئەمجا وەکو شێری ڕاو
ڕوانی وا بۆی هات دەستێکی بڕاو

بانگی کرد دێوی خێوی لە ئەشکەوت
شەرتە بەقەمە بتکەم لەت لەت
گوڵبەهار دەنگی برای خۆی ناسی
بانگی کرد ئەمجار زۆر بەکەساسی
کاکە گیان بەخوا نە دێوم نە خێو
من خوشکی خۆتم گیراوم لە کێو
سەردار لەم قسە هەر واقی وڕما
نەیما غائیلەی دڕندە و سەرما
دووبارە وتی شەیتانی یا جن
بۆ نووکی خەنجەر ئەتکەم بەهەرزن
وتی کاکە گیان من گوڵبەهارم
جن و شەیتان نیم خوشکی نازدارم
بۆ ماڵ ئەهاتم وا لێم قەوماوە
زوو فریام کەوە جەرگم براوە
ئەمجار سەرداریش وتی خوشکی خۆم
هیچ ترست نەبێ پشتیوانی تۆم
چووە پێشەوە مەردانە سەردار
دەس لەملان بوون لەگەڵ گوڵ بەهار
لە پاش دانیشتن لە ئیش گەیشتن
ئینجا هاتنە سەر باسی ڕۆیشتن
وتی خوشکی خۆم لای پیاوی مزگەوت
گرەوم کردووە کە بێمە ئەشکەوت
هەستە با بڕۆین زوو بۆ ئاوایی
لێرەبی ئەشیا هەتا دوایی
خوشکی دایە پێش هات وەک ئەژدیها
نە پرسی لە کێو لە بەفر و سەرما
خۆی و خوشکەکەی چوونە ناو مزگەوت
ئەهلی جەماعەت کە چاویان پێ کەوت
هەموو شپرزان لەم وەزعە دییان
بەجارێ کردیان ماندوو نەبوونیان



لە پاش زەمانێ زانیان هەموو
حاڵی براو خوشک کاری ڕابوردوو
کوێخا کەزانی لە حاڵ و ئەحواڵ
ناردی مەلایان دەرهێنا لە ماڵ
کچی مارە کرد لە سەرداری شێر
وتی لە دنیا هەروا ئەبێ نێر
کردیان بەشایی و بەزم و ڕەشبەڵەک
دەنگی هەلهەلە گەیشتە فەلەک
ئاوازەی سەردار کەوتە دنیاوە
هەر ئافەرین بوو لە هەموو لاوە
ڕۆڵە مەترسە کچم مەلەرزە
ئینسانی ئازا حورمەتی بەرزە

## تێهەڵکێش لەسەرشیعرێکی حافزی شیرازی*

دەخـــیلت بم وەرە ســـاقی «أدر کـــأســـاً وناولهـــا»
غەم و غـوصـصـەی دڵم کە بوو «ولی أفتـاد مشکلها»
ئومـێدی بۆیی مـیـشکم بوو «صـبـازان طره بگشـاید»
کـەچی نەمـزانی بەم دەردە «چ خـون أفـتـاد در دلهـا»
لە بەحری عـەشق و خەوفی مەوج «گردابی چنین هائل»

**

بە هاواری دڵم ناگـــەن «ســـبک باران ســـاحلهـــا»
لە ئەووەڵ عەشقی خۆم هون کرد «ببد نامی کشید اخر»
چلۆن پەنهـان ئەبی سـیـڕڕێ «کـز و سازند مـحـفلهـا»
بلـێ بمرە ئەبێ بمرێ «گـــرت پیـــر مـــغـــان گـــوید»
کـە ڕەهبـەر خـۆی خـەبەر دارە «ز راه و رسم منزلهـا»

**

لە هیـجـرانی ئەتۆ بۆ من «چه أمن و عـیـش چون هردم»
ئەجەل بانگمـان ئەکا دەم دەم «کە بربندید مـحـملهـا»
ئەگەر تۆ (زێوەر)ی عـەشقی «ازو غـائب مشو حـافظ»
کـە یارت بۆ سـەفـەر ئەڕوا «دع الدنیـا وأمـهـلهـا»

---

* ئەم شـیـعـرە لە ل١٢٦-١٢٧ی کـەشکۆڵی نەجـمـەدین مـەلا (أ)دا نووسـراوە هەروەها لە ل٥ی کـەشکۆڵی (ب)یشـدا نووسراوەتەوە. شایانی باسە کە تێهەڵکێشەکەی حافزیش لەسەر شیعرەکەی یەزیدی کوڕی (مەعاوییە)یە.

## پێنج خشتەکی* لەسەر هەڵبەستێکی (مەلا ڕەشید)ی لاوە کە نازناوی (مائیل) بووە**

ئەم تفـەنگی دەسی شـێخ قـادرە مـارمـێلکە تەزێن(١)
لازمـــە هەجـــوی بکەم لایقی وەســـتـــایە جـــوێن
بیـــبـــەنە گـــوڵ عـــومـــەر و بیـــخـــەنە ناو ئاوی دەڵـێن
چ تفـــەنگێکە بەشـــەرت قـــابیلە بۆ داری کـــولێن
تا بلـێی قـورس و شکاو و بەدوو فـیـشـەک نەتەقـێن

**

سەیری فـیشەکلەغـەکەی خۆشە کە ڕەق بوو بە هەتاو
شـەمـسـیـیـە فـیـشـەکی دەرنایە بە سـەعـیـێکی تەواو





فـــیـــشـــەکی گـــوللە شل و ئەغـــڵـــەبی بارووتی ڕژاو
سـەیری فـیـشـەکلغـەکـەی کـەن لە دووسـەد لاوە دڕاوە
فـــیـــشـــەکی قـــەڵب و قـــەباغی ڕەش و دوژمـن نەتڕێن

**

ئەمـــــە کـــــاری چ نەزانـێکە بڕۆ بیـــــبـــــەرەوە
گـــەر نەیانگـۆڕییـــەوە هەســـتـــە لە نۆدێ وەرەوە
نەگـــبـــەت و شـــوومـــە بەئومێـــدی نەچێـــتـــە دەرەوە
وەرە (قـــادر) بەقـــســـەم کـــە نەتەوێ بیـــبـــەرەوە
نەقـــیـــزەی جـــووتی گـــەلێ چاترە وەک خـەڵکی ئەڵـێن

**

ئەوی کـــــردوویە بەشـــــاگـــــردەوە قـــــابیـل بەشـــــەقن
هەرچی ئەجزای کە هەیە هەجـووی بکەم موسـتـەحەقن
جـەڕ شل و دەرزی کـول و خـانە سـواو جـوملە شـەقن
قـۆڵ و پاش و مـاشـەکەی و لوولەکەی هەر سێ ئەلەقن
شـەقـشـەقـەی چاکـە حـەقـیـقـەت ئەمـەتە قـۆڕی تڕێن

**

فەردی تەنهـا نیـیـە، هیچ جینسی نیـیـە، نەوعی نییە
گـەر تفـەنگ دەست نەکـەوێ مـوشتـەریی بەیعی نییـە
گـوللەکـەی وەک پەلەپیـتکە ئەثەری قـەطعی نیـیـە
لوولەکـەی بۆ کلکی تەورداس نەبێ هیچ نەفعی نیـیـە
بۆ چەقـۆ گـەر دەس ئەدا، بۆ دەمـەکـەی کـوورە دەمـێن

**

هەر ســـوپاهێ کـــە لە ئەوقـــاتی مـــەســـافـــا ڕیزن
ئەمـــەیی تێ بکـەوێ هەروەکـــو مـــانگای حـــیـــزن
گـــونی فـــیـــرعـــەون بەکـــونی خـــانی کـــە هەر ناچیـــزن
کـەچەڵ و گـێـچەڵ ئەبێ هەردوو بەجـووت تێی مـیـزن
ئەوی کـــردوویە بەدڵ گـــووی ســـەگی هەوشـــاری بەڕێن

---

* ئەم پێنج خشتەکییە لە ل٢١٤-٢١٦دا هەیە.

** مەلا ڕەشیـدی لاوە: کوڕی لاوەی قـاوەچییە لە شاری سلێمـانی هاتۆتە دنیـاوە. بەکوردی و بەفـارسی و تورکی شیـعری

گوتووه وەکو دەڵێن: مەلا ڕەشید پیاوێکی سەرچڵ بووە لە بارودۆخێکی نادیارا ساڵی ١٣٢٠ک ١٩٠٢ز کوژراوە.

(١) وەکو مامۆستا نەجمەدین مەلا لە پەراوێزی کەشکۆڵەکەدا نووسیویەتی: «ئەم هەڵبەستە لەسەر ئەم چیرۆکەیە جارێک مامۆستا زێوەر لە تەک شێخ قادری سەرکار و شاعیر مەلا ڕەشیدی مائیل ئەچن بۆ چیای گۆیژە بۆ ڕاو، وا ڕێ ئەکەوێ لە بەیانییەوە تا ئێوارە ئەگەڕێن نێچیریان بەلووتەوە نابێ، دەمی ئێوارە ئەگەڕێنەوە لە بناری گۆیژە شێخ قادر تووشی تۆڕی (مارمیلکەییێک) ئەبێ تفەنگێکی تێ ئەگرێ قۆڕییەکە ئەهنگێوێ ئەمجا مەلا ڕەشید چەند شیعرێک لە هەجوی تفەنگەکەی شێخ قادر ئەڵێ زێوەریش ئەیکا بەپێنج خشتەکی.

## پێنج خشتەکی لەسەر هەڵبەستێکی (نسیب)

فیراقی دیدەیی مەه ڕووت وەکو سایەی زەمین پەستە
وەها پەستە ئەبەد بێ دەستە سەد عیسا بلێ هەستە
عیلاجم کە بریندارم نیشارت دڵ ئەگەر بەستە
فیدات بێ ڕۆحی شیرینم نەظەر سوویی دڵی خەستە
بە لوطفت چاک ئەبێ قوربانی تۆ بێ ئەم دڵی خەستە

**

لە عالەم غافڵم گیراوی چاوی بووم و موژگانی
بریندارە سەراپا دڵ بەزەربی نووکی پەیکانی
نییە باکم لە قەولی موددەعی و تانەی ڕەقیبانی
ئەمن مەستی شەرابی لێوی بووم و چاوی فەتتانی
کەچی وام پێ ئەڵێ بێ فەڕ، شەراب خۆریش‌و سەرمەستە

**

ئەگەر تۆ ئیلتیفاتت بێ لەگەڵ ئەم عاشقە کەم کەم
هەموو ئەتوێتەوە یەک یەک لە کوورەی سینەما غەم غەم
وەکو موشتاقی زامم ئیحتیاجیشم بەمەرهەم هەم
بکە ڕەحمێ بەحاڵی ئەم گەدایە چونکە کەم دەستە

**

هەمـوو عالەم ئەزانێ ئەصڵی من ساداتی (نۆدێ)یە
بە موژگان کوشتمی و پێم ئەڵێ: ئاخۆ ئەمە کێیە
بەوەڵڵا قاتیلی من دال و لام و بێ لەگەڵ ڕێیە
لە ڕۆژی حەشرەدا گەر لێم بپرسن قاتیلت کێیە؟
ئەڵێم کەس قاتیلی دڵ نەبووە ئیللا یاری چاو مەستە
چییە زێوەر! بەدائیم موبتەلای زوڵف و ڕۆخ و چاوی



لە ئەرباب و ڕەفیقانت کە دوورکەوتی و بەجێ ماوی
ئەوە ڕێگا نییە داوە ئەتۆش بەو داوە بەساوی
بە دائیم موخلیصی (زێوەر) بە ئەی کاکە هەتا ماوی
لە کاک ئەحمەد تەمەننای بۆ بکە ئەمڕۆ دەسا هەستە

## پێنج خشتەکی لەسەر هەڵبەستێکی شێخ ڕەزای تاڵەبانی

ماندووم لە سەفەر دیومە گەلێ ڕەنج و هیلاکی
بۆ چیمە تەماشای سەماوات و سەماکی
حاشا لە گوڵ و گوڵشەن و جێگەی خۆش و پاکی
مەربووتە حەیاتم بەسولەیمانی و خاکی
خۆزگەم بەسەگی قاپییەکەی ئەحمەدی کاکی

**

ئەو دەستە گوڵ و گوڵشەنە گوڵ ڕۆشنی سادات
ئەو دوڕڕی گران قیمەتی دەریای کەرامات
ئەو صاحێبی زوهد و وەرەع و تەقوە و طاعات
ئەو زوبدەی ساداتە کە سوککانی سەماوات
شەڕیانە لەسەر سەجدە ئەبەر مەرقەدی پاکی

**

ئەو حوجرەیە زوواری کە دەووارە لە هەرلا
خاکی دەرەکەی حەسرەتی گوڵ گەشتی موصەللا
بیروون و دەروونی بەفویوضاتی موجەللا
ئەو مەرقەدە والآیە کە وەک عەرشی موعەللا
مەحفووفە بەزوواری مەلەک دەوری شوباکی

**

ئاوارەی موڵکی غەم و سەحرای جنوونم
تەئسیری فیراقی ئەوە من غەرقە بە خوونم
مەنعم مەکە ئەر خەستە و دڵ خوار و زەبوونم
بۆ دەست و عەصا نازکەکەی داخە دەروونم
قوربانی عەصای دەستی بم و سۆل و سیواکی

**





نووری بەصەری فاطیمە و حەیدەری کەڕڕاڕ
سەرچاوەی عیلم و هونەر و مەعدەنی ئەنوار
خۆی بەحری وەفا نەجلی هەموو گەوهەری شەهوار
دەرحەق بەحەفیدانی ئەدەب لازمە زینهار!
قوربانی حەفیدانی بم و بابیی و داکی

**

دنیایە نەبینراوە وەفای تاوەکو سەر بێ
عەیشێکی نییە ئاخری بێ خەوف و خەتەر بێ
ئەم عالەمە بۆ تیری بەلاّ با بەسوپەر بێ
دنیا لە دوای حەزرەتی شێخ زێڕ و زەبەربێ
وەک تاجی کەی و جامی جەم و تەختی زوحاکی

**

دوو سەد وەکو (زێوەر) بووەتە شاهیدی لیللا
میثلت نییە لەم قەڕنە کە تۆ حازری بیللا
خاصە کە دەکەی مەدحەتی ئالی نەبی یولّلا
بەم حالّە پەرێشانەوە باز ئەشهەد و بیللا
شیعرت طەرەب ئەنگێزە (ڕەزا) شاعیری چاکی

........................................................

ئەم شیعرە لە ل٢٠٨-٢١٠ی کەشکۆڵی (أ)دا هەیە.

شێخ ڕەزا کوڕی شێخ عەبدولرەحمانی تالّەبانییە، سالّی ١٢٥٣ی کۆچی لە ئاوایی قرخ هاتۆتە ژیانەوە لە حوجرە و مزگەوتی کەرکووک و کۆیە خوێندنی تەواو کردووە، شاعیر و ئەدیبێکی تا بلّێی فەصیح و ڕەوان و زمان پاراو بووە، دیوانی شیعری هەیە، یەکەم جار سالّی ١٩٤٦ی ز لە بەغدا برێ لە شیعرەکانی چاپ کراوە، سالّی ١٩١٠ی ز لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

### پێنج خشتەکیی (زێوەر) لەسەر هەڵبەستی طاهیر بەگ*

تۆ کە پاشای و ئەمیری دەفعی حاجاتم ئەکەی
خۆ ئەگەر حوکمێ بکەی دووچاری ئافاتم ئەکەی
فیکری خۆم تەقریر ئەکەم گەر نەفیی تەوقاتم ئەکەی
سەد کە پاشای حەز بکەی هەر نەوع موجازاتم ئەکەی
من قسەی حەق هەر ئەکەم سا چۆن موکافاتم ئەکەی

**



من لەبەر نازک دلّی جار جار پەڕەی گولّ سەب ئەکەم
ڕوو لە جەولان گاه بکەم ئۆردوویی دارا تەب ئەکەم
وەک عەلی شێری خوا، دەعوایی سەد مەرحەب ئەکەم
من بە تەختی خوسرەو و جامی جیهان بێن گەپ ئەکەم
تۆ بەمەئمووری ئیعانەی دۆم و خەڕڕاتم ئەکەی

**

من کوڕی بارامی شێرزاد نیم بچم بۆ خەرجی دۆم
من (أصیل ابن الأصیل)م نوخبەیی ئێران و ڕۆم
کەس نییە پاشا موطیعی بم بەتەنها عەبدی تۆم
من بەسەد میننەت لە نوقلّی لێوی یاری خۆم ئەخۆم
تۆ بەشاگردی دوکانی مەردی قەنن‌ادم ئەکەی

**

من طەلەب ناکەم بەغەیرەز عیشوە و نازی حەبیب
بۆچی غەمبارم ئەکەی ناحەق بەدیداری ڕەقیب
عالەم ئەیزانێ کە طەبعم عالییە و فیکرم نەجیب
من ڕەزا نابم بەنانی گەندومی ئادەم فریب
تۆ بەئومێدی کولێرەی جۆ و زووڕاتم ئەکەی

**

من بەغەیرەز زولفی مەه ڕوویان سەری سەودام نییە
پڕ لە لەشکر بێ جیهان قەت خەوفی ڕووی ئەعدام نییە
شەش دەری عالەم بگیرێ ظەن مەبە ڕێگام نییە
من لە شاهی صاحێبی فیل و عەلەم پەروام نییە
تۆ لە ژێردەستیی پیادەی ئەسپتا ماتم ئەکەی

**

من خەیالّی ئەخذ و ضەبطی مولّکی ئێرانیم هەیە
ئینتیخابی دودەمانی ئالی عوسمانیم هەیە
ئیعتیقادی شای بوخارا و میری گەیلانیم هەیە
«فی المثل» من موسلیمم دەعوای موسولّمانیم هەیە
تۆ حەوالّەی مەسئەلەی ئینجیل و تەوراتم ئەکەی

**





فکری «زێوەر» پڕ فـــشـــانە لێـــرەوە تا لامــەکـــان
مەحو ئەکا خامەی دەسی ئەو نەقشی مانی بێ گومان
بیــخــەیە ناو ســەد هەزار تێغ جـەوهەری دیارە دەبان
نەظم و نەثری طاهیـــر ئەمـــڕۆ بۆتە ئەورادی زوبان
تازە دێی فـێری قـەصیـدە و نەظم و ئەبیـاتم ئەکەی

..............................................................

* ئەم شیعرە لە ل٢٠٥–٢٠٧ی کەشکۆڵی (أ)دا هەبوو.
طاهیر بەگ کوڕی عوسمان پاشای کوڕی (محەممەد) پاشای جاف کوڕی کەیخوسرەو بەگی کوڕی طاهیر بەگە، ناوبراو ساڵی ١٢٩٥ی کۆچی لە شاری هەڵەبجە هاتۆتە دنیاوە لە حوجرە و مزگەوت خوێندوویەتی، زمانی کوردی و فارسی و عارەبی و تورکی و کەمێکیشی فەرەنسی زانیوە. زۆر زیرەک و لێهاتوو و چاونەترس بووە بەخشندە و دڵ فراوان بووە. ماوەیێک قائیمقام و سەردەمێکیش سەرۆکی شارەوانی بووە. شیعرەکانی دڵداری و ئایینین و ساڵی ١٩١٨ی زایینی لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە. تەرمەکەیان بردۆتەوە بۆ عەبابەیلێ لەوێ بەخاک سپێرراوە.

## پێنج خشتەکی لەسەر هەڵبەستێکی مەحوی*

کــە نەجــمی طالعی هەرکــەس هەڵێت و ئاخــر ئاوابێ(١)
لەگـــەڵ ئابائی عـــولوی ئومەهاتی ســـوفلە ئیـــفنا بێ
جـــیـــهـــانی بێ ثەبات و بێ بەقـــا بۆ پیــــر و بەڕنا بێ(٢)
نەڵێ مـــەردم کـــە دنیـــا پشـــتی لەو، ئەو ڕوو لە دنیـــا بێ
کـــــە پووری زاڵە بۆچی پیـــــــرەزاڵێ پێی ڕەزا نابێ(٣)

**

بە من ئەوصـــافی ئەم مـــەککارەیە قـــەت ناکـــرێ ئینشـــا(٤)
ئەگـــەرچی بێنە ئیـــمـــدادم ســـەدی وەک ئەخطەل و ئەعـــشـــا(٥)
لە شـــێخ و عـــالم و پیـــر و مـــورید و حـــاکم و پاشـــا
لەگـــەڵ شـــاه و گـــەدا ئەم فـــاحـــیـــشـــە ئاخـــر ئەکـــا حـــاشـــا(٦)
گـــەر ئەهلی غـــیـــرەتی بەر لەو لە خـــۆی و ئەهلی حـــاشـــابێ

**

عەجەب مەشغووڵی جیلوەی ساقیی و گوڵڕەنگی مەی و ساغیر(٧)
دڵی خـــۆت خـــۆ مـــەکـــە هەرگـــیـــز بەبۆنی خـــەلعـــەتی فـــاخـــیـــر(٨)
خـــەیاڵی خـــاڵی مـــوشکین و نیگاهی قـــامـــەتی لاغـــیـــر(٩)
ئەگـــەر تاجت لەســـەر کـــا ســـەرتی پێـــوە قـــووت ئەدا ئاخـــر
مـــوبارەک کـــەی ئەبێ ئەو خـــەلعـــەتەی وا خـــەلعـــی لە دوابێ(١٠)

**



چ صـــەبیـــادێکە دنیـــا کـــەس ڕەها نابێ لەدەس داوی(١١)
مـــەئال و مـــەرجـــەعی خـــاکـــە چ دڵ صـــاف و چ کـــیناوی
ئەگەر گوڵ سوورمەبێ یا برمە بێ ڕەنگ سوورو ڕەنگ ماوی(١٢)
لـــەبـــەر هـــەر دادەڕنـــرێ جـــل، چ چیـــنـــاوی چ پـــیـــنـــاوی(١٣)
ئەبێـــتـــە لوقـــمـــە لوقـــمـــە پاقلە یا پاقـــلاوا بێ(١٤)

**

هەتاکـەی خـوابی خـەرگـۆشی سـەگی نەفـست لە ڕستایە(١٥)
شـــەق و زللە ببـــێـــتـــە نەقـــدی طاعـــەت وا لە مـــســـتـــایە
ئەگـــەر ڕاســـتت ئەوێ ئەم وەعظە بۆ شـــاگـــرد و وەســـتـــایە
برا! فـــیکری چرا، کـــیـــبـــریتی فـــرســـەت تا لە دەســـتـــایە
شـــەوی یەلدا لە پێـــشـــە، ڕۆژی عـــومـــرت وەختـــە ئاوابێ(١٦)

**

لە مـــەکـــری ئەم عـــەجـــووزە ســـەد هەزاران نەوجـــەوانانمان
نیکاحی مـــوتعـــەیە وەک شـــیـــعـــە تاســـەر نابێ بۆ کـــەســـمـــان
کـــــە مـــــانی هەر نەمـــــانە خـــــانەی وێرانەیە بۆ مـــــان
بکەین ئاه و فـــوغـــان و ئاگـــرێ بەردەینە خـــانوومـــان(١٧)
خـــەراباتی مـــەحـــەببـــەت حـــەیفـــە بێ ئاشـــووب و غـــەوغـــابێ

**

عەبەث (زێوەر) کە مەشغوڵی حیسابی ماهەکەی دەلوی(١٨)
عـــەمـــەل ئیـــجـــراکـــە بێ هوودە خـــەریکی صـــەرفـــیی و نەحـــوی
بناڵێنە وەکـــو قـــومـــری ئەگـــەر تۆ تالیـــبی ســـەروی
لەگـــەڵ ناڵین و گـــریە حـــازرە فـــەرباد ڕەس (مـــەحـــوی!)
«لیـــبکوا» ڕێ ئەدا پیـــری طەریقـــەت طیـــفلی ســـاوابێ(١٩)

..............................................................

* ئەم شیعرە لە ل٢٠١–٢٠٣ی کەشکۆڵی (أ)دا نووسراوەتەوە. مەحوی ناوی مەلا محەممەدە کوڕی مەلا عوسمانی باڵخێیە ساڵی ١٨٣٠ یان ١٨٣١ یان ١٨٣٧ی زایین لە دایک بووە، یەکێکە لە لووتکە بەرزەکانی شیعری کلاسیکی کوردی ئەدەبێکی فەلسەفە ئامێزی هەیە دەتوانین بڵێین بۆ خۆی قوتابخانەیێکی سەربەخۆیە. چەند جار دیوانەکەی چاپ کراوە ساڵی ١٩٠٦ی ز لە سلێمانی لە دنیا دەرچووە.
(١) نەجمی طالع: ئەستێرەی بەخت.
(٢) بەرنا، یا، بوڕنا: بەکوڕی گەنجی جوان دەگوترێ.
(٣) پوور: کوڕ. پووری زاڵ: کینایەیە بۆ ڕۆستەمی کوڕی زاڵ. پیرەزاڵ: پیری موو سپی، زیاتر بۆ پیرەژن بەکار دەهێنرێ،





لێرەدا مەبەستی دنیایە کە لەبەر کۆنی پێی دەگوترێ پیرەزاڵ، کۆنە چاڵ هتد.

(٤) مەککارە: صیفە موبالەغەیە بەواتا زۆر مەکرکەر.

(٥) ئەخطەڵ = أخطل: نازناوی دوو شاعیری عەرەبە یەکیان (غیاث)ی کوڕی غەوثە لە هۆزی تەغلەبە ساڵی ٦٤٠ی ز لە دایک بووە ساڵی ٧٠٨ی ز مردووە، شاعیرێکی زمان پاراو و قسە ڕەوان بووە زۆر شەڕە شیعر و دەمەدەمەی لەگەڵ جەرێر و فەرەزدەقا کردووە. (معجم المؤلفين ج٨/٤٢) دووەم نازناوی (بشارة الخوري)یە ئەمیش ساڵی ١٨٩٠ی ز لە بیروت لە دایک بووە، ساڵی ١٩٦٨ی ز لە دنیا دەرچووە.دیارە زێوەر مەبەستی بەئەخطەل یەکەمیانە.

ئەعشا = أعشى، الأعشى الكبير: نازناوی شاعیرێکی عەرەبی پێش هاتنی ئیسلامە، یەکێکە لە خاوەنەکانی شیعری مەشهووری پێش ئیسلام (أصحاب المعلقات) لە (یەمامە) لە دایک بووە. تەمەنی زۆر درێژ بووە تا سەردەمی هاتنی ئیسلام ژیاوە بەڵام ئیمانی نەهێناوە دیوانی شیعری هەیە. لە (مەنفوخە) ساڵی ٦٢٩ی ز مردووە. (معجم المؤلفين ج ٦٥/١٣).

(٦) فاحیشە: بەئافرەتی خراپ دەگوترێ، لێرەدا مەبەستی دنیایە. لەدیوانی مەحویدا ل٢٩٥ ئەم نیوە دێرە شیعرە بەم جۆرەیە، (لە دەروێش و لە شا ئەم فاحیشە ئاخر دەکا حاشا.

(٧) ساغیر: شەراب گیر.

(٨) خەلعەت: لیباس و پۆشاک. فاخیر: نایاب.

(٩) خاڵی موشکین: خاڵی ڕەش وەک موشک.

(١٠) خەلعەت: پۆشاک و کاڵا. خەلع: داکەندن.

(١١) صەییاد: نێچیرەوان. ڕەها: ڕزگار بوون.

(١٢) گوڵ سورمە: پارچە قوماشێکی ئاوریشم و سورمە بوو سەردەمی زوو ژنان کردوویانە بەجلوبەرگ. برمە: پاڵتۆ کۆن. ماوی: شین.

(١٣) چیناوی: قەیفەی تاقمەکار، پارچەییێکی ئاوریشم بووە ژنان کردوویانە بەجل. پیناوی: جلی پینەکراو.

(١٤) لوقمە: پاروو.

(١٥) خوابی خەرگۆشی: کەروێشکەخەو.

(١٦) شەوی یەڵدا: بەشەوەکانی دوا مانگی پایز دەگوترێ چونکە زۆر درێژن، لە بنەڕەتیشدا وشەیەکی سریانییە بەمانا لە دایک بوونە، دەڵێن: حەزرەتی عیسا لەو شەوەدا لەدایک بووە.

(١٧) خانوومان: خانوو بەرە.

(١٨) ماه: مانگ. دەلو: بورجێکە لە بورجەکانی ئاسمان.

(١٩) ئیشارەتی بۆ ئایەتی «فليضحكوا قليلا وليبكوا كثيرا» کردووە کە پەروەردگار داوا لە ئادەمیزاد دەکا کە کەم پێ بکەنن و زۆر بگرین. واتە ئەوەتا قورئان ئەمرمان پێ دەکا کە بگرین جا خۆ هەرچەند بەڕواڵەت گریان بۆ منداڵانە بەڵام ئەم ئایەتە ڕێگا دەدا پیری بەساڵاچوو و شێخی طەریقەتیش بگری وەکو منداڵی ساوا چونکە گریان دەبێتە سەبەبی ڕەحمەتی پەروەردگار.





## پێنج خشتەکیی زێوەر لەسەر هەڵبەستێکی

## (سەید ئەحمەد ئەلنەقیب)*

هەتا کەی ئاتەشی نەخوەت لە سەرتا ڕوو لە باڵا بێ
نیشاطی تۆ بیساطی پڕ نیان و گەنج و کاڵا بێ(١)
ئەگەر مەیلت هەیە کارت لە عوقبا چاک و (أولى) بێ
وەرە لادە لە دنیا ، بێ لەمەولا ڕووت لە (مەولا) بێ
دڵ و جان و وجوودت هەر نیثاری شاهی (لەولا) بێ(٢)

**

جیهان ڕووناکە دەیبینی ئەما نامێنێ بۆت هەروا
ئەگەر تۆ حاکمی شەرعی بەناحەق قەت مەدە فەتوا
خەتێکە موستەقیم ئەم شەرعە تا دەرگاهی حەق ئەڕوا
لە ڕێگەی شەرعی ئەنوەر هەر کەسێ لادا ئەبێ ڕیسوا
ئەگەر شاه و گەدا بێت و ئەگەر والی یی والا بێ

**

ئیمامی شافیعی بێ یانە ئەعظەم هادی یی خەڵقن
طەریقەی سوهرەوەردی بێ وەیا چەشتی لەسەر حەقن
لە بەحثی باطینا ئەتباعیان وەک خەرمەنی بەرقن
طەریقەی قادری نەقشبەندی هەر دوو ڕێی حەقن
عیلاجی قەلبی قەڵبت کە چ لەم لا بێ چ لەو لا بێ

**

قسەی حەق هەر ئەکەم فەرزەن زەمین سوورکەن بەخوێناوم
ئەگەرچی خۆم بەئەسبابی تەعەللوق حەپس و داماوم
لە داخی ئەهلی ئەم دنیایە حەیرانم کە چۆن ماوم
بە سەڵتەی سوورمەوە خۆی بائەدا وەک ژن ئەڵێ: پیاوم
کەسێ مەردە کە نووری باطینی صاحێب تەجەللابێ

**

عەدووتە نەفسی ئەممارە چییە ئەم مارە با بمرێ
خەریکی خۆیەتی هەرکەس کە ناکا دەفعەیێ فیکرێ
لەسەر بوون و نەبوونی نەفسی ڕێ نادا بکا شوکرێ

به نەفسی حیلەبازی خۆی بڵێ: بەسیە حەیا بگرێ
ئیتر لادە لە گێژی (لا) سواری کەشتیی ئیللا بێ(٣)

**

عیلاج و مەلجەئت کوا، ئەچییە کوێ، گەر شاهی کاووسی
خەتات بێ ناچییە جەننەت بەزینەت گەرچی تاووسی
جیهان زیندانە ئەی غافڵ! ئەتۆش مەحکووم و مەحبووسی
لە هەیوان و عورووسی هەر پەشیمانی مەئیووسی
کە چونکە عاقیبەت مەرگە چ (ئەدنا) بێ چ (ئەعلا) بێ

**

کەسێ ئەمڕۆ لە دنیادا لە خەوفی ئاخیرەت گریا
لە ئاخر مەرتەبەی خەندانە گرتی مەرتەبەی عولیا
بە حوببی دونیەوی (زێوەر) سەرت پڕ بوو لە ماخولیا
لە نووری ڕۆژی عیرفان بێ نسیبە صاحیبی دنیا
کەسێ حیصصەی ئەبێ (ئەحمەد) کە لەم خەڵقە تەوەللابێ

..........................................................

* ئەم شیعرە لە ل٢٠٣-٢٠٥ی کەشکۆڵی (أ)دا هەبوو. هەروەها لە ل٧٠-٧٢ی (دیوانی سەید ئەحمەدی نەقیب)یشدا چاپ کراوە. سەید ئەحمەدی نەقیب کوڕی سەید ئەحمەدی شێخ مەحموودی کوڕی شێخ حەسەنی گڵە زەردەیە. ساڵی ١٢٨٠ی کۆچی ١٨٦٣ی ز لە سولەیمانی هاتۆتە دنیاوە لە حوجرە و مزگەوتی سلێمانی لەلای مەلا زاناکانی ئەو سەردەمە خوێندوویە لەلای شێخ مستەفا موفتی ئیجازەی عیلمی وەرگرتووە، لە دوای مردنی باوکی لە تەمەنی شانزە ساڵیدا کراوەتە نەقیبی سلێمانی ساڵی ١٣٢٨ی کۆچی چووە بۆ حەج لە کاتی بەجێهێنانی پێویستییەکانی حەجدا لە شاری مەدینە کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی (بەقیع) نێژراوە.

(١) ئاتەش: ئاگر. نەخوەت: خۆ بەزل زانین. نیشاط: چالاکی. بیساط: ڕاخەر. پەرنیان: پارچە قوماشێکی ئاوریشمە، لە نێوان (نیشاط) و (بیساط)دا جیناسی لاحیق هەیە.

(٢) لەمەولا: لەمە بەدوا. مەولا: خوا. لەنێوان (لەمەولا) و (لە مەولا)دا جیناسی تەرکیب هەیە. لە نێوان (أولی) و (مولی) و (لولا)دا جیناسی لاحیق هەیە. شاهی لەولا: واتە شاهی (لولاک) ئاماژە بۆ ئەو وتەیەی کە بەدرۆ بەحەدیث دانراوە کە دەڵێ: (لولاک لولاک لما خلقت الأفلاک).

(٣) ئەم نیوە دێرە شیعرە ئاماژەیە بۆ ڕستەی (لا الە الا اللە) کە نیوەی نەفیە و دەبێتە کوفر و گومڕایی نیوەشی ئیثباتە دەبێتە هۆی ڕزگاری. چونکە کەوترا (لا الە) واتە هیچ خوایەک نییە ئەمەش ئیلحاد و بێ باوەڕییە بەڵام کە بەدوا ئەودا وترا (الا اللە) ئەوا ئیثباتی خوای گەورە و پەروەردگار کرا.

کەواتە (لا الە) گێژی گومڕایی و سەر لێ شێوانە وتنی (الا اللە)ش کەشتی ڕزگارییە. دەشتوانین بڵێین سووکە ئیشارەتێکیشی تێدایە بۆ ئایەتی (٤٣)ی سوورەتی هود کە بەزبانی حەزرەتی نوحەوە دەفەرموێ: «قال لا عاصم الیوم من أمراللە الا من رحم...».



**پێنج خشتەکی لەسەر هەڵبەستێکی مەلا صاڵحی (حەریق)***

جَمَرات هوی العشق علی القلب أثارت
الشمس من الخجله بالحجب توارت
فەرهاد صیفەت کەوتمە ناو ڕەنج و مەرارەت(١)
ئەم خەسرەوی خووبانە کەوا دێتە نەظارەت(٢)
شیرینە لەلام، دڵ ئەفڕێنێ بەئیشارەت

**

لوقمان بەنیگاهی وەکو دێوانەیە حاڵی(٣)
سەد دەفعە دەرم کەن ئەچمە دەرگەهـ و ماڵی
ئەفکار و خەیاڵی لە دەسم سەند خەت و خاڵی
میوەی ئەمەلم کاڵە لەبەر دیدەیی کاڵی
کاڵایی خەیاڵم هەمووی داناوە بەغارەت

**

زێوەر وەرە گەر تالیبی ئەفکاری دەقیقی(٤)
لادە لە مەجازی وەرە سەر عیشقی حەقیقی(٥)
بێ فائیدە لەم نەوعە خەیاڵانە غەریقی
تالیب مەبە بۆ لەفظی بەبێ مەعنا (حەریقی)!
تەجنیس و لەطافەت بخەرە بەسطی عیبارەت

..........................................................

* ئەم شیعرە لە ل١٩٩-٢٠١ی کەشکۆڵی (أ) و ل٦٨ی کەشکۆڵی (ب)دا نووسراوەتەوە.

(*) حەریق: ناوی مەلا (صالح)ە کوڕی مەلا (نصراللە)یە ساڵی ١٢٨٢ی ک-١٨٦٥ی ز لە دێی زێوبە سەر بەناحیەی سورداش هاتۆتە دنیاوە، بۆ خوێندن زۆر شوێنی کوردستان گەڕاوە تا ئیجازە عیلمی وەرگرتووە دوایی چووە بۆ سابڵاخ، دیدەنی شێخی بورهانی کردووە و بۆتە خەلیفەی بەصۆفیەتی دنیای بەسەربردووە. ساڵی ١٣٢٧ی ک-١٩٠٩ی ز لە دنیا دەرچووە لە گۆڕستانی (جامی) نێژراوە. شاعیرێکی زۆر زمان پاراو و شەئارا بووە دەڵێن هیچ شاعیرێکی کورد نەیتوانیوە وەکو حەریق شوێن پێی نالی هەڵگرێ تەنانەت بڕێ شیعری حەریق لە دیوانی نالیدا چاپ کراون چونکو پسپۆران و لێکۆڵەرەوەکان نەیان توانیوە جوێیان بکەنەوە. بڕێ لە شیعرەکانی لە دیوانێکی پچکۆلەدا تا ئێستا دووجار چاپ کراون جاری یەکەم ساڵی ١٩٣٩ز جاری دووەمیش ساڵی ١٩٦٩ز بەڵام هێندەی هەڵەی زل و زەبەللاحی تێدایە چێژی شیعرەکانیان بردووە.

(١) فەرهاد: فەرهادی کوردە کە دڵداری شیرین بووە. هەروەها بەهەموو بەدبەخت و لێ قەوماوێکیش دەڵێن.

(٢) خەسرەوی خووبان: پاشای جوانان. نەظارەت: تەماشاکردن.

(٣) لوقمان: ناوی پیاوێکی ژیری داستانییە لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەردا ناوی هاتووە هێندێک لە زانایانی ئیسلام پێیان وایە پێغەمبەر بووە. لە ئەدەبی کلاسیکماندا نموونەی عەقڵ و ژیرییە.

(٤) ئەفکاری دەقیق: بۆچوونی ورد و پڕ مانا.
(٥) مەجاز: ئەوەیە وشەییێک بۆ مەعنایەک غەیری مەعناکەی خۆی بەکارهێنرابێ.
حەقیقەت: ئەوەیە وشەکە بۆ مەعناکەی خۆی بەکارهێنرابێ. لێرەدا مەبەست بە(مەجازی) عەشقی مەجازییە واتە: دڵداری ڕواڵەت. بە(عەشقی حەقیقی)یش مەبەست عەشقی صۆفیگەرییە.

## تەخمیس لەسەر غەزەلێکی (وافی)

ئەی فـیـداکـارانی مـیللەت شـێـری مـەردانی وڵات
ئەی ڕەئیـسـانی دیانەت صـاحێـبی صـەدم و صـەڵات
بۆ نیـثـاری بێ وجـودە لیـرە و ڕوپیـە و مـەنات[١]
روح فـیـدا کـەین بۆ وەطەن بـۆ حوکمـران ڕێی ئەبات
کەس نەبێ چاوی لە ڕوتبە و خزمـەتێکی بێ خەڵات

**

تاکو دوێنێ بوو لەمەیدانا ئەتان وت ئێمە چووین[٢]
وا لە بادەی یەکێتی سەر مەستی فیکرو های هووین
گشت فیداکاری ئەوە ئێستاکە سەربەست کە بووین
نامی تەئریخی لە جێی ڕوتبەی فـەریقی بێ لەلات
گەر نەکەین ئیثباتی مەوجوودیەت ئیمڕۆ ئێمە چین

**

پشـتـیـوانێکمـان هەیە وەک کـێـوی ئاسن وا مـەتین
من کە فەردێکم لە کورد، باوەڕ بکەن ئەی موسلمین
خزمـەتی مـیللەت لەلام فـەرزە بە تەصدیق و یەقین
نەک بەدەم یاخـود زوبان بالله وامــە تا مــەمــات
خاکی کوردسـتـان مـەحەللی عـیلم و دارولفـەن ئەبێ

**

مـەوقـیـعی ئەهلی کـەماڵ و بۆ هونەر مەسکەن ئەبێ
هەرچی وێرانێکی تێـدایە وەکـو گـوڵشــەن ئەبێ
صەد شوکر شوعلەی چرامان ڕۆژ بەڕۆژ ڕەوشن ئەبێ
بەرقـەرار و پایەدار بێ واسـیـطەی شـەوقی حـەیات
عـیبـرەت و دەرسە لەلای ئەهلی نەزەر وەزعی زەمەن

**

دوور نەچین بۆ عەسری کۆن لەم وەقتەدا هەوڵێ بدەن
دەست لەمل یەکتر بکەین بۆ حیفزی گوڵزاری وەتەن





دیم نموونەی مـیللەتی غـەیرە کە چۆن خزمـەت ئەکەن
ضـابتـان و کـابتـان هەروەک نەفـەر پۆڵ پۆڵ ئەهات

**

ئیـتـیـحـادێکمـان نەبێ بێ شوبهـەیە بێ ڕیب و شەک
میـر و ئاغـا فـەرقی نامـێنێ لەگەڵ خەررات مـەلەک
سەیر بکە چۆن ئەجنەبی حوکمی گەیاندە سەر فەلەک
بۆ تەرەقی مولـک و میللەت جانفدابوون یەک بەیەک
ئیــتــحــاد و یەکـێــتی ئینســان ئەباتە ڕۆژهەڵات

**

(فـائق) ئەمڕۆ گـەرچی عـالەم پڕ لە ئاشوبە و فیـتەن
حـەز ئەکـەم دانێم لە ڕێی خـاکی وەتەندا جـان وەتەن
کوللی دێیەک پنجە بازی کـا لەگەڵ مولـکی خەتەن
مـەقـصـەدی زاتیم نییـە غـەیر أز وەطەن ئیللا وەطەن
چۆن فـیـدای مـیللەتە (وافی) بە تەحـقـیق و ثبـات

زێوەر زادە[٣]

........................................................

(١) لیرە و ڕوپیە و مەنات: جۆرە دراوێکی سەردەمی پێشوو بوون.
(٢) جوو: جوولەکە: یەهودی.
(٣) ڕۆژنامەی ئومێدی ئیستیقلال ساڵی ١ ژمارە ١١ و١٩ی ڕەبیع و ئاخر ٣٤٢، ٢٩ تشرینی ثانی (٣٣٩)- ئەم شیعرە هەرچەندە بەناوی فائق زێوەر (بەختیار) بڵاوکراوەتەوە بەڵام لە ڕاستیا هی مامۆستا زێوەر خۆیەتی. چونکە لە کاتێکدا بەو ناوە خوازراوەوە بڵاوی کردۆتەوە کە خۆی سانسۆری لەسەر بووە لەلایەن حاکمی سیاسی ئەو سەردەمەوە.

## پێنج خشتەکی لە شیعرێکی عەرەبیی (جەمیل صدقی زەهاوی)*

خزمەتی جەننەت ئەکەن هەردوو چ غیلمان و چ حوور[١]
ڕێگەیی حـەق ئەگـرێ ڕابیــعــە بێ یا مـەنصــوور[٢]
بۆ وەطەن خـزمـەتی ژاندارکـە لە دنیـا مـەشـهـوور[٣]
(یـرفـع الـشـــــعـب فـــــریـقــــان أنـاث و ذکــــور
وهـل الـطـائـر إلا بـجـنـاحــــــیــــــه یـطـیـــــر)

........................................................

* ئەم پێجینە لە ل٥٤ی کتێبی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.
جەمیل صدقی زەهاوی: کوڕی محەممەد فەیضی زەهاوییە ساڵی ١٨٦٣ی.ز. لە بەغدا لەدایک بووە شاعیرێکی کۆمەڵایەتی زمان پاراو بووە لە تەمەنی مێرد منداڵیدا دەستی بەشیعر وتن کردووە. لە کاروباری میریدا چەند پلە و پایەییێکی بینیوە، ئەندامی ئەنجوومەنی دانراوان (مجلس الأعیان) بووە، یەکێک بووە لە داواکەرانی تازەکردنەوەی شیعری عەرەبی، بڕێ لە

شیعرەکانی تەرخان کردووە بۆ داواکردنی مافی ئافرەت و باری کۆمەڵایەتی. چەند دیوانی شیعر و کتێبی دانراوی هەیە ساڵی ١٩٣٦ی ز لە دنیا دەرچووە. پیرەمێردی شاعیر زۆر بەسۆز لاواندوویەتەوە.

(١) غلیمان: ئەو کوڕە گەنجە جوانانەن کە لە بەهەشتا خزمەت دەکەن. حوور: حۆری بەهەشت، ئافرەتی گەنجی بەهەشت.

(٢) ڕابیعە: مەبەستی ڕابیعەی عەدەوییە.

مەنصوور: مەبەستی مەنصووری حەللاجە کە یەکێک بووە لە صۆفییەکانی سەدەی سێهەمی کۆچی، لە حاڵەتی جەذبە و سۆز لێ هاتندا دەستی کرد بەوتنی (انا الحق) واتە من خوام لەسەر ئەمە کوژرا.

(٣) ژاندارک: جاندارک: ئافرەتێکی تێکۆشەری نەبەزی فەرەنسییە بۆ ڕزگارکردنی وڵاتەکەی لە دەست ئینگلیز ڕاپەڕیوە بەڵام لە ئاکامدا دەستگیر بوو، ساڵی ١٤٣١ی ز سووتاندیان و مرد.

# چوار خشتەکییەکان

## ئامۆژگاری و سەرزەنشت*

ئەلا ئەی فایقی منداڵی دڵ صاف(١)
لە دنیادا بەویجدان بە و بە ئینصاف
ئەگەر کوفرت ببێ ئەبیە مونەووەر
بە دوو بار (تووتن)یش زوو ئەبیە ئەشراف

**

مەلای بورهان مەلا وڵام دی عەجەب دەعیە و تڕێکی بوو
کەرێکم دی عەبای پۆشی بوو، ورچێ مێزەرێکی بوو
هەزار ڕەحمەت لە (میرزا صالح)ی ئاغای قەڵاتی بێ
جەماعەو وەعظ و ذیکر و مەجمەعە و چاو شەککەرێکی بوو

## بۆ شایستە خان(٢)

دڵ ئەسیری ئاسکێکیماڵییە
عالەمێ مەفتوونی خەتت و خاڵییە
تا خەیاڵی لێ بکەی شایستەیە
قەلبی عالەم بەستەیی خڕخاڵییە

**

بەبێ ئاثاری فکری و خوان و سینی
بەبێ خزمەت چ بۆ میللەت چ دێنێ
سمێڵی کورت ئەکا ڕیشی ئەتاشێ
لەلای وایە کە بۆتە مۆسۆلینی

**



دەوری کەر سوار بوونە ئێستا نۆبەتی هات دابەزین
عاقڵە هەر کەس ئەگەر فلسێکی بێ نەیدا بەزین
جینسی مەحسووسی کە مەخصووصی سواری خاصە بوو
کەوتە ژێر کورتان و جەنجەڕ بار ئەبا مات و حەزین

**

چ خۆشە! گەر لەپڕ یاری سەمەن ڕوو یاسەمەن بۆ بێ
لە بەر چۆگانی زوڵفیدا سەری من هەروەکو گۆ بێ
خەیاڵی چهرەیی گوڵ ئاتەشینی گەر لە دڵ گوم بێ
ئیلاهی مەجمەری سینە سەراپا پڕ لە پشکۆبێ

**

عارەب ئابڵاخی دەخیلتم وەکو عارەب، بەوەفات
بمدەرێ کۆنە عەگاڵێ بەهەدیە و بەخەڵات
تاکو بیبەستم و خۆم گڤ کەم و فش کەم سەروڕیش
ببمە مەردومەکی دیدەیی ئاغا و سادات

**

مانگی ڕەمەزان کە بیست و نۆ بێ
صاحێب شەڕەفە هیلالی شەووال
ئەمما ڕەمەزان کە (سیی)ی تەواو بێ
قەدری نییە مانگ بەدانگ و میثقال

**

وەعدەی من و تۆ ئەی ڕەمەزان ڕۆژی جەزا بێ(٣)
دیوانی من و تۆ لە حضوور باری خوا بێ
ئەم لالە ڕوخانە هەموو ڕەنگ زەردی دەسی تۆن
کێ دیویە کە لالە یەرەقانی بەسەرا بێ

**

دیقەتم کردە حادیثاتی فەلەک
هاتوچۆی فەسڵ و مانگەکان یەک یەک
لێم عەیان بوو کە جەننەت و دۆزەخ
عەهدی جوانیی و پیرییە بێ شک

**





بەینێکە ون بووە حادیشە وا خۆی نواندەوە(٤)
کانوونی سینە ئاگری تێدا گەشاندەوە
دوکتور (حسین)ی شەهیری وەتەن پەروەری ئەدەب
بادی ئەجەل چراغی حەیاتی کوژاندەوە

## بۆ سەری پاکەتە جگەرە(٥)

بۆ ڕەواجی ئەم سیغارە قەلبی خۆشنوودم ئەوێ
ڕەسمی شیرین، ئیسمی شێخم، شێخ مەحموودی ئەوێ
کاغەزێکی صاف و بێ غەش خالص و خاص و تەمیز
موشتەریی نازک تەبیعەت صاحیبی جوودم ئەوێ

**

صاحیبی مولّک و ئەراضی دڵی غەمباری بوو
ڕووی لە تاپۆ کە ئەکرد قەلبی پڕ ئازاری بوو
«حمدللّە» کە تاپۆ شەرەفی پەیدا کرد
خوا لە تاپۆ فەرەجی کردەوە ڕزگاری بوو(٦)

**

لە جێی فڕنی و پلاو و گۆشت و شفتە
وەکو جوو ئیحتیاجم کەوتە کفتە
دەبا قولاپی چنگی لێ (گری) دەین
نەوەک بڕوا لە چنگ ئەم کفتە موفتە

**

بەحەبسی یوسفی ثانی دڵی عالەم موکەددەر بوو
دڵی زیندان بەتالع بوو، بەدیداری مونەووەر بوو
لە تەشتی سینە و جامی سەرا سەد پەنجە ئەشکێنم
هەتاکو موژدەییێکم دێتە گوێ ئەو مانگە وا بەربوو(٧)

**

تۆ بەورتەی ئەم و ئەو قەت دڵی خۆت ڕەنجە مەکە
مەجلیسی غەیبەت ئەگەر جەننەتە تیا لەنجە مەکە
قەولی من بێ غەرەزە، دۆستی هەموو عالەم بە
فەرقی حاتان و توجار باشیی بەرزنجە مەکە(٨)

**



شەوی جومعە ئەگەر مانگەشەوبێ، لەلام
حەرامە ئەگەر ماچ نەکەی لێوی جام
چ جامێ؟ وەکو گەردنی سادە بێ
دەروونیشی پڕ ئەرخەوان بادە بێ

**

ئەو مەیل و شەوقە بوومە قەدیم ئێستە باقییە
گوێم هەر لە دەنگی موطریبە، چاوم لە ساقییە
قەت نامەوێ نیگار فەرەنگ ڕەنگی تورک خوو
ڕوحم ئەسیری پەرچەمی کوردی عیراقییە

**

بۆ موتالاّ و خوێندنم صەفحەی جەماڵت کافییە
ڕەنجی بێ هوودە نەکێشم با لە شەرحی کافیە
ئیبن و سینا و شیفای ئەو با لە مەیدانا نەبن
چاوەکانت بۆ عیلاجی دەردەکانم کافییە(٩)

**

وەحشەتم زۆر لە لا پەسندە ئەگەر
مەدەنی بن ستالین و هیتلەر
گەر موسوڵمانی وەک هەنێ کەس بێ
دینی (بووذا)ت لە لا موقەددەس بێ

**

ئەگەر چاو نەبڕی قەت لە چاودێری
لە جەمعییەتی بەشەردا نێری
ئەگەر قەت نەتهێشت قەرزت لەسەر بێ
غەیبەت کەرەکەت مەگەر هەر کەر بێ

**

هەروەک کەسێک لە خۆشی لە پڕ دێتە سەر گرین
من هەر لە ناخۆشی زەمان دێمە پێکەنین
چۆن وەصفی نەوبەهار و صەفا و ڕەنگی گوڵ بکەم
واتێک چووە زەمانە کەوا سوور بووە بە شین

**





گوڵ خوار و ژوور ئەکا بەشنەی بایەکەی شەماڵ
یا شوکری حەق ئەکا بەڕوکووع و بەئیعتیدال
شەکراوە ئاوی کانییەکەم بەشەکر نەبێ
بەفراوە ئاوەکەم دە نەبێ بەفری شاخ و چاڵ

**

## بۆ دەروێش شەریفی چایەچی

هەزاران ئافەرین دەروێش لە پیرت
لەبەر ئەم شیرە صافە و چای مونیرت
هەچی ڕووی کردە ناو چایخانەکەی تۆ
ئەڵێ دەروێش شەریف ڕەحمەت لە شیرت

**

ئەی خانمی ئەلمۆدەی نەشمیلەیی قژ ڕووت
لێم مەگرە کە لێوم بخەمە سەر دەم و سەر ڕووت
بیستوومە شیوعیت و منیش ئێستە هەژارم
قانوونی موساواتە من و تۆ کە ببین جووت

**

پەروەردەیی پەنجەی ئەدەبی پیری بەتەسکین
نووری نەظەری میللەتی کوردە غەزەتەی ژین
بیست ساڵە ئەکا خزمەتی قەومی بەدڵ و گیان
تەبریکی ئەکەم لائیقە بۆ حورمەت و تەحسین

........................................................

ئەم چوار خشتەکییانە بەزنجیرە لە ل٢٤٨-٢٥٤ی کەشکۆڵی (أ)دا نووسراوە.

(١) فایق: مەبەستی فایق زێوەری کوڕیەتی.

(٢) بچووکترین کچی شاعیرە.

(٣) ئەم چوارینە لە ل٦٥ی دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانیدا چاپی ساڵی ١٩٤٦ی ز چاپ کراوە بەچوارینی ئەو دانراوە. بەڵام نەجمەدین مەلا لە پەراوێزی کەشکۆڵی (أ) ل٢٥٠دا نووسیویەتی کە ئەم (روباعی)یە هی زێوەرە و هی شێخ ڕەزا نییە.

(٤) زێوەر ئەم چوارینەی بەهۆی لە دنیا دەرچوونی دکتۆر حوسەینی باباجانەوە گوتووە کە ساڵی ١٩٢٤ی ز کۆچی کردووە.

(٥) تۆپە سیغارەکە بۆ پروپاگەندە ڕەسمی شێخی لەسەر بووە، مەبەستی لە جگەرەی تورکی بوو کە کارخانەکەی هی عەبدوڵڵا لوطفی بووە.

(٦) زێوەر ئەم چوارینەی بەهۆی گۆڕانی مودیری طاپۆی سلێمانی فەرەج ئەفەندی و هاتنی ئەوڕەحمان شەرەف لەجێی ئەو وتووە.





(٧) زێوەر ئەم چوارینەی بەهۆی حەپس کرانی شێخ مەحموودی نەمرەوە وتووە.

(٨) زێوەر ئەم چوارینەی بۆ شێخ عەبدولقادری حەفید وتووە.

(٩) وەکو دەڵێن: زێوەر ئەم چوارینەی بۆ کچێک وتوە ناوی (کافیە) بووە لەم ڕووەوە دەبێ مەبەستی بە (کافیە) لە کۆتایی نیوە دێری یەکەمدا ناوی کچەکە بێ. مەبەستیشی بە (شەرحی کافیە) کتێبی (الفوائد الضیائیة = جامی)یە کە هی عەبدولڕەحمان ئەلجامی کۆچکردووی ٨٩٨ی ک-١٤٩٢ی ز.یە (کافیە)ش کتێبی (عوثمان)ی کوڕی عومەری شارەزووری کە بە (ابن الحاجب) بەناوبانگە، کۆچکردووی ساڵی ٦٤٦ی ک. (کافیە) و شەرحەکەشی کاتی خۆی فەقێکانی کوردستان دەیانخوێندن و لەبەریان دەکردن.

مەبەستیشی لە وشەی (کافیە) لە کۆتایی چوارینەکەدا مانا لوغەوییەکەیەتی واتە بەسمە و کیفایەتمە.

(شیفا)ش کتێبی (الشفا)ی ابن سینایە.

مامۆستا زێوەر ئەم چوارینەی لە کۆتایی وتارێکا کە بەبۆنەی تێپەڕینی بیست ساڵ بەسەر دەرچوونی ڕۆژنامەی (ژین)دا نووسیوە. لە (ژین)ی ژمارە (٨١٩)ی ساڵی ١٩٤٦ی ز دا بڵاو کراوەتەوە.

## مەحکەمەی ئیستیبداد*

وا بینای ظولم و فەسادیان نا مەحکەمە
ئابڕووی ئیسلامیان برد مەحکەمە
باسی ڕیشوەت کاری و ئەفعالیان
گەر بەقەد سەگ دابنێم هێشتا کەمە

........................................................

* ل٥٣ی سۆزی نیشتمان.

## بۆ ڕەفیق حیلمی

ئەی ڕەفیقی موحتەرەم، ئەی خاوەنی شیرین مەقال
هاتە بەر مەددی نەزەر فیکرت وەکو ئاوی زولال
من ئومێدی گەورە گەورەم پێتە بۆ ئەم میللەتە
نەک خەیاڵی خۆت سەرف کەی تۆ لە ذیکری خەتت و خاڵ

## تاک تاکە*

زەمانی گورز و ڕم ڕابورد و ئێستا پاڵەوان عیلمە
سیلاحی دەستە صەنعەت باریقەی تیغ و سینان عیلمە(١)

**

مەعاشی مارتی فەوتاندین کە پاشا
(بحمد الله) جەزای خۆی دی لە پاشا

**

خۆشە زستان دوو شت یەکێکی لەچک
دووەمین مەنجەڵت لەبان کەوچک

**

قوربان بەیادی تۆوە گوڵی ئارەزووم گەشە
چ بکەم کە ناگەمە قەدەمت بەختەکەم ڕەشە

**

پەیای کورد وێڵەدەر شکڵی هیلالی
بەهار ڕەوشەن ئەکا صوبحی جەمالی[1]

**

پیاو کە دووچاری ڕۆژی نەگبەت بوو
دۆستی گیانیشی لێ ئەبێتە عەدوو

**

حیزی و دزی و خیانەت نە مەحکومیی ئەسیری
هیچیان دەماغ شکێن نین وەک عیللەتی فەقیری

**

کەسێ سەگ تاوی لێ دا دابنیشێ وازی لێ دێنێ
لە سەگ کەمتر کەسێکە حەملە بۆ سەرکەوتووان دێنێ

**

مەدحی کاک ئەحمەد ئەکەم ئەو شاهی مەه جاهە بەنام
ئەولیای عەصری هیلالن ئەو وەکو ماهی تەمام

**

(میسیو وێلسۆن)ی کورد و (جۆرج)ی دەشتی موکریان
وا لە جەمیانە مەچۆرە ئەوروپا بۆ سەیران

**

پیرێ بچێتە مەجلیسی جوانانەوە کەرە
جوانێ بچێتە مەجلیسی پیران مونەووەرە

...............................................................

* ئەم شیعرە تاک تاکانە لە ل٢٥٥-٢٥٧ی کەشکۆڵی (أ)دا هەیە.

(١) نەجمەدین مەلا ئەڵێ: ئەم فەردەی مامۆستا زێوەر، حاجی مستەفا پاشای یاملکی لەسەر لەوحەی ڕۆژنامەی بانگی کوردستان نووسیبووی.

(١) وێڵەدەر: دێیەکە لەسەر زنجیرە شاخی گۆیژە کە کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی شاری سلێمانییەوە، شاخەکەیش بەناوی (دێ)یەکەوە ناو ئەبرێ زستانان بەفرێکی زۆری لێ ئەبارێ بەڵام کە بەهار نزیک بووەوە بەفرەکە دەست ئەکا بەتوانەوە لە دوایدا بەفرەکە شکڵێکی هیلالی پەیدا ئەکا وە ئەمەیش سەرەتای بەهارە. (ن.م)





هەڵسین با هەڵسین هیچ ڕانەوەستین
لەناو مەکتەبا کۆمەڵ ببەستین
غەزاتەی شاران بخوێنینەوە
فیکری ئەوروپا بهۆنینەوە
زۆر چاک تێ بگەین لەو دەوڵەتانە
چۆن هەڵئەسوورێن لەگەڵ زەمانە

زێوەر

**

بەغدادی دڵم زارە لەبەر سەهمی نیگاهی
بەم کەوکەبەی حوسنە بڵێ نادرە مەحموود
عاشق کوژە غەددارە دڵ ئازارە

جەفاجۆ

**

خوێن ڕێژە شەرەنگێزە مژەی خەنجەرە

مەحموود

**

جەبرا دڵی (هەمی) بەخەمی کاکولی بەندە
حوسنی کە ببێ زیب و زەڕ و (زێوەرە)

مەحموود

ئەم هەڵبەستە دووقۆڵییە زێوەر و شوکری فەزلی وتوویانە کە نازناوی شوکری (هەمی) بووە.

**مووەززەف***

مووەززەف گەورە و بچووک ئەدەن ڕەنج
هەموو ئەجوولێن وەک بەردی شەترەنج
با ئیسراف نەکرێ ئینساف بێتە پێش
پەنجایی چل بێ چوار دیناریش پێنج[1]

...............................................................

* ئەم چوارینە لە ل٩٩ی سۆزی نیشتماندا چاپ کراوە.

(١) نەجمەدین مەلا لەسەر ئەم دێرە نووسیویەتی دەڵێ: «مامۆستا زێوەر مەرامی ئەوەبووە ئەوانەی مانگانەکەیان زۆرە هێندێکی لێ کەم بکرێتەوە بدرێ بەوانەی کە مانگانەکەیان کەمە».

**غزلت**

تیر نگاه با غبان گلرا پریشان میکند
بیچاره بلبل چون کند ناچار افغان میکند
ای نازنین گلبدن، ای ماه روی سیمتن
آنز خمها در جان من، آنچشم و مژگان میکند
آنصفحه یعنی روی تو، آنعطر یعنی بوی تو
محراب آن ابروی تو، کافر مسلمان میکند
باما مکن جور و جفا، ایسنگدل ای بیوفا
دارد وصال تو صفا بیمار درمان میکند
افتاده ام در راه تو ببینم رخ چون ماه تو
دیدم جمال شاه تو، شب را درخشان میکند
در کلبهء احزان من، یعنی میان جان من
یوسف رخ مهمان من دلرابکنعان میکند
در باغ حسن دلبری، دارم مقام سروری
کی بو به [زیور] بنگری چون ابرگریان میکند
دارایی جوان بختی و سرخیل جوانان
نزیبد که بهتو فخر کند خطهء ایران
ای روی تو ازشمع گرو برده وازماه
وی چشم تو صیاد دل و رهزن ایمان
حاجت نبود بر کمرت خنجر خونریز
صد کشته براهت فتد از جنبش مژگان
آرایش حسن تو نهخط است و نهخال است
از مور مزین نشود ملک سلیمان
تابان شده تا (بانه) ز انوار جبینت
در دیدهء عالم چوتوی مهر فروزان
با مشک برا برنکنم پرچم پر خم
در هر سرموی تو معلق شده صدجان
فریاد کههم عقل زسر بردی و هم هوش
کافر نکند آنچه بما کرد مسلمان



گرسرو به پیش قد تو سجده نیارد
صد لعنت ما بر سروی باد چو شیطان
ور نشئه چنین است که در چشم و رخ توست
باید که شود میکده و بتکده ویران
بگزاده نهی بلکه تو شهزادهء حسنی
بر طزهء زلفت نگرد بیعت خوبان
بر تخت لطافت چوتو امروز ندیدم
گل دربیر رخسار تو خاریست مغیلان
زیبد که کند بندگیت خسرو پرویز
شیرین پسری چون تو ندیده است بدوران
سنبل برموی تو گیا هیست ببازار
نرگس بر چشم تو سفالیست بمیدان
سرتا قدمت روی بهرسوی نمایم
ابله شوم و والهو سرگشته و حیران
هرچند بود منزل مه برج سماوات
در ارض محال است کند جلوه و جولان
گرماه دل افروز نهی شوق تواز چیست
در مملکت و بادیه و کوهو بیابان
ای سیم بدن سرو چمن لالهء جنت
در مملکت حسن توی صاحب فرمان
اعجاز لبت مرده کند زنده بخنده
کوشاه سکندر که توی چشمهء حیوان
هر شعر که در وصف تو گفتم عجبی نیست
گیرندز (زیور) بد و صد لعل بدخشان
نهئه که درین عصر کی شعر نخواهد
صد شعر بیکپاره و صد فرد بیکنان
جز حضرت محمود حفید زاده که طبعش
چون آب روان است کفش ابر بنیسان
آن شاهسواری کرم و ملک سماحت
شهباز هنر پرور و صیاد زر افشان





در مجلس وی بادنگارا چو تو هردم
صد شاهد و شمع و شکر و یارخوش الحان

***

مامۆستا زێوەر لە کاتی کۆچەکەی لەگەڵ بنەماڵەی شێخی نەمر لە گوندی قەرەگوێز، (شایستە خانم کچی مظفر السلطان) خوشکی نەسرەت خانمی ژنی «مصباح الدیوان (ئەدەب)» دەبینێ و حەزی لێ دەکا و بەم شیعرانە تاریفی دەکات:

ابروی هلال و رخ چون شمس تو دید است
در بیرق خوددولت عثمانی کشیده است
شمس و قمری هست که بر روی سماوات
در کسف و خسوف که آن روی بدید است
تو آن صنمی گر بەلب بام برآیی
چون برهمنت سید زنبیل مرید است
چوگان دو زلفت بەکف پای حنایی
شایسته ای گویی زنخ سیم سفید است
چون عیسی مریم بکند نطق بەخوبی
هر طفل دوماهه که زاسم تو شنید است
«زیور» نتواند که کند وصف جمالت
از کف بشکست خامه و کاغذ بدرید است

**

ای آنکه لب و زلف تویک نوش و یکی نیش
نوشم نرسیده بلب از نیش جگر ریش
ازما گرهی درخم ابروی تو گر هست
از زلف تو درخاطر ما صدره تشویش
مهری ز تو دیدیم بەزلف تو خزیدیم
شاها بەجفا برمکن این سایه ز درویش
هر آنچه بەما جور رودا ازتو خوش آید
اربیش و رانـدک ز تو تریاق بود پیش
از عاشق بیدل مطلب کیش که جز عشق
درخانقه مرشد ماکفر بود کیش
بیگانه زخود خواند مرا دوست، خطا خواند



بیگانگی خویش که از خویش بود خویش
انجام بدیدیم که زین جام چشیدیم
صوفی بکش این جام و زانجام میندیش
آمد بەسرما بت ما، لیک زمانی
کزعمر من خسته نمانده رمقی بیش
باهمت پیران چه توان کرد ادب را
آفاق سراسر بودم خصم بد اندیش

لە کتێبی (تاریخ فرهنگ و ادب موکریان) تألیف: ابراهیم افخمی»

مامۆستا زێوەر ئەم هەڵبەستەی خوارەوەی ساڵی ١٣٢٦هـ لە شەهیدبوونی خوالێخۆشبوو «حاجی شێخ سەعید» و «شێخ ئەحمەد»ی کوڕیدا بەفارسی وتووە کە لە موصڵ شەهید کران:

**لەسەر شێلای فارسی**

یارب بنای عیش جهان بی قرار باد
غم در درون اهل زمان استوار باد
آل علی چو باز گریبان دریده شد
چشمان اهل دهر همه اشکبار باد
شیخی که چون همای درین ملک سایه داشت
در کوشتنش زمین و زمان سوگوار باد
شیخی که جانشین دو قطب عراق بود
ناحق شهید گشت فلک بی مدار باد
هرکس مسبب است درین کارزشت و بد
محروم از عواطف پروردگار باد
خواهم زبارگاه خواوند کبریا
گر یک دعا کنیم اجابت هزارباد
اشعار جانگداز چه سود است خواندنش
پس ماندگان حضرت او پایدار باد
محمود نوجوانش بەاقبال بر خورد
دایم خزان آرزوش نوبهار باد
دنبال توسنش همه دم سایەء مراد
اندر حمایت نظر چاریار باد

دل آب گشت، آب بخون، خون چو آتش است
آتش چودود، در نظر روزگـــــــار باد
فریاد از جفای ستمکار این زمان
خواهم که دشمن علوی خاکسار باد
هم چون زمان پرده‌ء عصمت بەماتمند
زنهار مدعی همه در زار زار باد
باب و پسر شهید سنان دگر شدند
ملعون باد قاتل و باغش بەنار باد
تأریخ جوهری توز (زیور) شنو چەگفت
ب سد ابر دیده‌ء خورشید تار بار،١٣٢٦ه(١)

**

در وفات حاجی ملا سعید کرکوکلی زاده این رباعی گفته است:

وجود حاجی جای مفخرت بود
فراقش داغ قلب مملکت بود
نطر کردم بتأریخ وفاتیش
چنین دیدم (سعید آخرت بود) ١٣٥٧

**تێبینی**: (مامۆستا زێوەر) شیعری فارسی زۆرە بەڵام ئەمەندە بەسە کە لێرەدا نووسراوە چونکە ئەمڕۆ فارسی باوی نییە.

..........................................................

(١) ئەم نیوە شیعرە حەرفە نوختەدارەکانی بەئەبجەد ئەکاتە ١٣٢٦.



# بەشی تورکی

## سوکواری بۆ شیخ سعیدی حفید

زمانک وضعنی گورکیم نحوسندن نەکار ایتدی
ینه آل رسولی خون ایچنده خاکسار ایتدی
بتون اشرافک اهل ماتم ایچر اوردی خنجرله
مصائبدن دل آلی عبایی داغدار ایتدی
شقاوت اهلینه وردی شطارتلر مسرتلر
بنی هاشم لرێ ظلم ایله غرق غبار ایتدی
ایر شمردامنی گردونه دستی کوتهم یارب
که قلب حضرة زهرایی ناصل زحمدار ایتدی
حفید حضرة کاک احمد اول شیخ سعید ئاثار
که جودی نعمتی بو عالمی غرق مسار ایتدی
شهید اولسەیره دوشسه روایی شرع و قانونده
نەحکمت در بزه گوستردی خالق ئاشکار ایتدی
نەروم ایلر نەبلغار ایلیور بو ظلم مستکره
بو فعلک فاعلی کندی سنی مقبول نار ایتدی
نەو حشتلکدر اول اطوار ناهموار موصلده
دگل اسلامک اهلی، اهلی کفری شرمەسار ایتدی
ندر برسیدی عالی نسب مقتولی نظم اوڵسه
که شو قومی لعیندن حضرة یونس فرار ایتدی
صناعتجه، تجارتجه، ترقی ایلدی موصل
سفائن یرلرنده قان ایچنده لاشەکا ایتدی
سیاستله، عدالت شمدی پک لازم ولایتده
بر وقعه صفحه‌ء تأریخ دهری لکەدار ایتدی
سنادر روضه(١) تأریخی وفاتی سویدلدی (زیور)
دیدی چوقدن برو بوزاته جنت انتظار ایتدی

**لە ستایشی متەصەرفی سلێمانی عەبدولمەجید بەگ یەعقووبی زادە و**

**مێژووی خانووی متەصەرف ساڵی ١٩٣٨ک فەرموویەتی:**

یکی بر رنگە گیـرمش شـهـرمـر رنگی بشـارتدر
اهالی هر طرفــدن غــرقی شــادی و شطارتدر
سـعـات یوزنی مـخلوقـه گوسـترمکده درشـمـدی
شـــقـــاوت ذلتـــیله داخلی چاهی اســـارتدر
بو تأثیــراتی گــونا گــوندن حـیــرتلره دوشـمـه
سـعـاد تلو (مـجـیـد بگ) بانیی عـدل و ارادتدر
لوامــز مــهــره بکزر بر عــزیزه مــالک اولمشــدر
اوت یعــقــوبی زاده یوســفی شـیــرین اشـارتدر
معارف و سمعت آلمش پک گوزل عمرانه باشلانمش
زراعت انتــمـــاده هرکـــسک فکری تجـــارتدر
اهالینک رفـــاهی حـــالنه ئاســـایشی ملکه
شـوقـیــمـتلو وجـودی همـدمی رنج و مـرارتدر
ندر افکارینه تک بر لوانک ایشنی گــــدرمک
حـقـیـقت با قـیلرسـه حـقی کـورسی یی وزارتدر
وطن پرور فـخـامـتلو (جـمـیـل المدفـعي) مـزوار
یدقـیــســه بن دیوردم آن ایی حـقی صـدارتدر
یشـا ذاتی مـعــلاسی کـه مـجـدیله مـخـمـر در
یشـا اوصـاف والاسی کـه غـیـرتدن عـبـارتدر
زمـــانده یاپلمش برینا اصطخـــری فـــارســـدر
رجـــال عـــصـــره شـــایانی تماشـــا و زیادتدر[١]
عـدالت خـانه در کـشـورمـزه جـوهرلی تأریخی
حکوومـەت خـانەسی دنیـاده آن اعـلا عـمـارتدر

.......................................................

(١) (عدالت خانه در کشورمزه) پیتە نوختەدارەکانی بەئەبجەد ئەکاتە ١٣٥٧ کە مێژووی خانووی متەصەرفە.

## مەلا عەبدوڵڵا زێوەر

زێوەر لەسەرئامەدانی شوعەرای دەوری دوایییە لەناو هاو عەسرەکانما، شیعری زێوەر لە هەموویان ڕەوانتر و ناودارترە، وەک لە شیعرا باڵایە لە دیانەت و ئەخلاقی چاکیشدا دوو باڵایە، شیعر و ذەکا و خوڵقی وەهبی و خودا دادە ئایا بەئەسرە ئایا بە هونەر، خزمەتی وەتەنی زۆرە، دریغا مەعاریف ئیستیفادەی لێ نەکرد، ئێستاکە موعەلیمی تەقاویتە.

پیرەمێرد ئەڵێ: ئێستایش مامۆستای هەموو مامۆستاکانە و ئوستادی هەموو شاعیرەکانە، ڕووی مار ڕەش بێ کە کلکلی پەڕەسێلکەی گەست و، فێرنەگولە ئەخوێنێ.

لە نامیلکەی گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم
بەقەڵەمی عەلی باپیر ئاغا نووسراوە،
لە چاپخانەی (ژیان)ی پیرەمێرد لە سلێمانی چاپ کراوە.
١٩٣٩-١٣٥٨ لاپەڕە (٣٤)

### زێوەر

پەنجەی مەرگ بەرۆکی زێوەری بەرنەدا ڕایکێشا بردی لەسەر ڕێی (هەڕوتە و دۆڵە میران)دا خستیە ژێر خاکەوە. تەنها شیعرەکانی لە پاش بەجێ ما کە لەم تەنگانە و گرانییەدا و لەم زەمانەدا ربەیە ئارد بۆ ماڵ و منالە هەژارەکەی ناکا!!! بەڵێ شیعری زێوەر و زێوەر خۆی و زێوەری هەمو شاعیری کوردەوارین.

ئەمرۆ نەبێخود نە بێکەس نە پیرەمێرد نەگەیشتوونەتە زێوەر ساخوا کوڕەکەی بەختیار کا شوێنی باوکی بگرێتەوە.

زێوەر ئەخلاقی لە شیعری جوانتر بوو بە هەموو مەعنایەکەوە دیندار و بەویقار و قەناعەتکار بوو. لەکیسمان چوو داخی دووری ساریش نابێتەوە. ماوەیەک پێش ئەوەی کۆچ بکات زۆرم بیر ئەکرد. پیر و ئیفتادە هەر چۆنێ بوو خۆم گەیاندە لای، ئۆف چەند دڵتەنگ بووم لەمن نەخۆشتر و حاڵی ناخۆشتربوو.

من کە ساڵی ١٣٠٥ی ڕومی ١٨٨٩ی میلادی لە سیتەک. باشکاتب بووم و باوکی ئەو مەئموری ضەبط بوو لەگەڵ باوکیا دامەمان ئەکرد، ئەو هێشتا پێ نەگەیشتبوو. دوایی کە بۆ ئەستەموڵ و هاوڕێی بەحر و بەڕ و سەفەر و حضرم بوو کە دەستی کرد بەشیعر گەلێ لەپێش من و هەموو شاعیرەکانی زەمان و زەمانی خۆمانەوە بوو. لەم دواییەدا چەند شیعرێکی پاشەرۆکی بۆ ناردبووم لەچاو شیعرەکانیا ئێستای خۆیەتی، ئەڵێ:

بێ فـــائیـــدە و ســـەودا زەدە بێ پارە و پوولی
بێ ســوودە کـە بەســتـراوی خـەمی پەرچەمی لوولی

پیرەمێرد: پێداچوونەوەیەکی نوێ بە ژیان و بەرهەمەکانی.
ئومێد ئاشنا. بەرگی یەکەم. لاپەڕە (٣٧) دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، ٢٠٠١





### زێوەر

شابازی خۆش پەروازی بەرزی میللەت، ئاهووی بەباهووی چەراکانی مەرزی قەومییەت، دڵی هێلانەی پەروانەی شەمناسان بووە، گیانی ئاوێنەی بێ وێنە خاڵ خاسان بووە، پەندی لە بەندی کۆمەڵی کوردا قەڵایەکی دەستەوشار، ڕەنگی بەدەنگی پێ بەنی دەردا سەڵایەکی دوورەوشار، فیکری لە گولزاری ئامۆژگاریدا گوڵی هەمیشە بەهار، زمانی لە باخچەی ڕاوێژکاریدا نەمامی جۆشی بەهار، لە ڕەندیدا شۆخی ناو شاران، لە قەلەندەریدا شێخی کۆساران، حەقبێژ و حەقپەرست، بیربێژ و خواپەرست.

علاءالدین سجادی – مێژووی ئەدەبی کوردی – چاپی دووەم

### زێوەر

**(مەلا عەبدوڵڵا)**

مامۆستا زێوەر یەکێکە لەسەر ئامەدانی بوێژەکانی کوردستانی عێراق. شارەزای زەمانەکانی تورکی و فارسییە. لە زمانی عەرەبیشا مەلایەکی تەواوە. لە کوردییا کە زمانی خۆیەتی یەکێکە لە مامۆستایانی (شیعر و ئەدەب) شیعری زۆری بوێژە تازەکانی سلێمانی ڕەنگە لە (بۆ دەقە)ی ئەدەبی مامۆستا زێوەرەوە تێپەڕبووبێ و قاڵ کرابێتەوە گۆرانی نیشتمانی مامۆستا (زێوەر) گەلێ دەنگ خۆشی سولەیمانی خستوتە زەمزمە، لە ڕێگەی شیعر و ئەدەبەوە خزمەتی میللی و نیشتمانی زۆرە.

(نووسەر) لە ڕوشدیەی عەسکەری و لە ئەعدادی موڵکی قوتابی ئەم مامۆستا بەنرخە بووم، زۆرم خۆش ئەویست و بەچاوێکی ئێجگار بەرزەوە تەماشام ئەکرد، لە ساڵی ١٩٤٢دا موفەتیشی مەعاریف بووم. بۆ پشکنینی قوتابخانەکانی لیوای سولەیمانی لەو ناوە بووم چوومە (بەرزنجە)یش نەمدەزانی کە مامۆستا (زێوەر) لەوێ موعەلیمە، مامۆستاکان و مودیری مەکتەب بەپێی عادەتی دەرەوە تا قەراغ (دێ)ی بەرزنجە هاتبوون بەپیرمەوە، لە دوورەوە کە چاوم بەمامۆستا زێوەر کەوت، لە (سەییارە) کە هاتمە خوارەوە و ڕووم نەکردە مودیر و مامۆستاکانی تر تاوەکو خۆم گەیاندە مامۆستا خۆشەویستەکەم. بەگەرمێکەوە دەستەکانم ماچ کرد و بەزۆر، پێش خۆم و ئەوانی تردا. ئینجا لەگەڵ خەڵقەکەی تر دەستم کرد بەخۆشی و چلۆنی.

مامۆستا زێوەر، شیعر و گۆرانی نیشتمانی و پەند و مەوعزەی ئەدەبی کۆمەڵایەتی گەلێ زۆرە. لە (وەصف) و (نەعت) و عەشق و غەرامیاتیشا زۆر شیعری جەوان و بەهاداری داناوە لەبەر ئەمە لە ئاسمانی ئەدەبیاتی کوردا وەکو ئەستێرەیەکی گەش و پڕشنگاوی دیارە و ئەدرەوشێتەوە.

ڕەفیق حیلمی – بەرگی دووەمی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی
چاپخانەی الشباب / بەغدا ١٩٥٩م – لاپەڕەکانی (٣٨ و٣٩ و٤٤ و٤٥ و٤٧)

«... لەم چەرخەدا جۆرە کەسانێک پەیدابوون بەرگەیان گرت و خۆیان ڕاگرت لەبەر کرداری چەوتی چەرخی کەچ ڕەفتاردا، نیشتمانەکەی خۆیان بەجێ نەهێشت کۆڵیان نەداوە، ورەیان بەرنەدا... هەزار زۆر و ستەم و ناخۆشیان هاتە بەردەم. بەڵام لە خەباتی گشتی نەکەوتن.

ئەوانە زانا و وێژەوانی تەواو، خواناسی تەواو، نیشتمانپەروەری تەواو بوون... کە پێویستە چیرۆکی ژیانیان بەسەرکەفی زێڕ بنووسرێتەوە...»

یەکێک لەو جۆرە کەسانە (مامۆستا زێوەر) بوو.

شاکیر فەتاح: نامیلکەی (زێوەر) ١٩٧٤

چاپخانەی کامەرانی سلێمانی: لاپەڕە: ٤

گەر لە شیعرا کەم کەمێ خاوەن فەڕم
فەخرە بۆم شاگردی باشی زێوەرم
ئەو بوو هانی دام کە من هیچ کۆڵ نەدەم
هەر ئەوە ئوستاد و شێخ و ڕابەرم
گەر لە شیعرا هێز و ڕێزم دەست کەوێ
بێگومان هەر زێوەرە تاجی سەرم
گەر خوای شیعر و ئەدەب دڵگیر نەبێ
من ئەبێ سوجدە لەبۆ زێوەر بەرم
مەدحی شیعری بەرزی ئەو نابێ تەواو
گەر بنووسم چل کتێب و دەفتەرم

شاری عەلی عارف ئاغا

١٩١٠-١٩٩٥

## زێوەر

ئەم قەڵەمە ئەیەوێ وردە وردە لەبەر خۆیەوە – هەرچەندە زەمانیشی نییە– بۆت بێتە قسە. هەر لەبەر دەردی کۆچی زێوەر بوو کە بەدڵنیاییی سەری خۆی دانەواند بۆ قەڵەم بڕ بۆ ئەوە ئەو سکاڵایە کە ئەیکا شاهیدی بریندارى جەرگی بۆ بدات، بۆ ئەوە ئەو ئاوە کە خواردیەوە تا لە قامیشەوە بوو بەقەڵەم دڵۆپ دڵۆپ بیتکێنێتەوە، تا بپرژێتە سەر گۆڕەکەی زێوەر سەرلەنوێ قەڵەمێکی تر بەقەڵەم دەربچێتەوە جا ئەو لەوێدا بەزمانی دڵ، دڵ ڕاتەکێنێ بڵێت:

ئەوە زێوەرە کە گوێ و دڵی نەتەوەی کوردی لە سۆزی میللیەت و لە ئاوازی نیشتمان دۆستی پڕکردبوو ئەمەتە لێرە!!

ئەگەر میللەت بینی بەراوردی خۆی بکا. با یەکێکی تر بیخاتە تای تەرازوو و هەڵی سەنگێنی هیچ شتێک تاکی تەرازووەکەی قورس ناکا و هیچ دەستەگوڵێک نییە کە ببێت بەنیشانە و بخرێتە پێش چاوی ئەو کەسە تەنها شاعیر و ئەدیب نەبێت. چونکە ئەمانە بەخەیاڵاتی بەرز و بەبیری تیژی مووبڕ سەر ئەبەنە دەریای ئەو ئارەزووانەی کە هۆشی تێکڕای ئەو میللەتەی تێدا بێ هۆش ئەبێت و چاوی بینایان چارێ خەو خۆی ئەدا بە سەریا.





لێرەدا گەوهەرێکی شەوچرا دەردێن، لە تیشکەکەی تاریکی خەوە تار ئەنێن، لە پرشنگەی عالەمێک ڕووناک ئەکەنەوە، لە تاپۆکەی دیمەنێکی دڵ کەرەوە دروست ئەکەن بۆ ئەوە عالەمی بێگانە بەبێ ئیختیار ڕووی دڵ و دیدەیان تێ کا و لە بەین خۆیانا بکەونە قسە و بڵێن: ئەو گەوهەرە شەوچرایە هی ئەو میللەتە دڵگوشادەیە.

ئەم زێوەرە کە ئەم داستانەی ئەخوێنینەوە، ئەو زێوەرە بوو کە ساڵەهای ساڵ بوو بەبیرە وردەکەی، بە خەیاڵە بەرزەکەی، بەشیعرە ناودارەکەی گۆشی نەمامی کوردی ئەکرد و سروودی قەومی کوردی ئەخوێندەوە، بەرزی ئەکردینەوە لەسەر شاخی پیرەمەگروون دای ئەناین بۆ ئەوەی بکەوینە بەرچاوی میللەتان. بۆ ئەوە تۆزێ لە فریشتەکان نزیک کەوینەوە تا بەهێمنی گوێیان لە دەنگمان بێ و بۆنی جەرگی هەڵکرووزاومان بۆن بکەن. کە وابوو قەرزاری ئەو ئاوەین کە زێوەری کرد بەو زێوەرە، قەرزاری ئەو خاکەین کە زێوەر کردی بەمەڵبەندی ئەبەدی.

زێوەر هەر لە دەوری منالێیدا بێجگە لە دیمەنەکانی کوردستان تام و بۆنی شیعرەکانی (مەولەوی) و (نالی) لە هەموو دەمارەکانیا کاری کرد بوو، خووی دابووە دیوانی ئەو شاعیرانە، سایەقەی سامالی کوردستان، جریوەی ئەستێرەکانی ئاسمان، خوڕەی ئاوی کانیاوەکان، نەسیمی فێنکی بەری بەیانیان، شاخی ڕنگاوڕەنگی وەختی بەهاران، ئەمانە هەموو هەر لەو دەرەدا پەیکەری شیعریان پیشان ئەدا، ئەمانە هەموو دڵی زێوەریان کردبووەوە بۆ ئەوەی باوەش بکا بەئیلهامی خەیاڵاتا، لە پێشا هات (زێوەر)ی کرد بە(تخلص) بۆ خۆی و خەیاڵاتی بەرزی بە وتەی جوان (زێوەرارا) کرد.

ئەم زێوەرە کە ئەم باسەت لێ ئەخوێندەوە تەنها ئەو زێوەرە نەبوو کە خەیاڵاتی هەر لە زمانی کوردیدا ئیش بکا بەڵکو چ سروشتییەکی لە زمانەکەی خۆیدا لەبابەت شیعر و فەلسەفەوە بووە لە زمانی تورکی و فارسی و عەرەبیشدا ئەو مەیداناریبیەی هەر کردووە. ئەمە تۆزێک بوو لەو زێوەرە کە لەوانە لە تەمەنی پانزە ساڵی بەدواوە بەفیکری بەرزی خزمەتی کوردەواری کردووە.

بەکورت کردنەوەوە لە گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە (١٢)

ساڵی (١٩٤٨)ەوە وەرگیراوە

## زيور

قضى زيور يوم ١٩٤٨/١١/٢٠ في مدينة السليمانية، وترك هذه الدنيا التي تعج بالآلام والشرور الى الأبد. وانطوت صفحة رائعة من صفحات الشعر من سجل الحياة، لتفتح محلها صفحة وصفحات، وهكذا الدنيا بين خلق وفناء. واذا ذهب زيور من هذه الدنيا وتركنا نحن اليها، افننسى جميله الينا والى ابناء قومنا؟

كلا! ومن الحق علينا وعلى أبناء قومنا ان يذكروا زيور، وآخرين غيره، ممن قضوا حياتهم في سبيلهم، يدافعون عنهم بارواحهم، ويعلنون أمجادهم باقلامهم. إذ كان وهو شيخ طاعن في السن، يحمل روحاً فياضة بالحماسة والوطنية، وهو يعتبر رائد القومية، وشاعر الوطنية، وأناشيده الحماسية الوطنية تتردد على السنة صبيان المدارس وصباياها.

كان زيور أحد شعراء كردستان الافذاذ الذي لا تجود البقعة بمثاله إلا قليلاً. اسمه عبدالله ولقبه الشعري (زيور). ولد في مدينة السليمانية عام ١٨٧٥م واكمل دراسته فيها، وسافر الى الاستانة عام ١٣١٧ رومي، وعند تخرجه منها عين معلماً في المدرسة الرشدية العسكرية في السليمانية سنة ١٣٢٤ رومي، وقد سميت هذه المدرسة في الحرب العالمية الاولى بالمدرسة التشويقية، ثم عين من بعد في المدرسة الاعدادية الملكية. وعندما تأسست الحكومة العراقية خدم في التعليم مدة ثلاثين سنة.

وقد اشتهر المرحوم الشاعر، اضافة الى ما تحلى به من كرم السجية وصفاء النية، بالظرف وحبه للنكت، وقد كان محبوباً لدى عارفيه، يستذوقون شعره ويستطيبون اخلاقه وله ديوان شعر غير مطبوع باللغة الكردية.

والى القاريء الكريم نتفاً من بعض اشعاره مترجمة الى العربية: (المعرفة تعلي من شأن الاقوام الفقيرة)

ولكن الجهالة تمحو أشد الشعوب، حتى لو كانت بكثرتها العددية كالتتر

ان العلوم والفنون كانتا سبيل السعادة

وما كان الجهل الا مسبباً للخيبة والخذلان

ومن اقواله يطعن اولئك المتعلمين الذين يستنكفون من ابناء بلادهم:

لا تستنكف ان تنتسب الى قومك حتى لو كنت محظوظاً ونابغاً،

لان العقوق أشد اعداء العبقري.

فلتكن كلمة الوطن بين شفتيك تتردد كما يتردد هديل الحمام بين منقاره.

وليكن ابداً على طرف لسانك وخافقاً في جوانح قلبك ليل نهار.

وقد كان ذات ليلة مع جماعة من الاخوان يستروحون في تموز على قمة جبل (تاريەر)، فوصف تلك الليلة:

النار تشع الحرارة على وجه الارض



والقمر وهو في السماء يبعث برودته على رؤوسنا

بخ بخ لحفيف اوراق السرو والعرعر

زەزه لغدير الحجل الذي يصيح في الجبال وقت السحر

فبرودة هذه الليلة المقمرة وحرارة هذه النار الملتهبة

اعطنا حالة معتدلة في ذلك المستقر

فمن جهة يتصاعد أزيز (السماور) وشنشنة اللحم

وقد أصبح لنا من الخاثر الحامض الطعم مزة للشاي المحلى بالسكر

هذه كلمة صغيرة في حق (زيور) راجين ان نعود الى اعطاءه حقه في مرة أخرى.

گۆڤاری نزار ژماره (١٨) ڕۆژی ١٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٨ ساڵی یەکەم.

## ئەوەڵ و ئاخیرم نەزانی و جەهالەت بوو*

* لە ئەرشیفی کاک (مەحمود زێوەر)ەوە وەرگیراوە.

زێوەر نووسیویە:

ئەو ڕۆژەی کە ناردمیانە قوتابخانە تەصادفی نەورۆزی کرد، مامۆستاکەم وەرەقەیەکی نەورۆزنامەشی دا بە من پارەی بۆ بەرم، منالآن لە هەموو لایەکەوە هەڵئەپەڕین و نەورۆزنامەیان ئەخوێندەوە، منیش سەیرم ئەکردن. نەم ئەزانی بیخوێنمەوە، کە هاتمەوە ماڵەوە دەستم کرد بەگریان، باوکم وتی بۆچی ئەگری ئەوە پارە بۆ مامۆستا، ئەوەش بۆ خەرجی خۆت، وتم بۆ پارە ناگریم، ڕەفیقەکانم هەموو ئەم کاغەزە ئەخوێننەوە من هیچ نازانم، وتی ڕۆڵە عاجز مەبە من فێرت ئەکەم، مقدارێک لەگەڵم خەریک بوو شیعرێ فێربووم (نوروز شد نوروز شد) ئەمجار وام زانی میرزا شەفیعم، خولاسە چەند ساڵێ لە قوتابخانە دەوامم کرد ئیملا و ئینشایەکی مختەصەر و سیادێکی چاکم پەیدا کرد لەو زەمانەدا مشاعرە باز بوو منیش ئەی شدە و افتاب و غەزەلی حافظ و کلیاتم ئەغلەب لەبەربوو، کەس نەبوو لە مشاعرەدا مەغلوبم بکا.

هەوەسی قوتابخانەم نەمابوو بە واسطەی نزیکی ماڵەکەمانەوە بەمزگەوتەوە مەیلی خوێندنی فەقێکانم کرد (مجاوەرە بە تأثیرە) زۆرم پێ خۆش بوو منیش دەوربکەمەوە (ئیلی بابەی) پێوە بلەرێنمەوە وەکو عادەت بوو دەستم کرد بەتەصریف و عەوامل، لەم کتێبانە چەند ساڵ دەوامم کرد: نحو، صرف، وضع و استعارە، منطق کلام و باقی علومی مستەعملە لە هەر شتە شتێکم خوێند ئیتر وام ئەزانی خۆم تەفتازانی زمانم، لە ئاخریدا لە عیلمی هەیئەت و حکمەت و حساب لە خزمەت عرفان ئەفەندیدا دەوامم کرد غرورێکی وام بەسەردا هات لە دڵا ئەم وت، ئیمامی شافعی، ابن حجر چین تابع بەقسەی ئەوان بم، ئەوان عەرەب بوون عەرەبی و صەرف و نەحوێکیان زانیوە و حەدیثی زۆریان لەبەر کردووە، حەدیث و ئایەتەکانیان کۆکردۆتەوە ناوی خۆیان ناوە (مجتهد) لە پاشا کە علمی تاریخ و جغرافیا بەعضێ لە طەبیعاتم تەعەلم کرد مەلای پێنجوین و مەکتەبەکانی سلێمانیم لا بووە نەخوێندەوار ئەم ووت ئەم فەقیرانە هەر شیعرێ ئەزانن ئەویش لە کتێبا، یا چەند کتێبێ ئەزانن هیچ لە دەرەجەی منا نابن، خولاصە کەوتمە ساڵەوە بەرەبەرە کتێبی تازە و مجەلەی تازە کە تەماشا ئەکەم وەکو ئەوەڵ ڕۆژەکەم لێ هاتووە کە چوومە قوتابخانە باوکیشم نەماوە مەقالەیەکی تازەم تەعلیم بکا با وجود ئەگەر بشمایە ئەویش ئەی زانی بەعضێ محاضەرەی رجالی عەصر لە غەزەتەکانا ئەخوێنمەوە هەر نازانم باسی چی ئەکا.

لە الهلال والمقتظفدا بەعضێ مەقالە ئەبینم بەقەدەر نەوروز نامەکەی لێ حاڵی نابم، بووم معلوم بۆ کە زۆر جاهل و نەخوێندەوارم، بەزەییم بەخۆما دێ کە عومرم هەموو صرف کرد و تێ نەگەیشتوو دەرچووم.

ژین ژمارە ٦١٨ شوباتی ١٩٤١



## پێڕست

